ڤلادیمیر مینۆرسکی

# مینۆرسکی و کورد

وەرگێڕانی

**ئەنوەری سوڵتانی**




**ناوی کتێب: مینۆرسکی و کورد**

- نووسینی: ڤلادیمیر مینۆرسکی
- وەرگێڕانی: ئەنوەری سوڵتانی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: سەیوان سەعیدیان
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- چاپ: چاپی دووەم ٢٠٠٦
- ژمارەی سپاردن: ٢٥٢
- تیراژ: ١٠٠٠
- نرخ: ٣٥٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

**زنجیرەی کتێب -٧٤- (١٧٧)**





**دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی**

**www.mukiryani.com**

**asokareem@maktoob.com**

**Tel: 2260311**




# ناوەڕۆک

**پێشکەش بە کاکم**

**عومەری سوڵتانی (وەفا) –**

**کە دەستی قەڵەمی گرتم .**



Studiorum Orientalium et Africanorum
Cuius sub umbra
e vitae meae LXXXVII annis
XXII feliciter peraegi

V. Minorsky
27, Bateman St., Cambridge
16. VI. 1964

# سەرەتا بۆ چاپی دووەم

چاپی یەکەمی ئەم کتێبە. بەهۆی هەڵەیەکی تەکنیکییەوە، یەک لە وتارە سەرەکییەکانی تێدا چاپ نەکراو لە راستیدا لە جیاتی ٦ وتار، تەنیا پێنج وتاری گرتەبەر.

وتارە دواکەوتووەکە «ناوی» (**لەشکرکێشانی رۆم و بیزانسیەکان بۆ سەر «ئاترۆپاتەن»**) بوو و دەبوایە لەلاپەڕە ٨٣دا چاپ بکرایە. بەداخەوە لەسەرجەمی وتارەکە، تەنیا عینوانەکەی چاپ بوو و ئەویش لەسەر وتارێکی دیکە کە ناوی خۆی (گۆران) بوو، بەم شێوەیە هەردوو وتارەکە تووشی ئاڵۆزی و شێواوی هاتن.

ئێمە بۆ ئەم هەڵە ناخواستەیە داوای لێبوردن لە خوێنەرو کڕیاری چاپی یەکەم دەکەین و لێرەدا لە چاپی دووەم ئەو هەڵەیە راست دەکەینەوە.

**وەرگێڕ**

# سەرەتا

**خوێنەرانی بەڕێز**

گەڕان بەشوێن سەرچاوە لەمەڕ مێژووی شاری بۆکان لەسەرەتای سالاْنی ۹۰دا گەیاندمیە ئەو ئەنجامەی وتاری دووهەم و سێهەمی ئەم وتارانە وەربگێڕمە سەرکوردی. وتاری «گۆران»م کاتێ تەرجەمە کرد کە خەریکی ساغ کردنەوەی کەشکۆڵە شیعری شێخ عبدالمومن مەردۆخی بووم و مینۆرسکی وتارێکی لەسەر نووسیبوو. وتاری شەشەم بەشێک بوو لە سێ وتار لەمەڕ ئەلف و بێی لاتینی کوردی کە وەک نامیلکەیەک بلاْوم کردەوە. دوو وتارەکەی تریش هەرکام بە موناسەبەیەک لێم دەرکەوتن و وەرم گێڕانە سەر کوردی.

سەبارەت بە مینۆرسکی گەلێک بابەت نووسراوە و من هیچی ترم نییە لێیان زیاد بکەم، تەنیا ئەوە نەبێ مینۆرسکی لەچاو رۆژهەلاْتناس و کوردناسە ئەوروپییەکانی تر خزمەتێکی بەرچاوی بە مێژووی گەلەکەمان کردوە بەلاْم ئەویش لە چوارچێوەکی گشتی دەرنەچوە و ئەگەر سەرەتا شێوازی لوڕی بە زاراوەیەکی کوردی دانابوو، درەنگتر لێی پاشگەز بوەوە و نەک هەر ئەوەش بەلْکوو زاراوەی گۆرانیشی لە کوردی بوون شۆردەوە و کردیە فارسی !

نیازم لەو قسانە ئەوەیە کورد ئێستا پسپۆڕ و لێزانی خۆی هەیە و پێویست ناکات چاوی لە قەلْەمی بێگانان بێت سیاسەت و مێژوو و ئەدەبەی بۆ شی بکەنەوە. با ئیتر قسەی فلاْنە ئەوروپی بۆ کورد نەبێتە «وحی منزل» و بەتایبەت با گەنجەکانمان «شێوازی لێکۆلْینەوە» لەوان فێر بن ئینجا بەقازانجی مێژوو و ئەدەبمان کەلْکی لێ وەربگرن.



وتارەکانی مینۆرسکی نموونەیەکی سەرکەوتوو لە توێژینەوەی قووڵ و پسپۆڕانەن. وەک لە دەقی وتارەکان دا دەبینرێ هەندێ جار نووسەر بۆ دەرخستنی راستییەک ئەوەندەی مووقەلْێشی کردووە و بە شێوەیەک لە بابەتەکە وردبۆتەوە خوێنەر سەرسام دەمێنێ. بە بڕوای من ئەمڕۆ تەنانەت لە ئەورووپاش کەسانی وەک مینۆرسکی کەمن. ناوبراو وتارەکانی بە زمانی ئینگلیزی نووسیون بەلاْم لە سەدان سەرچاوەی یۆنانی، لاتین، فەڕەنسی، ئالْمانی، رووسی، تورکی، مغولی و فارسیش کەلْکی وەرگرتوون کەئەم جۆرایەتییە بۆ مەسەلەی تەرجەمەی من موشکیلەیەکی زۆریان دەنایەوە و ئاشکرایە ئەگەر یارمەتی دۆست و برادەران نەبوایە نەمدەتوانی دەقی هەموو ئەو زمانانە وەربگێڕمە سەر کوردی.

لەم بوارەدا بە ئەرکی سەرشانمی دەزانم سپاسی ئەو زاتانە بکەم کە هەرکام لە بوارێکدا یارمەتییان داوم بە تایبەت لەبواری تەرجەمەی زمانە غەیرە ئینگلیزییەکان، پێداچوونەوە و تایپ و هەلْەگرتندا:

مامۆستا کەمال مەحمود فەرەج، خاتوو ک. هێربێرت، خێزانم نەسرین برنا، ئاندریاس گاڤریەلیدی، دیمیتریا، کاک رەسوولْ قادری، کاک خانی هەژار، کاک عەتا موفتی، کاک صلاح محمدیان، کاک رەحیم بەهرامزادە، کاک مەجید حەقی، کاک سامان جاف، رۆژنامەی پەیام و بنکەی راگەیاندنی کوردی لە لەندەن.

هەروەها سپاسی بنکەی چاپەمەنی موکریانی دەکەم بۆ چاپی کتێبەکە و بەڕێز د. نەجات عەبدوللْا کە بوە هۆی پەیوەندی نێوان چاپەمەنی موکریانی و من و زەحمەتی زۆری بۆ ئەم کارە کێشا.

جگە لەم وتارانە، من چوار وتاری «درایڤر» م لەسەر کورد تەرجەمە کردوە کە هیوادارم بە شوێن ئەم کتێبەدا بەناوی «درایڤر و کورد» بلاْو ببنەوە. هەروەها سێ وتاری مەکەنزی و چەند وتارێکی ئێدمۆندز، مێجەرسۆن و مێجەر نۆئێلم تەرجەمە کردوون و زۆر بەهیوام لە درێژەی ئەم زنجیرەیەدا بلاْویان بکەمەوە.

**وەرگێڕ**

**نەورۆزی ۲۰۰۱**

**لەندەن**

# هۆزەکانی رۆژئاوای ئێران

## پێشەکی

ئەگەر کەسێک سەرنجی نەخشەی ئێران بدات، دەست بەجێ روخسارێک دێتە پێش چاوی: دوو زنجیرە [چیا] ی مەزن کە لە باکووری رۆژئاوا دا یەکتر دەگرنەوە. یەکیان لایەنی پانایی جوغرافیایی باکووری ولاتەکە لە ئەفغانستانەوە تا تورکیا دەپێوێ کە لووتکەی هەرە بەرزی لە بەشی رۆژئاوا دا چیای «ئارارات»ـە.

زنجیرەی دووەم کە بەبێ هیچ مەودایەک کەوتۆتە باشووری ئاراراتەوە و بەرەو باشووری رۆژهەلات دەکشێ، سنووری رۆژئاوای ئێران پێک دێنێ. ئەم زنجیرەیە ئێستا هیچ ناوێکی نیە بەلام بەشە ناوەڕاستەکەی لە سەردەمی کۆندا «زاگرۆس»ی پێ گوتراوە. ئەم ناوە ئێستاش وەک ناوێکی بەرێ و جێی کۆن کەلکی بۆ هەموو زنجیرەکە لێ وەردەگیرێ. هەر ئەم زنجیرە چیایەی وا بە باری درێژیدا کشاوە، زەمینەی باسەکەی من پێک دێنێ.

### ۱. سەردەمی پێش ئێرانییەکان

خاکی ئێران پێشتر بەم ناوە نەدەناسرا. لە دەوروبەری ۱۰۰۰ ساڵی پێش زایینیدا ئێرانیە هیندوئەورووپیەکان، کە بە زمانێک لە هەمان بنەماڵەی زمانە کۆنە هیند و یۆنانی و لاتینی و... هتدەکە دەئاخاوتن سەرەتای نفووزکردنە نێو ولاتەکەیان دامەزراند و دوای ئەوەی تێیدا نیشتەجێ بوون، ئیتر ئەو ناوەیان لە سەر دانا.

ئێمە ناتوانین شوێنی ئەو مەسەلەیە هەڵبگرین کە ئامۆزا ئێرانییەکانی ئێمە [ئەورووپییەکان]، کەی گەیشتنە سەر زێدی ئێستایان و بوون بە خاوەنی، ئەوە نەبێ کە دەزانین لە نێوان ساڵانی ٨٤٤ و ٨٣٦ ی پێش زایینیدا، ساڵنامەی پادشاهی ئاشوور بۆ





یەکەمجار ئاماژە بە بوونی مێدیەکان (ماد)[1] و فارسەکان (پەرسوە)[2] لە شوێنێکی باشووری گوڵی ورمێ دەکەن.

با بزانین ئەو دانیشتوانەی وا بە هۆی هێرشی ئێرانیەکانەوە لە جێگەی خۆیان هەڵکەندران[4] کێ بوون؟ ئێمە بۆ بەشی رۆژهەلاتی ئێران هیچ نیشانەیەکی روونی نووسراومان نیە، بەلام بە هەواڵی دوو پادشاهی گەورە لە رۆژئاوا دەزانین کە بۆ ماوەیەکی درێژ سەربەخۆیی خۆیان بەرانبەر بە دراوسێ هەرە ناسراوەکانی میزۆپۆتامیایان پاراست.

لە باکوور، پادشاهی «وان» (ئورارتو یا خالدی)، لە نێوان سێ زەریاچەی گەورەدا، دامەزرا: «وان» (لە تورکیای ئەمڕۆ) «ئورمیە» (لە ئێران) و «سوان» (لە ئەرمەنستانی سۆڤیەت). لە باشووری زۆر دوور، پادشاهی ئیلام بە پێتەختەکەیەوە ـ «سوزا» (کاخی «شوشان»[3] لە کتێبی «ئێستر»[4] دا)، ولاتێکی بەرینی لە لای باکووری رۆژهەلاتی خەلیج داگرتبوو.

«وان» و «ئیلام» هەردوو زمانی تایبەتی خۆیان هەبوو، کە لە زمانەکانی مێزۆپۆتامیایی نەدەچوون. بەلام چون ئەوانەی قسەیان پێ دەکرد، کەڵکیان لە خەتی بزماری وەردەگرت کە سەرەتا لە مێزۆپۆتامیا دروست کرابوو، بۆیان دەگونجا کاراکتەری فۆنیتیکی زمانی تایبەت بە خۆیان پێک بێنن و بەرەبەرە، واتای خەتەکەیان ـ کە بەشێکی «دووزمانە» بوو دیاری بکەن.

جگە لەو دوو پادشاهیە، لە بەشی ناوەڕاستی زاگرۆسدا ژمارەیەکی زۆر شازادەنشینی بچووک هەبوون، کە بە رواڵەت [دەسەلاتێ] هەندێکیان لە چەند دۆڵێکی دوورەدەست بەوەلاوەتر نەدەچوو.

ئێمە سەبارەت بەو شازادەنشینانە ـ بە پێچەوانەی هەموو شتێکی دیکە، جگە لە ناوەکانیان ـ کە زۆر عادەتیش نین، زانیاریەکی کەممان هەیە. چیای بەرزی ژوورسەری زەوییە نزمەکان، زۆر جاران داڵدەی پاشماوەی ئە دانیشتوانە بوە، کە لە دەشتاییەکان دەرکراون. ئەم مەسەلەیە لە سەرچاوە هندییەکانیشدا، وەک سەرچاوە قەوقازیەکان، راستە و بەڵگەیەکیشە بۆ دۆزینەوەی بنەچەکی هۆزە زاگرۆسیەکان کە لە بوومەلێڵی مێژوودا ون بوون.

لەناو گەلانی بچووکتردا، وا هەیە سەرنج بدرێتە «کاسێتەکان» (کاش شوو)[5] کە کەوتبوونە بەشی باکووری لۆرستانی ئێستاوە. کاش شووەکان، زەمانێک لە

بەرزاییەکانیان هاتنەخوارەوە و بە سەر «بابیل» دا حکوومەتیان کرد و لە ئەنجامی ئەم کارەدا، ئێمە ئێستا لیستەیەکمان لە وشەگەلی «کاسسی» بە دەستەوەیە.

زمانەکەیان تایبەتە و بەرواڵەت خزم و کەسی بۆ نیە، بەڵام بۆ مایەی گێژوگومی ئەوانەی وا بە شوێن دۆزینەوەی شتی ون دا دەگەڕێن، [دەبێ بڵێین] هەندێ لە ناوەکان، وەک هێند و ئەورووپی دەچن، ئەویش نەک «ئێرانی» هیندو ئەورووپی بەڵکوو زیاتر «هیندیی» هیند و ئەورووپی (بۆ نموونە: سوریاش).

بە شێوەیەکی ئاسایی، هەندێ نفووزی سەردەمی پێشتریش هەست پێ دەکرێ، وەک چۆن بابیلیەکان بە ئەسپیان دەگوت «گوێدرێژی چیای ڕۆژهەڵات». وادەردەکەوێ ئەم هیندو ئەورووپیە کۆنانە کە ئەسپیان بەخێو دەکرد، سەرەتا وەک «سەربازانی بەکرێگیراو» ئینجا وا هەیە وەک سەرۆک، بە شێوەیەک کە لە مێزۆپۆتامیای ژوورو و هەروەها لە پادشاهی «هیتی»[6] لە ئاسیای بچووکدا ڕوویدا، خۆیان لە نێوان هۆزەکانی زاگرۆسدا دامەزراندبێت.

بە ماوەیەک کەمی پێش ساڵی ١٩٣٠، بەشێکی زۆر لە کەڵ و پەلی برۆنزی (برنجی) لە باکووری لۆڕستان دۆزرایەوە، کە «لغاو» و «تەپکە» شی دەگرتەبەر، ئەمانە ئاماژەیەکن بە قۆناغی بەخێوکردنی ئەسپ لە ناوچەکەدا. نووسەر، یەکەم کەس بوو پەیوەندی نێوان ئەم تاقمە فاکتەرانە و هەروەها بەستنەوەی بۆچوونەکە بە کاسێتەکان یاخود بە یەکەم [تاقمی] هیندو ئەورووپی دامەزراو لەناو ئەوانیدا خستەڕوو[7].

### ٢. ئێرانی کۆن: مێدی و فارسەکان

لە سەردەمێکی درەنگتر دا ـ نزیکەی ١٠٠٠ی پێش زایین، کاتێ ئێرانیەکان گەیشتنە سەر زێدی ئێستایان، دەبێ بە تاقمی جیاجیا و گەلێکیش بە زەحمەت بەرەو باشوور داکشابێتن. ئەوانە سەر بە دوو هۆز بوون: مێدی و فارسەکان ـ کە زۆریش لە یەکتر دەچوون.

یەکەم جار، مێدییەکان بوون کە دەسەڵاتیان سەند (٧٠٠ تا ٥٥٩ ی پ.ز)، درێژایی ئاشووری فەتح کراویان پێوا و لەشکریان کێشایە ناوجەرگی ئاسیای بچووک. فارسەکان زیاتر بەرەو باشوور و بۆ ناو خاکی پێشووی ئیلام ڕۆیشتن و لە کۆتاییدا، مێدییەکانی





ئاغای خۆیان خستە لاوە. لەژێر دەسەڵاتی «کۆرش» دا، ئیمپراتۆرییەتێکی گەورەی فارس لە ئێران پێک هات (٥٥٩ تا ٣٣١ ی پ.ز)، کە خاک و خەڵکێکی زۆری دەگرتەبەر.

بەردنووسە ناسراوەکەی «پێرس پۆلیس» [تخت جمشید]، لە ناو ڕەعیەتەکانی شاهانی گەورە[ی فارس] دا، ڕەزگەی جۆربەجۆر نیشان دەدەن. ئاشکرایە هۆزە بچووکەکان لەم پیشانگە بەنرخەی وێنەیەدا لە بیر کرابێتن. درەنگتر ناوی «پارسە»[8] و «مادە»[9] (فارس و مێدییەکان)، زیاتر واتای زێد و نیشتیمانیان بەخۆیانەوە گرت تا واتایەکی ڕاستەوخۆی ڕەگەزیی.

### ٣. پاشایەتی ئێرانی ناونجی. پارت و ساسانیەکان

ئینجا، سەردەمێکی دوور و درێژ لە پادشاهی ناونجی ئێران دەستی پێکرد و نزیکەی نۆسەد ساڵی خایاند (لەساڵی ٢٥٠ی پێش زایینەوە تا ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی زایینی). بەداخەوە زانیاری ئێمە لەمەر ئەو ئاڵ و گۆڕانەی وا لە ئامێتەیی [نەژادی] دانیشتواندا پێک هات هێشتا ناتەواوە. ناوەندە ئیدارییەکان زیاتر بەرەو ڕۆژئاوا و مێزۆپۆتامیا، تا «سلوسیە»[10] و «تیسفوون»[11] لە سەر چۆمی دیجلە کشان.

دەبێ پێداویستی شاهانی ئێران بۆ دابین کردنی پەیوەندی لەگەڵ خاکەکەی خۆیان، کە ئێستا کەوتبوە پشتەسەریانەوە، هۆی تێخزانیان لە ناوچەکانی زاگرۆس و زیادکردنی عونسوری ئێرانی لەوێدا بووبێت. هەرچۆنێک بێت، تەنانەت لە سەرەتای سەردەمی ئێمەشدا گەلێک لەو ناوانەی بەشی ڕۆژئاوای ئێران ـ کە لەلایەن «بەتلەمیووس»[12] ـەوە نووسراون هێشتا هەر غەیرە ئێرانی مابوونەوە.

### ٤. سەردەمی ئیسلام

### ئا. عەرەب

ئێمە دوای فتووحاتی ئیسلامی، کە لە ساڵی ٦٥١ دا گەیشتە لووتکەی خۆی و هۆزە عەرەبەکان لە زۆر شوێنی ئێراندا نیشتەجێ بوون، بە هەواڵی گەلێک تاقمی ئەوتۆ دەزانین کە لە درێژایی بەشی ڕۆژهەڵاتی زاگرۆسی ناوەندیدا ، نیشتەجێ بووبن. هەرچۆنێک بێت، ئەم بێگانانە ژمارەیان ئەوەندە نەبوو کە بتوانن خۆیان لەوێ دامەزرێنن،

جـا خـەڵـکی ناوچەکـە دەورەیان دەدان هەروەها لە ڕێگای ژن و ژنخـوازی و پرۆسـەی سروشتیی هاوڕەنگ بوونەوە، هەموویان لەوێدا توانەوە. هەواڵی بنەماڵەیەکی عەرەبمان هەیە کـە لە مـاوەی سـەدەیەک، ناسنامـەی «الكردی»یان لە ناوی هۆزایەتی خـۆیـان «الئزدی» [العضدی؟]، زیاد کردبوو.

**ب. دەیلەمییەکان**

لە سەردەمی کۆنەوە، ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان لە بەرزاییەکانی باشووری ڕۆژئاوای کاسپیەن [خەزەر]دا، کە «دەیلەم»ی پێ دەگوترا، ژیانیان دەبردەسەر. هەندێک هۆ بۆ ئەو باوەڕە بەدەستەوەن کە دەیلەمییەکان بنەچەکی «پێش ئێرانی»یان هەیە، بەڵام ئیتر تا سەدەی دەهەم [ی زایینی]، ئێرانی بە تەواوەتی لە ڕەگەزی غاڵب دا نەتوابوونەوە و ماوەیەکی زۆر دوای ساڵی ٩٠٠ ی زایینیش وا دەزانرا کە بۆی هەیە هەمان دەور بگێڕن کە زێدی سکاندیناوییەکانی «نۆرسمەن»[13] لە ئەوروپا گێڕای[14].

لە ناکاو، دەروازەی لافاو بەپشتدا کەوت و ژمارەیەکی زۆری دەیلەمییەکان کە «وەحشی» و «تاقمی کولکن»یان پێ دەگوترا، وەربوونە ئێرانەوە ئینجا بەرەو مێزۆپۆتامیا داکشان و لە ماوەی سەدەیەکدا، خەلیفەی [عەبباسی] یان هێنایە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. ئەو مێژووەی کە لە ڕێگەی «تۆپۆنیمی»[15] ناوچەکەوە ساغ کراوەتەوە، پێمان دەڵێ کۆلۆنیە دەیلەمییەکان لە ناوچەی زاگرۆسیشدا هەبوون[16].

**پ. تورک**

هروژمی گەلێک گرنگتر، لە لایەن ئاسیای ناوەندییەوە کرا. لەسەدەی یازدەهەمدا، تورکانی ئوغوز ـ بەرێبەرایەتی بنەماڵەی «سەلجووق»، ئێرانیان پێوا و گەیشتنە مێزوپۆتامیا و ئەرمەنستان و ئاسیای بچووک.

تاقمی گەورەی ئەم تورکانە، لە قوژبنی باکووری ڕۆژئاوای ئێران کۆبوونەوە و لەو شوێنەدا، زمانی خۆیان بە سەر دانیشتوانی ناوچەکە دا سەپاند. ئەو دانیشتوانەش وا بە ڕێکخراوە عەشیرەتیەکەی خۆیان وەفادار مابوونەوە، وێ دەچێ بەرەو دەوروبەری زاگرۆس پاشەکشەیان کردبێت.



**د. مەغۆڵ**

لە سەدەی سێزدەهەمدا مغول، کە لە ناوچەکانی ئاسیای ناوەندی ـ لای دەستی ڕۆژهەڵاتی تورکەکان ژیابوون، بەرەو ڕۆژئاوا کشان و لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، وێرانییان بارهێنا. شاری تەورێز ـ وەک ناوەندی ئێرانی باکووری ڕۆژئاوا، بوو بە شوێنی سەرەکییان و لە گەلێک شوێنی زنجیرەی زاگرۆسیشدا ناوەندی خۆیان دامەزراند. هەرچۆنێک بێت، تا ناوەڕاستی سەدەی چواردەهەم، مغول ـ کە ئیتر بووبوون بە موسوڵمان، دەسەڵاتی سیاسیان کۆتایی هات و تێکەڵ بە جێگرەکانی خۆیان واتە تورک بوون.

بۆ ماوەی دووسەدە دواتر تورکانی ڕۆژئاوای ئێران هەر لە بارودۆخێکی ئاڵۆزی هەمیشەییدا بوون بەڵام دوای ئەوەی یەکگرتنێکی نوێیان پێک هێنا لە ناوچەگەلێکی زۆردا بڵاو بوونەوە، بەسەر تیرەی جیاجیا دا دابەش بوون و لە شوێنی دووردەستی وڵاتەکەدا، دامەزران. شوێنە ڕۆژئاواییەکانیش، شوێنەواری ئەم بزووتنەوە عەشیرەییەیان بەسەرەوە ما.

لە ژێر دەسەڵاتداریەتی سەفەویەکاندا (١٥٠٠ تا ١٧٢٢ی زایینی)، گەلێک هۆزی تورک و کورد بڵاوبوونەوە و لە قوژبنە دووردەستەکانی زاگرۆسدا نیشتەجێ بوون.

**٥. سەردەمی نوێ**

ئەو کورتە باسەی سەرەوە لە مەڕ هەندێ گۆڕانکاریی ڕۆژئاوای ئێران لە ماوەی چەندین سەدەدا، وشیار کردنەوەیەکە لە مەڕ کووژانەوەی هێڵە گشتیەکان و نیشان دەدات کە لە ڕۆژئاوای ئێرانیش وەک هەموو شوێنێکی تر، ناگونجێ باسی ڕەگەزێکی بێ خەوش و دوور لە تێکەڵاویی بکەین. کەوابوو با تەنگ و چەڵەمەی ڕەگەزایەتی سەردەمی نوێ بخەینە بەر لێکۆڵینەوە.

ئەگەر ئێمە زمان، وەک سەرەهەودای ڕێنموونی بگرینە بەرچاو، ئەوا دەبێ بیسەلمێنین کە بارودۆخەکە تا ڕادەیەکی زۆر، هاسان دەبێتەوە. جوغرافیا نووسانی عەرەبی سەدەی دەهەم، ئاماژە بە زاراوەی تایبەتی «خووزی»[17] لە نزیک ئەهواز دەکەن کە دوور نیە هەمان زمانە ئیلامیەکۆنەکە بێت[18]. بەڵام لەو سەردەمە بەدواوە، هەرچەشنە شوێن هەڵگرتنێکی [ئەم زمانە] بێ ئەنجام ماوەتەوە و ئەم بارودۆخە بۆ هەموو زاراوەیەکی کۆنی دیکە لە زاگرۆسیشدا هەر ڕاستە.





زۆربەی خەڵکی سەر سنووری رۆژئاوا [ی ئێران]، ئێستا بە زاروە ئێرانییەکان قسە دەکەن، بەڵام هەندێکیش لەم یاسایە بەدەرن. لە باشوور لە ناوچەی خوارووی ئیلامی کۆندا، [زمانی] عەرەبی شالاوی هێناوە. تورکی لە نێوان هەندێ تاقمی دوورە پەرێزی رۆژئاوادا دەبینرێ و ئێستاش لە بەشی باکووری ناوچەی بەرینی باکووری رۆژئاوای ئازەربایجاندا (کە پێتەختەکەی تەورێزە)، هەر عونسوری زاڵە.

لە نێوان گۆلی ورمێ و سنووری رۆژئاوا دا، هەندێ کۆلۆنی بەقەوارەیەکی بەرچاو هەن کە بریتین لە ئەرمەنی و ئاسوری. لەبەر ئەو راستییە، کە ئەو بەشەی وڵات لە سەردەمی بیزانسدا، ناوی «پێرس ئەرمەنیا»[١٩] ی لەسەر بوە، دەبێ بوونی ئەرمەنی لە ناوچەکەدا، بگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی کۆن. گومان دەکرێ ئەرمەنییەکان لە «تراس»[٢٠] ـەوە هاتبن و سەرەمێک لە «فریجیە»[٢١] لە ئاسیای بچووک ژیابن، ئینجا دوای گواستنەوەی شوێنی خۆیان دانیشتوانی پادشاهی «وان»یان لە ناوخۆیاندا تواندبێتەوە.

«سوریانییەکان»[٢٢]، ئەمڕۆ بە خۆیان دەڵێن «ئاشوری»[٢٣] بەڵام بە بێ هیچ گومان کردنێک ئەم ناوە لانی کەم لەباری زمانەوانییەوە هەڵەیە چون ئەوان بە زارەوەیەکی «ئارامی»[٢٤] دە ئاخڤن کە زۆر لە زاراوە ئارامییەکانی دیکە واتە ئەوانەی ئێستا لە لێوارەکانی خاکی نزمی مێزۆپۆتامیادا زیندوو ماونەتەوە، نزیکە.

ئارامی و «ئاشوری»ی کۆن هەردوو لە بنەماڵەی زمانە سامییەکانن[٢٥]. بەڵام ئاشوری وەک زمانی قسەکردن، دوابەدوای وێرانی «نەینەوا» بەدەست مێدییەکان لە ساڵی ٦١٢ پ.ز دا، مرد و لەناو چوو. ئارامی زمانێکی جیاوازە و دەبێ زمانی ئەو دانیشتوە ئاشتیخوازانە بووبێت کە دوای فتوحاتی ئاشوریەکان، دەستیان بەسەرداگیرابوو.

سەبارەت بە جیاوازیی زمان، قسەی زۆر هەیە بکرێ بەڵام لە روانگەی رەگەزایەتییەوە «سوریانی»یا بە لای کەمەوە سوریانیە شاخاویەکان، کە بە کاراکتەرێکی شەڕانییەوە ناسراون، وا هەیە پاشماوەی ئاشوریە راستەقینەکانیان لە ناو خۆیاندا تواندبێتەوە.

لە کۆتاییدا دەبێ بگوترێ، لە هەموو کوردستان دا ژمارەیەک کۆلۆنی جوولەکە دەبینرێن کە ئەوانیش بە زمانی ئارامی و هەروەها بە کوردی و زاراوە خۆجێیەکانی تر قسە دەکەن.







لە بەشی پێشوودا، کورتەیەک باسی کەمایەسییەکان کرا. ئێستا دەتوانین زەین بدەینە سەر ئێرانییە رۆژئاواییەکان، کە مەرکەزی باسی ئەم پاش نیوەڕۆیەی ئێمەن. دەکرێ ئەم تاقمانە لە ژێر سێ سەردێڕ دا ناوببرێن: لوڕ، کورد و گۆران. وا هەیە ئەم ناوانە گەلێک جار ببنە هۆی سەر لێ شێواوی.

لە زمانی فارسی کۆندا، وشەی «کورد» بەگشتی واتای «دەوارنشین»[٢٦]ی دەبەخشی و بە گوێرەی نووسراوەیەکی سەدەی دەهەم، ئێرانییەکان عەرەبیان بە «کوردی سوورستان»[٢٧] ناو دەبرد. بە هەمان شێوە دانەری مێژووی ناوداری کورد «شرف الدین» [ی بەتلیسی] (سەدەی شازدەهەم)، لوڕ بە لقێک لە کورد ناو دەبات و زاراوەکانی کوردی و لوڕی تا سەرەتای سەدەی بیستەم و ئەوکاتەی وا ئێرانناسی ئاڵمانی «ئۆسکارمان»[٢٨] سەردانی نزیک بە هەموو هۆزەکانی کرد و توێژینەوەیەکی سیستەماتیکی لەمەڕ ئەمان [واتە لەمەڕ زمانی کوردی و لوڕی] لە شوێنی خۆیدا بەڕێوە برد، کەمتر ناسرا بوون.

رەعیەتی ئەعلا حەزرەتی شاه ـ کە ئێمە «پارس»[٢٩] یان پێ دەڵێین، ئێستا خۆیان بە ئێرانی ناو دەبەن، کە بیچمێکی «ئاریان»[٣٠] ی کۆنە. لە هەمان کاتدا، زمانی خۆیان بە فارسی یا پارسی ناوبردە دەکەن کە ناوی مەڵبەندێکی باشووری ئێرانە و ئێستا «شیراز» مەرکەزیەتی. ئەم وشەیە بە ئاشکرا راستییەکمان بۆ دەسەلمێنێ: شارستانیەتی کۆنی ئێران، لە بەری باشوور و لە مەڵبەندێک پەرەی سەند، کە یۆنانیەکان بە «پێرس»[٣١] یان دەناسی و ئەو زمانەش کە شانازیی هەڵدان و گەیشتن بە پلەی زمانی نەتەوایەتی پێ بەخشراوە، لە بنەڕەتدا زاراوەی تەنیا ئەو مەڵبەندە بوە.

لە راستیدا، ژمارەیەکی یەکجار زۆری زاراوە هەن کە دانیشتوانی ناوچەکانی دوورتر لە زۆر شوێنی ئێراندا، قسەی پێ دەکەن. یەکیان ئەو زاراوەیەیە وا لە «شمیران»[٣٢] – هاوینە هەوارێک لە چەند مایلی باکووری تاران، قسەی پێ دەکەن. بەڵام زاراوەکانی بەشی ناوەڕاست و باکووری ئێران خاوەنی تایبەتمەندیەکی ئەوتۆن، کە لە زمانی فارسی رەسمی جیایان دەکاتەوە. لە کاتێکدا زاراوەکانی مەڵبەند [ی فارس]نزیکترین پەیوەندیان لە گەڵ زمانی فارسیدا هەیە.

ئەو مەسەلەیە، دەبێتە هۆی سەلماندنێکی زیاتری ئەو پەیوەندیانەی وا زمانی رەسمی بە مەلبەندەکەوە دەبەستنەوە ـ مەلبەندێک کە شوێنی لە دایک بوونی زەنجیرەی گەورەی «هەخامەنیشی» (ئەخمێنییەکان[33]) لە سالانی ٥٥٠ تا ٣٣٠ ی پ.ز. و ساسانی لە سالانی ٢٢٤ تا ٦٥١ی زایینیدا بوو.

**ئا. لوڕ**

ئەوە فاکتێکی گرنگە کە زاراوەی ئێستای لوڕستان بە شێوەیەکی گشتی لە هەمان تاقمە کە فارسیش هەر لەو تاقمەیە، لە کاتێکدا هەردووکیان بێگومان لە زاراوە کوردییەکان جیاوازن. بەلام زمان زەمینەیەکی باش نیە بۆ ئەو بریارەی کە گوایە لوڕ بە خوێن، ئامۆزای فارسەکانە ئەویش بە هۆی ئەو راستییەوە کە گەلێک هۆز بە درێژایی مێژووی خۆیان زمانیان گۆڕیوە، ئێمە پێویستە تەنیا ناوی گەلی «سێلتی»[34] بێنینەوە کە زۆرێکیان لە عەینی ئەوەدا تەنانەت هەستی پەیوەندی نەتەوەیی خۆیان پاراستوە، بە ئینگلیزی قسە دەکەن.

بەم پێیە، دەبێ کاراکتەری زاراوەی لوڕی بۆ پەردە هەلگرتن لە سەر پەیوەندە فەرهەنگییەکانیان بگیرێتە بەرچاو، بەلام نەک وەکوو رێبەرێکی دلنیا بۆ [توێژینەوە] لە بنەچەکی رەگەزایەتی ئەوانەی وا قسەی پێ دەکەن. لێرەدا دەبێ «مرۆڤناسیی فیزیکی» یارمەتیدەرمان بێت. بەلام وردبوونەوەی سیستەماتیک بەرادەیەکی بەرچاو و لە نێو لوڕ دا بەرێوە نەچوە و کاتێ کە مەسەلەکە چارەسەر کرا، کارێکی عاقلانە دەبێت ئەگەر لە رێگەی ئەندازەگرتن و وێنە لێ هەلگرتنی هەموو لوڕانەوە «یارد» ەکان بکەین بە «مەتر».

پێویستە بە بێ جیاوازیی، هەموو تاقمە عەشیرەییە ناسراوەکان دیاری بکرێن، چون بۆی هەیە ئەو راستیەمان بە باشی بۆ بسەلمێنێ کە بنەچەکێکی جیاوازیان هەیە. هەروەها دەتوانرێ ئەو راستیەش بگیرێتەبەرچاو، کە جیاوازییەکی گرنگی رەگەزی لە نێوان چینە کۆمەلایەتییەکاندا هەبێت. لەبەر ئەوەی خەلکی کۆچەر و دەوارنشین گەلێک بۆیان ئاساییە ئەو بێگانانەی وا دژ بە دوژمنێکی سەرەکی دەیانپارێزن، وەک رێبەرانی خۆیان بناسن و لە ناو خۆیاندا جێیان بکەنەوە.

ئەو خەلکانەی وا لە رۆژئاوای ئێرندا بەلوڕی دەئاخڤن، بە سەر چوار گرووپی جوغرافیاییدا، دابەش دەکرێن:





ـ **مەمەسەنی:** لە باشوور و لە درێژایی ئەو گەلییانە دا وا فارس بە خوزستانەوە دەبەستن، ژیان دەبەنە سەر. مەمەسەنیەکان پێش سەدەی چوارەم و لەبەر رووناکایی تەواوی مێژوودا، دانیشتوانی پێشووتری شوێنەکەیان لە ناو خۆیاندا تواندۆتەوە. بۆ نموونە «شوول»[35] ـەکان (کە لە سەردەمی خۆیاندا، گەلێک ناودار بوون).

ـ **کۆهگیلۆ:** لە باکووری مەمەسەنی «کۆهگیلۆ»یەکانن، کە بە شێوەیەکی سەرنجراکێش لە گەل ئەو تیرە تورکانەی وا لە ناویاندا دامەزراون، تێکەلاو بوون. تەنانەت ناوی تایفەی «ئاغا چاری»[36]، ناوی هۆزێکی گەورەی تورکە کە واتای «پیاوی دارستان» دەبەخشێ.

– **بەختیاری:** بەرەو باکووری کۆهگیلۆ و لەنێوان ئیسفەهان و خوزستاندا، ژمارەیەکی زۆر لە هۆزە بەختیارییەکان دەژین کە ناوی ئێستایان کەم تا زۆر نوێیە و وا دیارە لە ناوی هەندێ سەرەک هۆزی مەلبەندەکە وەرگیرابێت. ناوی پێشووی زێدی بەختیارییەکان «لوڕی گەورە» بوە. لە سالانی نێوان ١١٥٥ تا ١٤٢٣ی زایینی دا، لە لایەن زنجیرەیەکی حکوومەتی ناوچەییەوە بەرێوە دەچوو، دەگوترا ئەم خەلکە لەلای سووریاوە هاتوون.

– **لوڕی بچووک[37] لە پێشکۆه و پشتکۆه:** بەشی باکووری رۆژئاوای لوڕستان، لە سەردەمێکدا، فێدراسیۆنی «لەسەر لوڕ»ی پێک هێنابوو، کە هاوچەشنی بەختیارییەکان بوو و زنجیرەیەکی حکوومەتی خۆیان بەرێ دەبرد (١١٨٤ تا ١٥٩٧). پاشان خاکەکەیان بوو بە دووبەشەوە: بەشی پێشکۆه بە واتای ئەم بەری چیاکانی (سەرسنوور) و پشتکۆه بە واتای پشت چیاکانی (سەر سنوور) واتە شوێنی شۆڕ بوونەوەی دیواری رۆژئاوای زاگرۆس بەرەو میزۆپۆتامیا.

ئەرکێکی هاسان نییە پوختەیەک لە تایبەتمەندیی بنچینەیی رەگەزی ئێرانی بدرێ بەدەستەوە ئەوە نەبێت کە لەسەر بناغەی هەستێکی گشتی لە مەسەلەکە نزیک بیەوە مەگەر ئەو هەستە گشتی یە بەهۆی شێوازێکی ئوسلووبداری ئەوتۆوە رابگەیێنرێ کە تەتەلە هەخامەنیشیەکان نوێنەرایەتی دەکەن.

مەمەسەنی و بەختیاری کە هەردووکیان لە نزیک [مەڵبەندی] فارس دەژین، زیاد لە دوو لقەکەی دیکە، لە ئێرانی دەچن و وا هەیە هەر ئەوەش چاوەڕوان بکرێت. بەڵام لێرەشدا پێویستە سەرنج بدرێتە چینی خوارەوە نەک سەرەک هۆزەکان کە گەلێک هاسانتر دەتوانن ژن و ژنخوازی لەگەڵ خەڵکانی دراوسێیان بکەن و هاوسەرێک لە پلەیەکی بەرزتر بۆ خۆیان بخوازن (بڕوانە وێنەی ٣ ب).

شێوەی فیزیکی (ئاناتۆمی) لە ئەندامانی ئاسایی هۆز، وا هەیە شوێنی زەختی زۆری بەسەرەوە بێت. ئەم کۆچەرانە، بە درێژایی کۆچی وەرزیی خۆیان کاتێ بە شوێن لەوەڕی مەروماڵاتیاندا دەگەڕێن، لە دەشتاییە بەرفراوانەکانەوە بەرەو وشکارۆ (فلات) ـە بەرزەکان هەڵدەکشێن و چۆمە سەهۆڵبەندانەکان دەپێون، بە لاقی رووت بەسەر بەفردا دەڕۆن و بە شوێن بزنەکانیاندا، ماهـ و زەردی وەک دیواری چیاکان دەپێون.

ئەو فیلمەی وا ناوی «چەمەن»ـە و نووسەری ئەمەریکی «م. کووپەر» دروستی کردوە[38] و کتێبەکەشی هەمان نێوی هەیە چیرۆکی قارەمانیەتی بەختیاریەکانە، پێش ئەوەی دەوڵەتی ئێران دەستی بەنیشتەجێ کردنیان لە سەر خاکێک کردبێت کە پێشتر بۆ ماوەی شەش مانگی ساڵ بە شێوەیەکی رەسمی کەڵکیان لێ وەردەگرت.

لوڕی باکووری رۆژئاوا، لە رواڵەتی فیزیکیدا زیاتر نائاساییە. دۆستێکی ئێرانی من جارێکیان لوڕستانی بە «مەعدەنی ریش» واتە کانگای ردێن دانا و لە راستیشدا، ئەوە یەکەم هەستێکە لوڕان [لە بینەری لاوەکیدا] بەدی دەهێنن. ئەم هەستە، بە هۆی کورتەبالاییانەوە دەسەلمێت (بڕوانە رەسمی ژمارە ٢ و خشتەی ژمارە ٤ ئـ) [دەقی ئینگلیزی]. روخساریان گەلێک وەحشی و لاوازە و لە بزن دەچێت [!] جیاواز لە مەسەلەی کەم بوونی خواردەمەنی، لوڕ بە هۆی خواردنی ئاردێکەوە کە لە بەڕوو کێویلە دروست دەکرێت، «سوء تغذیە»یەکی کۆنیان لەگەڵە.

هەرچۆنێک بێت، شتێکی کۆن و سەمەرە سەبارەت بە لوڕ هەیە کە دەڵێ سەرەڕای زاراوە ئێرانییەکەیان، سەر بە چەشنە رەگەزێکی سەمەرەی مەڵبەندەکەن. «رەشماڵەکانیان» لە رەسمی ژمارە ٣ ئـ [ی دەقی ئینگلیزی] دا نیشان دراوە.



**ب. کورد**

دانیشتوانی کورد، یەکەم جار لە ئێراندا بە مەزنە لە باشووری هێڵێکدا دۆزراونەتەوە کە هاوتەریب لەگەڵ کرماشان و بە پشتێنێکی پان بەرەو باشووری گۆلی ورمێ کشاوە و لەوێوە بە پشتێنێکی باریکتر تا چیای ئارارات هاتوە. بەڵام کورد هەروەها عونسورێکی گرنگ لەناو دەوڵەتانی دراوسێدا پێک دێنن.

لە عێراقدا، کورد هەموو بەشی شاخاویی وڵاتەکەیان داگرتوە و لە باکووری سووریاوە تا نزیکی «مێدیترانە» (دەریای سپی) رۆیشتوون. لە تورکیا ژمارەیەکی زۆری کورد لە نزیک گۆلی وان ژیاون و بەرەو رۆژئاوا، هەتا ئەنقەرە کشاون. بەڵام دوای کوشتاری ئەرمەنیەکان لە ماوەی شەڕی ١٨ـ١٩١٤ دا، هەل و مەرجەکە تاریکتر بوە. دوای ساڵی ١٩١٩کە «قارص» درا بە تورکیا، کوردێکی کەم لە ناوچەکانی ئەورووپی قەوقازدا، مانەوە.

بەم شێوەیە، کورد نوێنەرایەتی کۆمەڵێکی گرنگ لە دانیشتوانی یەکگرتووی هاوچەشن دەکات، کە هێشتا چاوەڕوانی هەندێ دامەزراوەیی زێترن.

کوردی، زمانێکی ئێرانییە و بە بێ هیچ گومانێک تارادەیەکی سەرنج راکێش لە فارسی جیاوازە. وشەی گشتی هیندو ئەورووپی بۆ «دڵ» لە کوردیدا «زرد»[39]و لە فارسیدا «دل»ـە. «ناو» لە کوردیدا «نێو» و لە فارسیدا «نام»ـە. ئەدەبیاتێکی یەکگرتووی سەرەکی[40] لە کوردیدا نییە و کەم و زۆر هەمو هۆزێک زاراوەی خۆی هەیە، گەرچی بناغەیەکی کاراکتەریستیکی کوردی لە هەمواندا بەرچاو دەکەوێ. ئەم بەرچاوکەوتنە خۆی گەلێک سەرنج راکێشە، ئەویش لە روانگەی بەربڵاویی زۆری هۆزە کوردەکانەوە.

من لەو باوەڕەدام ئەم مەسەلەیە نیشاندەری ئەوەیە کە لە کۆندا زمانێکی بناغەیی بەهێزیان هەبوە و هەموو شێوە زمانەکان لەو بناغەیەوە سەریان هەڵداوە، گەرچی شوێن هەڵگرتنی ناوچەییش هەر هەبوە.

وەک من دەبینم تاقە رێگا بۆ دەربڕینی ئەم یەکبوونە، پەسەندی ئەو گریمانە دەبێت کە زمانی کوری لە زمانی زووی مێدی کەوتۆتەوە. کاتێ مێدییەکان ئیمپراتۆریەتی ئاشووریان لە ناو برد، دەبێ زۆرێک لە هۆزەکانیان بەرەو ناوچە بۆشاییەکانی [نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەت] کۆچیان کردبێت. لە گەڵ پەرەسەندنی دەسەڵاتی میدیا بەرەو





«لیدیا»[41]، هۆزە مێدییەکان (کە ئیتر «کورد» نوێنەرایەتی دەکردن)، دەبێ تا قوولاییەکانی ئاسیای بچووک نفووزیان کردبێت.

بەڵام ناکرێ ئێمە جارێکی دیکەش مەترسی سەرلێ شێواویی لەمەڕ تێکەڵ کردنی زمان و رەگەز لە بیر بکەین. کورد لە باری شێوە [ی روخسار] ەوە، تەنانەت لەناو تاقەیەک هۆزیشدا، لێک جیاوازن. یەکێ لە رەسمەکانی من (ژمارە ٤ ب [دەقی ئینگلیزی]) سەرەک هۆزێکی کورد نیشان دەدات (جەعفەر ئاغای شکاک)، کە من لە «تەورێز» ەوە دەمناسی و لە ساڵی ١٩٠٤دا بە دەستی حاکم [ی ئازەربایجان] کوژرا. شێوەی هێلکەیی دەم و چاوی، لووتی شووشی مام ناونجی و رواڵەتی بەهێز و تاقەتی، هەموو وا هەیە کاراکتەری بنەڕەتی مرۆڤی کورد بنوێنن. بەڵام رواڵەتی زۆربەری کوردان، شوێنی نفووزی بەهێزی دراوسێ عەرەب، تورک، ئەرمەنی و سوریانیەکان نیشان دەدەن.

من، لەم دواییانەدا، گەیشتوومەتە ئەو ئاکامەی کە مغول لە ماوەی دەسەڵات سەندنیاندا لە رۆژئاوای سەدەی سێزدەهەم و چواردەهەم، دەبێ سەرۆکایەتی ژمارەیەک لە تیرە کوردەکانیان گرتبێتە دەست خۆیان. یەکێ لە هۆزە گەورەکانی باشووری گۆڵی ورمێ ناوی «موکری»یە کە ناوێکی ناسراوی هۆزایەتییە لە رۆژهەڵاتی دوور.

لە بەراوردی مەنتیقی ژن خواستنی کورداندا، هەڵەیە ئەگەر بیر لە ژن هەڵگرتنی بەزەبرو زۆر نەکرێتەوە. لای کورد، ئەغلەب مێشکێکی پڕ لە ئەوینیان هەیە. نزیکەی ٥٠ یا ٦٠ ساڵ پێش ئێستا کۆنسوولی بەریتانیا لە «تەورێز» لە هەوڵدان بۆ گەڕاندنەوەی کچی کەسێکی «تەبەعە»ی بەریتانیا (خەڵکی ئەورووپای ناوەندی) بۆ وڵاتەکەی خۆی، تووشی تەنگ و چەڵەمە هاتبوو. کچەکە بە بارمتە گیرابوو، بەڵام نەیدەویست دزەکەی خۆی بەجێ بهێڵێ[42].

ئەم نموونانە لە کوردستان، کە ژن شوێنێکی سەربەخۆیان هەیە، زۆر هەڵدەکەون. [مێجەر] «ئی. بی. سۆن» کە بۆ ماوەیەکی سەرنج راکێش بە نەناسراویی لەناو کوردانی باشووردا ماوەتەوە، باسی ئەوە دەکات کە ژنان لەنێو رەشماڵەکانیاندا، بە چ شانازیەکی بێ وێنەوە پێشوازی لە میوان دەکەن. زۆر جار هەڵکەوتوە ژنی کورد کاروباری تیرە و کۆمەڵگای خۆی سەرکوتوانە بەڕێوە بردوە.

لە ساڵی ١٩١٣دا، من خۆم چاوم بە یەکێ لەو ژنە سەرنج راکێشانە کەوت. لە



ناوچەی هەڵەبجە ( کە ئەودەم هی تورکیا بوو و ئێستا لە عێراقدایە)، «عادلە خانم» کە ئینگلیزەکان بە «لێدی عادلە»[43] ناویان دەبرد، لە ماوەی شەڕی ١٩١٤-١٨ دا سەرنجی خەڵکی بەرەو خۆی راکێشا ـ ئەو کاتەی وا ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەرە بەریتانییەکانی لە مردن رزگار کرد و بۆ ئەو شاکارەی کردی، لە لایەن قوماندانی ئینگلیزەوە نازناوی «بەهادور خان» پێ بەخشرا. (بڕوانە رەسمی ژمارە ٥ ئ، [دەقی ئینگلیزی]).

جل و بەرگی کوردی لە ناوچەی سلێمانی و گۆلی ورمێدا، لە باری شێوەوە، زۆر رەسەنە. سەرپێچەکانیان بریتیە لە کڵاوێکی قوت کە دەسرەیەکی هاریشمی پان و پۆری بە دەورەوە پێچراوە و لەئاستی سەرچاودا، ریشۆڵی پێدا شۆڕ بۆتەوە. هاوینان، پیاوەکانیان شەڵوارێکی فشی پارچەیی سپی بە قۆڵی یەکجار درێژەوە [سۆرانی] لە بەردەکەن کە دەگاتە سەرزەوی. لە کاتی شەڕ و گەڕدا، هەردووکی سۆرانییەکان لە پشت خۆیان پێکەوە گرێ دەدەن بۆ ئەوەی دەستیان سەربەستی جم و جۆڵی هەبێت. لە سەر کراسەکانیانەوە، چاکەتێکی قوڵ و سەڵتەیەک لە بەر دەکەن کە پشتێنێکی پان دەوری داوە و درێژایی ئەم پشتێنە، هەندێ جار دەگاتە ١٥ تا ٢٠ یارد گرێییەکی زۆریشی لە پێشەوە لێ دەدرێ.

هۆزەکانی دێیەکی رۆژئاوای ورمێ (کە رەسمی ژنەکانیان لە ژمارە ٥ ب دا، نیشان دراوە)، [دەقی ئینگلیزی] چاکەتی گەلێک درێژتر بە نەخشی ئێرانییەوە لە بەردەکن و بۆ کاتی سواری، پۆتینی درێژ هەڵدەکێشن. ئەوانەی تریش هەروەها، چاکەتێکی گوڵدۆزی کراو بە سەر کراسەکانیاندا بەردەدەنەوە، کە بەشی پێشەوەی ئاواڵەیە.

لە تورکیادا، کورد لاسایی دابی لە بەرکردنی جل و بەرگ بە شێوەی عەسکەری دەکاتەوە و زیاتر بەرگی وا دەکەنە بەریان کە رەنگەکەی، شتێکە لە نێوان سەوزی کاڵ و زەرددا. پێویستە لەم حاڵەتەدا بڵێین مخابن لەژێر زەختی حکوومەتدا جل و بەرگی رازاوەی هۆزایەتی خەریکی لەناوچوونە و جل و بەرگی بێ رۆحی نیوە ئەورووپی جێگای گرتۆتەوە.

بەم پێیە، کورد، چ لە باری شێوە و چ لە لە لایەنی جل و بەرگەوە، نیشانەی شوێن هەڵگرتنی زۆر لە خۆیان نیشان دەدەن. فاکتەری یەکگرتووییان بریتیە لەجل و بەرگێکی نیوە دەوارنشینانەی گشتی و زمانێک، کە لە هۆزێکەوە بۆ هۆزێکیتر جیاوازی هەیە بەڵام هەردوو لا، لەیەکتر تێدەگەن.

**پ. گۆران**

گۆران (گووران) نموونەیەکی باشە بۆ زانیاری لێکۆڵینەوەی مێژوویی و زمانەوانی ـ پێش ئەوەی بڕیار بدرێ کام هۆز لە کامە گروپ [ی نەژادی] یە. لەسەدەی چواردەهەم [ی زایینی] بەدواوە، نووسەرە موسوڵمانەکان گۆرانیان بە کورد داناوە. لێرەشدا، ئۆسکارمان دەری خستوە زاراوەی گۆرانی (گوورانی) ڕوخساری بنەمایی کوردیی کەمتر تێدایە و بە پێچەوانە، شتێکی وەرگیراوە لە زاراوە ناوەندییەکانی ئێران (بۆ نموونە ئەوانەی وا پەیوەندیان بە ئوستانی «فارس»ەوە نییە).

تاقمی سەرەکی گۆرانەکان ڕاست کەوتوونەتە باکووری ڕێگای ئەسڵی زاگرۆس، کە ڕێگەی مێژوویی بەغدا بۆ کرماشان بەوێدا ڕادەبرێ. بەڵام ژمارەیەکی زۆری گوندی تاک و تەرا، کەوتونەتە شانی ڕۆژهەڵاتی ئەم زێدە سەرەکییەی گۆرانەوە کە [خەڵکەکەی] ئێستاش بە هەمان زمان قسە دەکەن.

لە ناوچەی بەرینی پارێزراوی هەورامانەوە بەرەو باکوور، بە زاراوەیەکی هاوپلە (in the same class) قسە دەکرێ [هەورامی] و جگە لەوە، گروپی گەورەی زازا، کە خاکی نێوان دیاربەکر و ئەرزرۆمیان داگرتوە، هەموویان زمانێکی نزیک بە گۆرانی بەکار دەهێنن.

لە ماوەی شەری کریمە [قرم] دا، رووسەکان کوردێکی زۆریان دەست بە سەر کرد و لە «سمۆلێنسک»[44] ڕایان گرتن، لەوێ، «دکتور پ. لێرخ»[45] بە نوێنەرایەتی تیمی «ئاکادێمی زانستی رووسی»[46] سەری لێدان. ئەم پسپۆڕە دەست بەجێ بە جیاواز بوونی زانستیانەی زمانی کوردیی ئەسڵی و زازایی زانی، بەڵام تەنیا لە سەردەمی ئێمەدایە کە پەیوەندیی ناوخۆیی نێوان ئەم زاراوە «نا ـ کوردی»یە پەخش و بڵاوانە بە شێوەیەکی ڕێک و پێک کەوتۆتە بەر توێژینەوە.

هۆزی گۆران، گەلێک سەرنج ڕاکێشن، چیرۆکە شیعر و شیعری غەرامی تایبەت و هەروەها ئایینێکی سەمەرەی خۆیان هەیە کە من ژمارەیەکی بەرچاوی بەڵگەنامەم سەبارەت [بەو ئایینە]، لە چاپ داوە[47]. ئەم ئایینە، لق و پۆپێکی زۆری لەناو خەڵکی «نا ـ گۆرانی» ئێران و وڵاتە دراوسێکاندا لێ بۆتەوە.

زاراوەی گۆرانی، تەنانەت وەک زمانی دیوەخان، لە لایەن زنجیرەیەکی بچووک لە کوردستانی ئێران [ئەردەڵان؟] ـەوە کەڵکی لێ وەرگیراوە. لە کۆتاییدا دەبێ بڵێم، گۆران



و هۆزە هاوبنەچەکەکانی ئەوان بەگشتی باخەوانێکی شارەزا و وەرزێرێکی لێزانن ـ فاکتەرێک کە ئاماژە بە نەریتێکی فەرهەنگی کۆن دەکات. هەورامان ـ بە هۆی ستانداردێکی بەرز لە چۆنیەتی ئاودێری کردنی تەختایی داوێنی گرد و چیاکانەوە شوێنێکی زیاتری لە سەر من دانا. کاتێ ئەم کارە کاراکتەریستیکانە دەخرێنە پاڵ یەک، گۆرانی و هەورامییەکان دەکەن بە تاقمێکی تایبەتی ئێرانی.

من بۆ ماوەی ساڵانی زۆر، هۆگری گۆران و ئایینەکەیان بووم. لە ساڵی ١٩١٤دا دەرفەتم بۆ ڕەخسا، چاوم بە زێدی ڕازاوە و پەرستگەی گۆرانەکان بکەوێ کە لە ناوەڕاستی دارستانی سەوز و چۆمی بەقەڵبەز و تاوێرە بەردی زڵ لەناو گەلییە دوورەدەستەکانی زاگرۆسدا شاراونەتەوە.

هەر لەم دواییانەشدا بوو، جارێکی دیکە هەوڵم دا، بەسەر ماتریاڵە سەرچاوەییەکان [ی خۆم] دا بچمەوە. بۆ ئەوەی بنەچەکی گۆرانەکان بدۆزمەوە. بیچمی کۆنی ناوەکەیان واتە «جاباریقە»[48] م لە نووسراوەی سەدەی نۆهەمی جوغرافیا نووسێکی عەرەبدا دۆزییەوە.

تۆپۆنیمی ناوچەی کرماشان، جێ پێیەکی زۆری ناوی ئەم هۆزە نیشان دەدات، کە وا دەردەکەوێ پاڵپشتی زنجیرەی هەرە گرنگی حاکمانی ناوچەیی واتە «حەسەنویە»[49] (لە سەدەی دەهەم و یازدەهەم) بێت.

من تەنانەت، شوێنی گۆرانم بردۆتەوە سەر بەشی ناوەندیتری ئێران و زەمینەیەکی زۆریشم بۆ باوەڕەکەم هەیە کە هۆزەکە لە ڕێگایەکی گەلێک دوورتر و لە ناوچەی زەریای قەزوینەوە هاتوون کە سەرچاوەیەکی مەزن و شوێنی سەرتایی کۆچبارێکی زۆرە.

لە ڕوانگەی کۆمەڵناسیەوە، سەرنج ڕاکێش ئەوەیە هۆزی ئەمرۆی گۆران لە گەلێک تیرە پێک هاتوە، کە هەندێکیان لە گۆرانی بنەڕەتی و ئەوانی دیکەیان سووک و سانا لە کورد پێک هاتوون. سەرسوڕهێنەرتر لەوەش ئەو ڕاستییەیە کە کوردی ناو فێدراسیۆنی گۆران سوننەن و ئایینی بە ڕەمزو ڕازی هاوڕێ گۆرانیەکانیان [ئەهلی هەق] دەبێ بۆ ئەوان «بیدعەت»ێکی بێ خەوش بنوێنێ. سەرەڕای ئەوەش، هاوڕێییان لە گەڵ یەکتردا گەلێک خۆشە.

ئەو مەسەلەیە، جارێکیتر نیشان دەدات کە شێوازی گشتی ژیان و وێچوو بوونی بە ڕواڵەتی داب و نەریتی هۆزێکی ئەسڵی بە لق و پۆپیەوە، زامنی یەکبوونی بنەڕەتی هەر دوو لایەنیان ناکات.

## ٦. ئاكام

من، لەم وتارەدا، هەندێ بۆچوونم لەمەڕ دانیشتوانی جۆر بەجۆر و سەرنج ڕاکێشی ڕۆژئاوی ئێران خستە بەرچاو. گەلێک ساڵی دیکەی پێ دەوێ تا ئەو مەسەلانەی وا لە پەیوەندی باسەکەدا هەن، بەڕێک وپێکی وەڵام بدرێنەوە. من خۆشحاڵ دەبم ئەگەر ئەو دڵۆپەی من لە زەریای لێکۆڵینەوەکانی داهاتوودا، ون نەبێت.

لەگەڵ ئاماژە کردنم بە دەست پێشخەریی «ئەنستیتۆی پادشاهی مرۆڤ ناسی» [٥٠]، پێم خۆشە چۆنیەتی ئوسلووبەکانی خۆم دوپات بکەمەوە. من دەمەوێ دەست بنێمە سەر ئەو خاڵەی کە مرۆڤ ناسیی فیزیکی[٥١] و ڕەگەزناسی[٥٢]، پێویستە لە پەیوەندییەکانی هەرە نزیکی زمانەوانی و مێژوو دا بەرەوپێش بچین بە تایبەت کاتێ کە ئێمە لە سەر خاکێک هەنگاو هەڵدەهێنینەوە کە پاراوی بیرەوەری مێژووییە، وەک لە ئێرانی بەرێزیشدا هەروایە.

وەک هەندێ دۆستانی ئێرانیم بەهاتنی خۆیان شانازییان بەلێدوانەکەی ئەمڕۆم داوە، پێم خۆشە بە لێبڕاوییەوە بڵێم پێ داگرتن لە سەر هەمەچەشنی گەلانی ئێران، بە هیچ شێوەیەک واتای ئەوەی نییە مەسەلەی کۆنی یەکیەتی لەمێژینەی وڵاتەکەیان بچێتە ژێر پرسیارەوە، ئەوە نەبێت کە هەوڵ دەدرێ جوانی و ئامێتەیی و هاوڕەنگی، وەک ڕەنگی مافوورەیەکی بریقەدار بخرێتە بەرچاو[٥٣].



### ریفرێنسەکان

Minorsky, V. 1921: "Notes Sur la Secte des Ahlé-Hagg", Revue du monde Musul.

Minorsky, V., 1927: "Kurds", Enscycl. Islam

Minorsky, V. 1928: "Lur", "Lur - i Buzurg" and "Lur-i Kuchik, Encycl. Islam.

Minorsky, V., 1931a: "The Luristan Bronzes", Appolo Feb., pp. 141-2 (Addressed at the Congress of Persian Art, 5 Jan. 1931).

Minorsky, V,. 1931b: " Les Tsiganes Lüli et les lurs persans, Jour., As., Apr., pp 281-305.

Minorsky, V., 1932: La domination des Dailamites, Paris

Minorsky, V., 1934: "Ahli- Hakk", Encycl. Islam, Suppl.

Minorsky, V., 1940 "Les origines des Kurdes", Travaux, du XXe congrès des orientalistes, Brussels (1938), pp. 143-152.

Minorsky, V., 1943: "The Curan", Bull. School Orient. Afr. Studies, Vol, XI, No. 1, pp. 75 - 103.

### شەرحی وێنەکان

یادداشت: ئەو وێنانەی وا لە گەڵ ئەم وتارەدا هاتوون هەموویان وێنەگرانی ناوچەکە (و لە ناویاندا A. Sevrugin) لە دەوروبەری ساڵی ١٩٠٥دا، کێشاویانن (مەگەر ناوی کەسێکی دیکە دەست نیشان کرابێت).

* رەسمی٣: ئـ) ڕەشماڵ (کۆڕەنگ) لە لوڕستانی باکوور.

ب) والی پشتکۆه (بە چاکەتی چوارخانەوە)، لەگەڵ برا و پیاوەکانی، دەوروبەری ساڵی ١٩٠٠.

* رسمی ٤: ئـ) شازادەی شەڕکەر، «سالارالدولە» (بەچاکەتی سپییەوە)، لەگەڵ سێ

سەرەک هۆزی تیرەی سەگوەند و دیرەکوەند (لوڕستان، دەوروبەری ساڵی ١٩٠٧).

ب) جەعفەرئاغای شکاک لە گەڵ سمکۆی برای (سەرەک هۆزی کورد) و میوانەکانیان لە تورکیاوە و هەروەها دەست و پێوەندەکانیان (دەوروبەری ساڵی ١٩٠٣).

* رەسمی ٥: ئـ) عادلە خانم، لەگەڵ کوڕ و زاواکەی (هەڵەبجە، ١٩١٤، رەسمەکە خاتوو «ت. مینۆرسکی» هەڵیگرتوە).

ب) ژنانی کورد لەگەڵ خزمەت کارەکانیاندا (ورمێ).

[بەداخەوە کەیفییەتی وێنەکان ئەوەندە باش نەبوو جارێکی دیکە لەگەڵ تەرجەمەی کوردیدا چاپ بکرێنەوە. من ئەم شی کردنەوەوانەی مینۆرسکیم تەنیا بۆ ریفرێنسی خوێنەر لێرەدا هێناوە. وەرگێڕ].



## پەراوێزەکانی هۆزەکانی رۆژئاوای ئێران

* وتارەکە، لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراوە:

Professor V. Minorsky, The Tribes of Western Iran, Journal of the Royal Anthropological Institute, Vol. 75, Parts 1-2, 1945, Pages 73 -80.

1. Medians (Mada)
2. Persians (Parsua)
3. Susa (Shushan)
4. Book of Esther
5. Kassites (Kashshu)
6. Hittite

٧. بڕوانە: مینۆرسکی (بەشی ئـ، ساڵی ١٩٣١)، دوای لاپەڕە ١٤١ و هەروەها (بەشی ب، هەمان ساڵ، ل ٩٣).

8. Parsa
9. Mada
10. Seleucia
11. Ctesiphon
12. Potelemy
13. Norseman

١٤. بڕوانە: مینۆرسکی، ساڵی ١٩٣٢

١٥. Toponymy= زانستی ناسینەوەی شوێنەوارە کۆنەکان لە ڕێگەی ناوەکەیانەوە، وجەتسمیە.

١٦. مەرکەزی ناوچەی سەڵماس، پێی دەگوترا «دیلمان» (واتە: دەیلەمان).

17. Khuzi

١٨. ناوی «خووز» (کە لە ناوی «خوزستان» و «ئەهواز » دا پارێزراوە)، پەیوەندییەکی لەگەڵ یەکێ لە گەلانی عیلامدا هەیە، کە یۆنانییەکان بە «ئوریۆی» (Urioi) ناویان بردوە.





19. Persarmenia
20. Thrace
21. Phrigia
22. Syrians
23. Assyrians
24. Aramic
25. Semetic
26. Nomads
27. Kurds of S ristan
28. O. Mann
29. Persians
30. Aryan
31. Persis

٣٢. Shemiran [گوندێک بە ناوی "شەمیران"، لە هەورامانیش هەیە. وەرگێڕ].

33. Achaemenids
34. Celtic
35. Sh l

٣٦. Aghachari [مینۆرسکی، لە وتاری "ناوی مغولی شوێن..." دا، ئەم وشەیە بە شێوەی "ئاغاج - ئەری" دەخوێنێتەوە. بڕوانە وتارەکە، هەر لەم کتێبەدا. وەرگێڕ].

37. Lesser Lur
38. Grass, made by M. Cooper
39. Zird
40. Koine
41. Lydia

٤٢. واهەیە مینۆرسکی ئاماژە بە داستانێک بکات کە لە "موکریان" بە "ڕووداوی کچە ئەرمەنی" ناوی دەبەن.



43. Lady Adela
44. Smolensk
45. Dr. P. Lerch
46. Russian Academy of Science

٤٧. مینۆرسکی، نووسراوەکانیساڵی ١٩٢١

48. J b riqa
49. Hasan waihids
50. Royal Anthropology Institute
51. Physical Anthropology
52. Ethonology

٥٣. [مینۆرسکی ئەم وتارەی لە تاران و لەسەردەمی حوکمی ڕەزاشای پەهلەویدا خوێندۆتەوە و ئەم قسەیەی لەڕاستیدا ڕەخنەیەکی نەرم و نیانە لە سیاسەتی «مرکزیت»ی ڕەزاشا، کە بەناوی ئەوەوە دەیویست گەلانی جیاوازی ئێران لەنێو فارسدا بتوێنێتەوە. وەرگێڕ].

# ناوی مغولیی شوێن*
# لە کوردستانی موکریان

١) لێکۆڵینەوەی گشتی لە «تۆپۆنیمی»[٢] ئێران
٢) جوغرافیای کوردستانی موکری
٣) چارەنووسی مێژوویی کوردستانی موکری
٤) عونسوری[٣] مەغۆلی لە ناوی شوێنەکاندا:
ئا) رووبار
ب) کێو و بستوو
پ) ناوچە و گوند
ت) هۆز
پاشکۆی ١) لیستەی زیادکراوی ناوی مەغۆلی شوێنەکان
پاشکۆی ٢) توێژە کۆنترەکان لە تۆپۆنیمی ناوچەکە: «پارسوا» و «دەریاوسا»



## ١- لێکۆڵینەوەی گشتی لە «تۆپۆنیمی» ئێران:

ئەم وتارە، کە نزیک بە بیست ساڵ لەمەوپێش نووسیومە، دوو ئامانجی سەرەکی لەبەرچاوە: یەکەم، پێداگرتن لەسەر گرنگێتی توێژینەوەی سیستیماتیک لە «تۆپۆنیمی» ئێران و دووهەم: بۆ نموونە، لێکۆڵینەوە لە ناوە مەغۆلییەکان لە لای هەرە باشووری ئوستانی ئازەربایجانی[٤] ئێراندا.

بەشی زۆری ئەو شتانەی وا لە پێشنووسە سەرەتاییەکەمدا گوتبووم، بە دەرچوونی زنجیرەیەک کتێبی باش لە ساڵانی ٣٢ ـ ١٣٢٨ (٥٣ ـ ١٩٤٩) دا، درێژەی پێدرا.

کتێبەکە، بە نێوی «فەرهەنگی جوغرافیایی ئێران» لەلایەن «بنکەی نەخشەکێشانی ئەرتەشی ئێران» ەوە بڵاوکرایەوە[٥]. پێکهاتنی ئەم زنجیرەیە، لە ژوور هەموو شتێکەوە بەهۆی هەوڵی رۆشنبیرانەی سەرۆکی پێشووی بنکە ـ «ژەنەراڵ حوسێنعەلی رەزم ئارا» (برای سەرەک وەزیری کوژراو)ـ هاتە ئەنجام.

دە بەرگی ئەم زنجیرەیە، بەپێی ناوی ئەو ١٠ ئوستانە دیاری کراون کە تەنزیماتی حکوومەتی ئێرانی ئەمڕۆیان بەسەردا دابەشکراوە و بریتین لە: ١) مەرکەز ٢) مەرکەزی رۆژئاوا ٣) ناوچەکانی خەزەر ٤) ئازەربایجان٥) کوردستان ٦) خوزستان ٧) فارس٨) کرمان ـ موکران ٩) خۆراسان ١٠) ئیسفەهان[٦].

بەسەریەکەوە، ئەوزنجیرە کتێبە لە چوار هەزار لاپەڕەی چواریەکی پێکهاتوە و هەر بەرگێکی بریتییە لە باسی بەشەکانی «شەهرستان» (گەورەترین بەشی ئیداری لە شارە سەرەکییەکاندا). «بەخش» (ناوەندی بچووکتر) و «دێهستان» (مەکۆی چەند ئاوایی).

ناوەکان بە ئەلف و بێی فارسی نووسراون و هەروەها شێوەی لاتینەکەشیان کەوتۆتە بەردەست[٧]. کورتەباسێکیش لەمەڕ شوێنایەتی جۆغرافیایی و ئیداری، ژمارەی خەڵک و زمان و هەروەها ئیش و کاری دانیشتوانیان نووسراوە. ئەم ناوانە خراونەتە نێو نەخشەیەکەوە و گەرچی یەکجار بچووک کراوەتەوە، بەڵام زۆریش بێ رێ و جێ نییە.

بەداخەوە هیچ پێرستێک بۆ ئەو ناوانە پێک نەهاتوە[٨] کە لە ژێر زەختی حوکمی پەهلەوی دا، تووشی گۆڕان هاتوون. گەرچی لێکۆڵینەوە مێژووییەکان هەندێک جار

شێواون، بەڵام هەرچۆنێک بێ، ئەوەندەی کە ئەو هەموو وشەیە بۆ یەکەمجار خراونەتە بەردەست، خۆی کارێکی گرینگە.

من بە هەواڵی «کاتالۆگ» ێکیشم زانیوە کە هەمان بنکە لەمەڕ شوێنە جۆغرافیاییەکانی ئێران، وەک چیا و رووبار... پێکی هێناوە و هیچ پێویستیش ناکات دەربارەی پێداویستی ئەو چەشنە بڵاوکراوانە بۆ پسپۆڕان شتێک بگوترێ، بەتایبەت ئەگەر نەخشە و تەرحی ڕۆشنیشیان لەگەڵ بخرێ.

تەنیا لە سەردەمی ئێستا دایە کە توێژینەوەیەکی سیستیماتیکی ناوی ئێرانیی شوێنەکان، بەسەنگ و تەرازووی لێکۆڵینەوەی رۆژئاوایی، هاتۆتە گونجان؛ ئەو شوێنانەی کە نووسراوە مێژووییەکان ناوبردەیان کردوون، هاسانتر دەناسرێنەوە و زانستی «بەراوردی زمانەوانی» بەهۆی بیچمی کۆنی [ئەوناوانەی] کە بەسەر زمانی رۆژانەی خەڵکەوە پارێزراون یاخود لەژێر شوێن تێکرانی فاکتورە مێژووییەکاندا تووشی گۆڕانکاری هاتوون، خەنی و دەوڵەمەند دەبێ.

هەروەها زانایانی «مرۆڤناسیی» ش دەتوانن شوێنی دانیشتوانی کۆن هەڵبگرن و ئەو «کارتی ڤیزیت»انەی[٩] وا لە کۆچ یان هروژم و هێرشەکانیان بەجێ ماون، بخەنە بەر ئەزموون.

بەپێچەوانەی توێژینەوە لە ناوی کەسایەتییە ئێرانییەکان - کە ئێمە سەرچاوەی وەک «Iranisches Namenbuch, 1895 [= کتێبی ناوی ئێرانی] «یۆستی» مان بەدەستەوەیە (و ئێستا زۆریش نایابە)، توێژینەوە لە تۆپۆنیمی ئێران بە شێوەی سیستیماتیک بەرێوە نەچوە و هیچ توێژینەوەیەکی هەمە لایەنەمان وەک کارە پڕ ئەرک و زەحمەتەکەی «ج. هۆفمان» لەمەڕ شیکردنەوەی ناوی «ئارامی»ی شوێنەکان[١٠] یان وەک کارەکەی «هـ. هوبسمان»[١١] بەدەستەوە نییە.

«بیلربێک»[١٢]، «و. بێلک»[١٣]، «م. ستریێک»[١٤]، « تۆریۆ ـ دەنگین»[١٥]، « فۆریر»[١٦]، «ئی. سپایزیر»[١٧]، «هیرزفیلد»[١٨] و ئەوانیتر، تۆپۆنیمی زۆر کۆنی زنجیرەی زاگرۆسیان لە پێوەندی سەرچاوە ئاشوورییەکاندا خستۆتە بەرلێکۆڵینەوە.

لەسەردەمی پێشوودا، کاری ناسینەوەی ئەو ناوانەی کە نووسەرە کلاسیکەکان ئاماژەیان پێ کردوون، لەلایەن ئەوکەسانەوە بەرێوە دەچوو، کە کتێبەکانیان دەبردە ژێر





چاپ. «و. تۆماسێک»[١٩] لە توێژینەوە بایەخدارەکانی خۆیدا بەناوی «گەشتی دەریایی نیرک لە کەنداوی فارس»[٢٠]، هەروەها «شارێگەی خۆراسان»[٢١] و «جادەکانی سەحرای ناوەندی»[٢٢]، نیشان دەدات کە دەتوانرێ لەگەڵ سەرچاوەکانی سەدەگەلی لەمێژین و ناونجی دا چ بکرێ.

لەشکرکێشانەکەی ئەسکەندەر، بەشێوەیەکی سروشتی، لێدوانی زیاتری لەسەرکراوە (دووایین کار لەلایەن «و. و.تارن» ەوەیە)[٢٣].

ئێمە بۆ خەزێنەیەکی پڕ لەزانیاری وەک «ئیرانشەهر - کە لیستەی پەهلەوی شارە سەرەکییەکانی ئێران و ژمارەیەک توێژینەوەی دیکەیە - ، قەرزداری « ج. مارکوارت»[٢٤] و بلیمەتی و پسپۆڕییەکەی ئەوین. هەرچۆنێک بێ، هێندێک جەدوەلی وەک «کاتالۆگی[٢٤] ناوی مادی شارەکان» نووسراوی «بەتلەمیووس»[٢٥] ئێستاش هەر چاوەڕوانی لێکۆڵینەوەی تایبەتن بۆ درێژەدان بە دەستکەوتە بەنرخەکانی «س. ف. ئاندریئاس»[٢٦] لە زنجیرەیەکی چل بابەتیدا کە پیشکەشی «ئەنسیکلۆپیدیای ڕاستەقینە»ی «پاولی - ویسسۆوا»ی کردوە[٢٧].

ئێراناسەکان - لە «ویندشمان»[٢٨] و «گەیگر»[٢٩] و «نۆڵدکە» ەوە[٣٠] بگرە تا دەگاتە شارەزایانی ئەم رۆژگارە، وەکوو: «هـ. و. بەیلی»[٣١] و «و. و. هەنینگ»[٣٢] - ، یارمەتییەکی زۆری ناسینەوە و شیکردنەوەی ناوی شوێنەکانیان داوە. پرسیارگەلی بناغەیی وەک بنەڕەتی عونسوری [وشەی] «کەرتە»[٣٣] لەلایەن «ئۆ. بلاو»[٣٤] «ئا. د. مورتمان»[٣٥] و «نۆڵدکە» وە، لە لاپەڕەکانی «zdmg» (ساڵانی ١٨٧٧ تا ١٨٧٩) و لە گۆڤاری تایبەتی:"Zeitschrift für ortsnamenforschung" دا باس و لێدوانی لەسەرکراوە. لەکاتێکدا بابەتە ئێرانییەکان کەمتر بیریان لێکراوەتەوە[٣٦]، لەم دواییانەدا، «و. ئی. یلرس»[٣٧] ئەزمونێکی یەکجار بەربڵاوی زنجیرەیەک ناوی ئێرانیی شوێنی گرتۆتە ئەستۆ و بە تۆپۆنیمی ئێستایانەوەی لکاندوون[٣٨].

کۆتایی قسە، لەناو ئێرانییەکان خۆشیاندا، نابێ هەوڵی «سەید ئەحمەدی کەسرەوی» لە بیر بکرێ[٣٩]. ئەو مێژوونووسە مەزن و سەرنجڕاکێشە (کە لەساڵی ١٩٤٥دا کوژرا)[٤٠]، بەهیچ مانایەک زمانەوان نەبوو بەڵام شتێکی وەشاوەیە کە هەستی بە پێداویستی شیکردنەوەی ناوە ناوچەییەکان بەتایبەت هی زێدی خۆی ئازەربایجانی دەکرد.

بەسەریەکەوە، ئاکامی توێژینەوەکانمان ـ گەرچی پرژ و بڵاوە و هەمەلایەنی نییە، بەڵام هێشتا هەر جێگەی سەرنجە. رووی گشتی لێکۆڵینەوەکەش لە بنەڕەتدا لە کەلەپووری ئەدەبییەوە تا جوغرافیاییەکی ڕاستەقینە، هەمووی گرتۆتە بەر.

ئێستا، کاتی ئەوە هاتوە کە پێگەی روانینمان بگوێزینەوە بۆ لایەنەکەی تری مەسەلەـ واتە گەنجینەی ئەو ناوانەی کە تا رۆژگاری ئێمە ماون و لەناویاندا دەبێ هەوڵی دۆزینەوەی بنەما و هەروەها راستکردنەوەی چەوتییەکان بدەین.

ئەوەش گرنگە کە توێژە جۆربەجۆرەکانی تۆپۆنیمی – وا رەنگدانەوەی چارەنووسی مێژوویی ئەم شوێن و ئەو مەڵبەندەن –، شی بکرێنەوە.

ئێران پڕە لە لقوپۆی هۆز و عەشیرەتی کۆن و نوێ. گەڕان بەدوای ناوی ئەو هۆزانەدا، هاوکات لەگەڵ توێژینەوە لە زاراوە ناوچەییەکان، واهەیە بتوانێ دابەشکرانی سەردەمی پێشوو و رێگەی کۆچ و راگوێزرانیانمان بۆ روون بکاتەوە[41]– وەک زۆر وا هەیە کە ناوی چیای«باڵخان»[42] لە نزیک «کراسنۆڤۆدسک بەی»[43] نزیک دەریاچەی«خەزەر»[44] (بڕوانە پریسکوس، بەشی [41]: بەڵام)، لەلایەن تورکە «ئۆغوز» ەکانەوە[45] هێنرابێتە «شبە جەزیرەی باڵکان» («هەئموس»ی کۆن): یان بوونی «دەماوەند» ێکی دیکە لەسەر سنوورەکانی «بەلووچستان»، رەنگە بەهۆی کۆچی بەرەو باشووری ئەو بەلووچانەوە بەیان بکرێ کە وا دیارە شوێنەواری زمانی خۆیان لە ئاوەدانییەکانی ناو سەحرای ناوەندیی ئێراندا بەجێ هێشتوە[47].

## ٢- جوغرافیا:

وەک شوێنی ئەزموونکاری خۆم، لەم وتارە کورتەدا حەوزەی[48] باشووری «گۆلی ورمێ» م هەڵبژاردوە. ناوچەکەم سێ جار بینیوە:

ـ ساڵی ١٩٠٥ کاتێک لە«مەراغە» وە چووم بۆ چاوپێکەوتنی هەندێک شوێنی حەوزەی چۆمی «تەتەهوو»[49].

ـ ساڵی ١٩١١ کاتێک لەگەڵ هاوڕێی ئینگلیسیم – خوداڵێخۆشبوو «س. هـ. شیپلی»[50]دا مەئمووریيەتی پێڕاگەیشتنمان بۆسەر ئەو ناوچانە هەبوو کە ئەودەم تورکیا داگیری کردبوون.





ـ ساڵی١٩١٤ و ئێوارەی دەستپێکرانی شەڕی یەکەمی جیهانی کە منیش یەکێ بووم لەو چوار نوێنەرە(ئێرانی، تورک، بریتانیایی و ڕووسی) یەی وا بۆ دیاری کردنی سنووری نێوان تورکیا و ئێران دەست نیشان کرابووین– ئەو سنوورەی کەوا بەشێوەی گشتی لە دوو شەڕی جیهانی و زۆر کێشمەکێشی سیاسی تریش، رزگار بوە.

ناوچەی باشووری گۆلی ورمێ لە هەر دوو باری جوگرافیایی و کۆن ناسییەوە[51] یەکجار گرنگ و سەرنجڕاکێشە[52]. چوار رووبار لەلای باشووریەوە دەڕژێنە ناو زەریاچەکەوە: یەکەمیان چۆمی گرنگی «جەغەتوو» لەلای رۆژهەڵات؛ سەرچاوەی چۆمەکە لای باشوور و نزیک بە داڵانی «شلێر» ە[53] کە پێشڕەوتێکی [خاکی] عێراقی ئەمڕۆیە لەناو کوردستانی ئێراندا و پێوەندی نێوان زەوییە نزمەکانی مێزۆپۆتامیا (میاندواو) و بەرزاییەکانی ئێران هەمیشە لەو شوێنەوە گیراوە.

جەغەتوو، چەرخێکی دوور و درێژ بەلای رۆژهەڵاتدا دەدا و لەوێوە لقێکی گرنگ (کە «سارووق»ی ئێستا بێ) پێیەوە دەلکێ و قەڵای کۆنی پارتی[54] («تەختی سولەیمان»ی ئێستا) و ئەشکەوتی «کەرەفتوو» (بە بەردەنووسێکی یۆنانییەوە) دەکەونە تەنیشتی.

لەوێوە جەغەتوو ، روو لە باکووری رۆژئاوا دەکات ئینجا بەرەو دەریاچەکە دەکشێ و لای راستی خۆی، شوێنی «گەنزەک»ی پێتەختی کۆنی ئێرانی بە ئاورگەیەکەوە («لەیلان»ی ئێستا ) بەجێ دێڵێ.

لە جەرگەی کەوانەکەی «جەغەتوو» دا و هەر بەتەنیشت ئەویشەوە، چۆمێکی کورتتر بەناوی «تەتەهوو» لە ناوچە شاخاوییەکانەوە بەرەو رۆژهەڵاتی شاخی «کورتەک»ی ناوەندی و لێواری دەریاچەکە دێتە خوارێ کە دور نییە لە سەردەمێکی دوور یان نزیک [لەگەڵ جەغەتوو] بەیەکەوە لکابن.

سێهەم و لە دوانەکەی دیکە کورتتر، چۆمی «ساباڵاغ»ـە[55] کە «مهاباد»ی ئێستا ناوە پێشوەکەی خۆی لەوەوە وەرگرتوە. چۆمەکە، لە باکووری رۆژئاوای «کورتەک»ـەوە دێتەخوارێ و بە رێگای دۆڵێکی بەرتەنگی نێوان ژوورە لە بەرد داتاشراوەکەی فەقرەقا (ئیندرقاش) و ئاودێرگەی کۆنی «وسووکەند» دا[56] دەگاتە دەشتایی «شارویران»[57].

چوارەم، چۆمی گرنگی «گادەر» ە کە لە دراوسێیەتی بواری «کێلەشین» (و

بەردەنووسە ناودارە دوو زمانی ئاشووری ـ ئۆرارتۆیی یەکەی)، سەرچاوە دەگریّ و دەشتی بەپیتی «شنۆ» و «سولدووز» ئاودیّری دەکا ئینجا دەرژیّتە سووچی باشووری دەریاچەکەوە.

بارودۆخەکە بەهۆی ئەو راستییەوە هەندیّک ئالّۆز دەبیّ کە سەرچاوەی [چۆمی] «کەلّویّ»یان «زیّ» کەوتۆتە نزیک «بواری کیّلەشین» بەلاّم بەپیّچەوانەی ئەویتر، بەرەو باشوور دەکشیّ و ئاوی بەری رۆژهەلاّتی شاخی «قەندیل» وەکۆ دەکات کە ئیّستا سنووری نیّوان ئیّران و عیّراقە و ئینجا (بە ناوی «زیّی بچووک» ەوە) بە دۆلّی شکۆداری «ئالان »دا تیّدەپەریّ تا لەگەلّ «دیجلە» دا یەک بگریّتەوە.

بەو پیّ یە، ناوچەی باسکراو، حەوزەی دەریاچەی ورمیّ و کەنداوی فارس دەگریّتەوە و راستی شایانی باس لەم پیّوەندی یەدا ئەوەیە کە سەرچاوەکانی چۆمی گرنگی «زیّی بچووک» لەجیاتی ئەوەی کەوتبنە بەری «میّزۆپۆتامیا» وە، کەوتوونەتە پشت زنجیرەی سەر سنووری «قەندیل» ( لە زاگرۆس).

لە نیّوان باکوری بواری «کیّلەشین» و ریّگای باشووری نیّو دۆلّی «ئالان» دا، زۆر بوار و ریّچکەی دیکە (تەنانەت ریّی خۆشتریش) لەسەر سنوور هەن کە نیشاندەری ئەو دەرەتانەن وا شایەکانی ئاشوور بەهۆی ئەوەوە، ناوچەی ئیّستای «موکریان»یان دایە بەر هیّرشکاری خۆیان.

دۆلّی جەغەتوو لە هەموو شویّنیّکی باکووری رۆژهەلاّتدا ئاوالّە و ئامادەی نفووز تیّکرانە. هەر بە دریّژایی ئەو دۆلّەش، گەلانی کۆنی وەک «ماد» و لە سەردەمیّکی زۆر تازەتر دا تورک و مەغۆل توانیویانە ریّی تیّبەرن.

بەشیّوەیەکی رەسمی، تەتەهوو وەک سنووری نیّوان تورک و کورد[٥٨] چاوی لیّدەکریّ کە «کورد» بە ژمارەیەکی زۆر لەبەری رۆژئاوای ئەو دا دەژین[٥٩]. بەلاّم تەنانەت لیّرەشدا، تۆپۆنیمی ناوچەکە ـ وەک دواتریش دەیبینین ـ، مۆرکی نفووز (بەتایبەت هی سەردەمی مەغۆلەکان) ی پیّوە دیارە.





## ٣- چارەنووسە میّژووییەکان:

لەریّگەی سەرچاوە ئاشوورییەکانەوە، بە بوونی ژمارەیەک شازادەنشینی بچووک دەزانین کە لە بەرەبەیانی میّژوو، لە بەشی رۆژهەلاّتی زاگرۆسدا ژیاون (خەرخار[٦٠]، ئیلیپی[٦١] و ئەللابریا[٦٢] ئەمانە، سووک و هاسان ناخریّنە ناو نەخشەوە ، چوونکە ناوە پیّش ئارییاییەکان لەبیرچوونەتەوە و لەسەر زمانی دانیشتوانی دواتردا تووشی گۆرانکاری هاتوون[٦٣].

لای رۆژهەلاّتی گۆلّی ورمیّ، نیشانەی بوونی پاشایەتییەکی گرنگتر واتە «ماننا»ی لیّ یە[٦٤]. بەردەنووسە زیان پیّگەیشتووەکەی شای ئۆرارتوو «مینوا» (٧٨١ ـ ٨١٠ پ. ز) لە «داشتەپە» (تەتەهووی خواروو) شویّنەواریّکی بایەخدارە لەپیّناو روونکردنەوەی لای کەم بەشیّک لە خاکەکەی[٦٥].

سالّنامە ئاشوورییەکان لە سەرەتاکانی سەدەی نۆهەمی پیّش زاییندا، دەرکەوتنی یەکەم «مەدە» ئیّرانییەکان (میدی) و پەرسوا (پارسی) یەکانیان ئاستە کردوە[٦٦].

ئاشوورییەکان و نەتەویستە باکوورییەکانیان واتە ئۆرارتوو (شاهانی «وان») چەند جار هیّرشیان بردە سەر بەشی باشووری حەوزەی زەریاچە و بەختەوەرانە، تۆمارکراوی دوور و دریّژی هەشت جار لەشکرکیّشانی «سارگۆن»ی دووهەم (لە ٧١٤ ی پ. ز دا) تا رۆژگاری ئیّمە پاریّزراوە[٦٧].

لە سەردەمی «خەشایارشا» دا «سەکا» کان هیّرشیان بردە سەر ماد و بۆ ماوەی ٢٨ سالّ بوونە مەزن و سەرۆکی ئاسیا تا کاتیّک کە شای ماد ئیمپراتۆریەتی خۆی بووژاندەوە (هیرۆدۆت، بەرگی یەکەم، ل ٦ ـ ١٠٥). شویّنی ئەوانیش دەتوانریّ لە تۆپۆنیمی و هەروەها لە دەستکەوتە کەونارایییەکاندا هەلّبگیریّ.

دۆزرانەوەی ئەم دواییانەی گەنجینەی «زیویە»[٦٨] کە تیّیدا جەواهیراتی ئاشووری و سەکایی ئامیّتە کراون، رەمزە بۆ مەنجەلّیّکی کانزا تواندنەوە کە بریتی بیّ لە ناوچەی رۆژهەلاّتی زنجیرەی زاگرۆس تەنانەت لەو سەردەمە کۆنە دا!

لە سەردەمی ئەسکەندەر دا، ناوچەکە بەشیّک بوو لە «مادی ئاترۆپاتەن» و بناغەدانەرەکەی واتە جەنەرالّی هەخامەنیشی «ئاترۆپات» و پاش ئەویش جیّگرەکانی، حوکمیان بەسەر دا دەکرد. زاراوە مادییەکان (کە وەک باپیرەگەورەی زمانی کوردی دادەنریّن)، دەبیّ لە ناوچەکەدا بەردەوام بووبن و قسەیان پیّکرابیّ[٦٩].

لە ماوەی دەستەڵاتداریی پارتییەکان لە عێراق و ئەرمەنستاندا، گەلێک جار ئازەربایجان ناوچەیەکی جیاوازی پێکدەهێنا کە لەلایەن لقێک لە بنەماڵەی حوکمدارەوە بەڕێوە دەچوو[70]. گردی قایی «تەختی سولەیمان» (لە «سارووق) ی ئەمڕۆ، وەک یادگارێکی سەردەمی پارتی دەناسرێ. هێندێک تێکەڵاویی پارتییەکان لەگەڵ دانیشتوان و هەروەها لەگەڵ تۆپۆنیمی ناوچەکەشدا، چاوەڕوان دەکرێ.

ئەوەش بڵێین کە ناتوانرێ نفووزی «ئالان» (ئۆسیت) ـەکان لەلای ئازەربایجان و ئەرمەنستانەوە لەبەرچاو نەگیرێ. «ئالانەکان» لە ساڵانی ٢٦، ٧٢ و ١٣٦ ی زاییینیدا هێرشیان کردە سەر «پارتیا» و دوا جار چوونە ناو «ئاترۆپاتەن»ەوە[71].

لەژێر حوکمی ساسانیاندا، «گەنزەک»ی پێتەختی مەڵبەندەکە و هەروەها ئاورگە ناسراوەکەی («لەیلان») خزمەتێکی زیاتریان بە پرۆسەی بەئێرانی کرانی ناوچەکە تا باشووری دەریاچەی ورمێیان کرد. بە گوێرەی «ا. خوردادبێهـ»، ل ١٢٠ و «مەسعوودی» (تەنبیهـ، ل٩٥)، شا مەزنەکان [ی ساسانی] لە کاتی گەیشتنیان بە پاشایەتی، لە«تیسفوون»ـەوە دەهاتن بۆ «شیز». هاتنەکەش، بە ڕێگای شارەزوور و بەسەر شارێکدا بوو کە بەپێی خەسڵەتەکەی پێیان دەگوت «نیم – ئەز – راهـ» (واتە مەنزڵی نیوەڕێ).

سپای بیزانسی، بۆ پشتگیری کردن لە مافی خوسرەوی پەرویز بەرانبەر بە «بەهرامی چووبین»ی بەرهەڵستکار، گەیشتنە گەنجەک و بە ماوەیەکی کەم دوای ئەوە، «هیراکلیووس»ی ئیمپراتۆر چەندین جار بە ناوچەکە دا تێپەڕی – ئەو ناوچەیەی کە دەبێ یەکێک بووبێ لە حەساسترین شوێنەکانی ناو ڕێکخراوەی ئیمپراتۆریەتی ئێران.

ئینجا عەرەب هاتن و ئێمە ناوی ئەمارەتی «ئەودی» دەبیستین کە لە «بەرزە» (سەقز؟) و «سەلەق» (لاهیجان [لاجان]) دامەزرا و هەروەها ناوی ئەمیرانی «طائی» لە بنەماڵەی «رودەینی» کە خاکی ئەسڵییان «نیریز» (سولدووز) بوە[72]. پاشان کوردی «هەزبانی»[73] بوونە جێگیریان کە دوور نییە لەبەری دایکەوە گەیشتبنەوە زنجیرەی «رەوادی» تەوریز و مەراغە[74].

بە درێژایی هەموو ئەو سەردەمە و بۆی هەیە زۆریش پێش ئەوە، «دەیلەمی»یە چیایی یەکانی «گێلان» دەبێ زۆر شوێنی سەر سنوری ئەمڕۆی «سەڵماس» و «لاجان»[75] و «هەورامان»یان داگیر کردبێ[76].



لەسەرەتاکانی سەدەی یازدەهەمدا، تورکی ئۆغوز هاتنە سەر شانۆ و تەنانەت دەبێ سەرەتای بەکۆڵۆنی کرانی ناوچەی نێوان «جەغەتوو» و «مەراغە» ش، هەر لەو سەردەمەوە دامەزرابێ.

لەسەدەی سێزدەهەمدا، مەغۆل هاتن و دەست بەجێ مەراغەیان کردە پێتەخت. هەروەها ئێمە بە هەواڵی «ئیلخان»ـەکان دەزانین کە چەندین جار زستانە هەواریان خستۆتە دۆڵی گەرمی «جەغەتوو» ەوە[77].

رەشیدالدین [رشیدالدین فضل الله (٧١٨ ـ ٦٤٥) دانەری جامع التواریخ و وەزیری ئاباقان]بەیاننامەیەکی ساڵی ١٣٠٣/٧٠٣ ی «غازان خان»ی خستۆتە روو (چاپی جان، G.M.S، ل ٩ ـ ٣٠٣) کە بە گوێرەی ئەو، سیستمی «ئیقتاع» (دابەش کردنی زەوی) «نێوان سەیحوون و میسر»، لەناو هەزاران کەس لە سپای مەغۆل دا دامەزرا. رەشیدەددین شوێنی ئەو زەوییانە دەستنیشان ناکا بەڵام لەو پێوەندییەدا، بوونی هێندێک ناوی وەک «سولدووز» و «ئۆیرات»یان هی کەسانی وەک «ئیل – تەمور» و... کە لەناو تۆپۆنیمی ئازەربایجان دا ماونەتەوە، نیشانەگەلێکی بەنرخن[78].

ئەوانەی وا دەستبەجێ دوای لەناوچوونی تیرەی «چەنگیز» بوونە جێگری، زۆرجار لە باشووری ئازەربایجان بەگژ یەکدا دەچوون. ناوچەکە لە سەردەمی «جەلایری»یەکاندا، کەوتە سەر هێڵی پێوەندی گرتنی نێوان دوو پێتەخت واتە بەغدا و تەورێز. سپای «تەیموور»یش لە بەری ڕۆژهەڵاتی چۆمی جەغەتوو دا چالاکییان دەنواند[79].

لەژێر دەستەڵاتی زنجیرەی تورکمانەکان و تەنانەت لە ژێر حوکمی «سەفەوی»یەکانیشدا، دەبێ عونسوری تورکمەنی لە ناوچەی باشووری مەراغەوە بەهێز کرابن، بەتایبەت دوای لەشکرکێشانەکەی «شاعەباس» بۆ سەر میرانی موکری بە ئامانجی تەمێ کردنیان لە ساڵی ١٠١٩ی کۆچی / ١٦١٠ز(بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٨٠).

لە سەر و بەندی حکوومەتی «نادرشا» دا هەندێک لە ئەفشارەکانی هاوعەشیرەتی شا، کە لە ڕۆژهەڵاتی جەغەتوو دا دامەزرابوون، نێردرانە شوێنی دیکە و وا وێدەچێ کە تورکی «موقەددەم» لە شوێنیان نیشتەجێ بووبن[80].

لە سەردەمی «قەجەر»ـەکاندا، «قەرەپاپاخ»ـە هەڵاتووەکانی گورجستان لە «سولدووز» دامەزرێنران و کوردی ناوچە (بە تایبەت لە سووچی باشووری ڕۆژهەڵاتی مەڵبەندەکەدا)،

بوونه رەعیەتیان.

له بارودۆخێکی وادا، جێی سەرسووڕمانە کە کورد چۆن توانیویەتی مەڵبەندی تایبەت بەخۆی تا جەغەتووی ناوەندی و تەتەهووی خواروو بپارێزێ! دەبێ کورد بەهۆی دامەزرانی «بڵباس» لە نزیک سەرچاوەی «زێی بچووک» (کەڵوێ) وە بەهێزکرابن.

بە گوێرەی وەرسووڕانی نوێی ناسیۆنالیستیی ڕێژیمی پەهلەوی، ناوی کۆنی «ساوجبلاق» جێی خۆی دا بە ناوی تازەی فارسی «مەهاباد» کە ڕەنگە ئیشارەیەکی بۆ «ماد» (ماهـ) کۆن تێدابێ.

دوای شەڕی دووهەمی جیهانی ، ناوچەکە بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو کەوتە بەر ڕووناکایی، ئەویش کاتێک بوو کە خودموختاری کوردی ئێران (لەناو ئازەربایجانی ئێران) لە مهاباد ڕاگەیێنرا و جووڵانەوەکە، زۆر بە توندی لە لایەن سپای دەوڵەتەوە تێک شکێنرا[81].

ڕوونکردنەوەی هەموو ئەو ڕووداوە مێژووییانە، هەر لە ئاشوورییەکانەوە تا سەردەمی ئێمە، دەتوانرێ لە تۆپۆنیمی ناوچەکە بخوازرێ.

### ٤- عونسوری مەغۆلی لە ناوی شوێنەکاندا:

لەناو ئەو شوێنەوارانەی وا لە توێژی جۆربەجۆری دانیشتوان بەجێ ماون، بڕیارم دا توێژینەوەکەم لە چوارچێوەی عونسوری لەبیرکراو و باس لێنەکراوی مەغۆلیدا بەربەست بکەم.

عونسوری ئەوتۆ، سەرنجی هەموو ئەو کەسانە بەرەو خۆی ڕادەکێشێ وا بیر لەو ڕاستییە دەکەنەوە کە ماڵ و زێدی مەغۆلان کەوتۆتە نزیکەی ٣ هەزار مایل لای ڕۆژهەڵاتی گۆلی ورمێ و دەستەڵاتی نەک زۆر درێژخایەنیان بەسەر ناوچەکە دا، نزیکەی ٦ سەدەیەک لەمەوبەر کۆتایی پێهاتووە.

بە پێویستی دەزانم هەر چەشنە لێزانییەکی خۆم لە زمانی مەغۆلی، ڕەت بکەمەوە [لەگەڵ ئەوەشدا] زۆرجار ئەو ڕوون کردنەوانەم بەدڵ نەبوون وا پسپۆڕ و شارەزای زۆر وڵاتان بە دلۆڤانییەوە لەمەڕ هێندێک ناو پێشنیاریان پێکردووم.

جا لەبەر ئەوەی گەرەکم نییە لەگەڵ پێشنیاردەرە میهرەوانەکانی خۆم بکەومە



شەڕەقسەوە، دەبێ بیری خۆم بخەمە دۆخی ئەو نیشانانەوە کە دەتوانم لە مێژووی ئێران و «مێژووی شاراوەی مەغۆل» و هەوەها لە وشەگەلی مەغۆلیدا بیاندۆزمەوە و لەناو هەموویاندا شوێنی یەکەم دەدەم بە«مقدمە الادب» [قامووس] ی مەغۆلی – تورکی، چاپی ن. پۆپ، مۆسکۆ، ١٩٢٨(کە بە «م.ئا» ناوی براوە).

من، عونسورەکانی توێژینەوەی خۆم بەسەر چەند تاقمی تایبەتدا دابەش کردووە کە بریتین لە: چۆم، کیو، ناوچە، گوند و هۆز.

#### ئا) چۆم

ناوی ڕووبار و چۆم، سەرەکی ترین بەشی تۆپۆنیمی پێکدەهێنن[82]. بەڵام لە ئێراندا زۆر جار ناوی هێندێک ڕووباری گەورە، بەهۆی ڕووداوە مێژوویی یەکانەوە گۆڕاوە.

لە ڕێگای «نزهت القلوب»ـەوە (نووسراوی ساڵی ٧٤٠/ ١٣٤٠ ز)، لاپەڕەی ٢١٧، دەزانین کە چۆمی گرنگی «سفیدرود» («ئارمادۆس»ی کۆن) کە لەلای ژوورەوەی خۆی بەشی باکووری ڕۆژئاوای دەشتی ئێران ئاودێری دەکا، لەلایەن تورکان (لەم باسەی ئێمەدا، مەغۆل) ـەوە ناوی «هوولان – مووران» («هولان ـ مویرەن») بە واتای چۆمی سوور) ی پێدراوە.

دواتر، بەشوێن ئەم داهێنانەی مەغۆلەکاندا، ناوێکی هاوتای تورکی واتە «قزل – ئوزەن» کرایە جێنشینی ئەویتر[83]. بەڵام لە لایەکی ترەوە، ناوی مەغۆلی ڕووباری «جەغەتوو» و «تەتەهوو» لە سنوری نێوان ڕەعیەتە کوردو تورکەکانی شا دا، وەک خۆی مایەوە و ئاڵ و گۆڕیان بەسەردا نەهات[84].

لە ڕاپۆرتی ڕووداوەکانی ساڵی ١٢٦٣/٦٦١ دا، ڕشیدالدین (چاپی کاترێمێر، ل ٤٠١) دەڵێ: «کاتێک زستان هات، هەلاکۆ بە ئامانجی چوون بۆ زستانەهەواری «زرینەرود» کە مەغوول پێی دەڵێن جەغاتوو و نغاتوو (دەبێ تەغاتوو بێت)، بەرەو مەراغە چوو. لەم ڕستەیە دا، وا هەیە زرینەرود حەوزەی هەر دوو ڕووبارەکە بگرێتەوە و وەک پێشتریش گوترا، تەتەهوو ڕەنگە زەمانێک لە خوارووترین بەشەکانی خۆیدا لە زەلەکانی لێوار دەریاچەی ورمێ گەیشتبێتەوە جەغەتوو[85].

ناوێکی کۆنی دیکە لە لایەن «تیۆفیلاکت سیمۆکەتتە» وە[86] (چاپی بۆن، ل ٢٢٣)

دراوە بە چۆمەکە ئەویش بریتییە لە: واتە: چۆمی ڤالاراتۆ. هەر ئەو ناوە کۆنەش بە روالّەت لە کتێبی «ژیانی مار یەبەلاها»[87] وەرگێڕاوی شابۆ، ل ١٥١دا رەنگی داوەتەوە کە دەڵێ: لە ساڵی ٥ - ١٣٠٤ لە لێواری چۆمێک کە بە زمانی مەغۆلی، «جەغەتووی مەغۆلی» (کذا) و بە فارسی «وەکیەرود»ی پێ دەگوترا، قەشەی گەورە گەیشتە لای ئولجایتۆ[88]. رەنگە ئەم ناوەی دوایی بکرێ وەک «والارود» ساغ بکرێتەوە[89].

ناوی جەغەتوو یەکێکە لەو ناوە مەغۆلییە زۆرانەی وا پاشگری «توو»یان گرتوە[90]، بەواتای «هی...»یا «ئامادەکراو لەلایەن... ـەوە». ئەو کەسانەی سەرچاوەی مەغۆلی زانییەکەی منن، بۆچوونەکەمیان پەسند نەکرد کە رەنگە ئەم ناوە، نۆینەرایەتی «چەغان - توو» بکات بەواتای «خاوەنایەتی شتێکی سپی». بڕوانە: «مقدمە الادب، ل ١٣٠، وشەی چاغاتوو»[91].

جا، بۆیە وێچووتر لە هەموان بۆچوونی «پرۆفیسۆر و. کوتویز[92]»ـە کە لە ساڵی ١٩٣٥دا پێی راگەیاندم و تێیدا ناوەکەی بردەوە سەر «چەقە» بەواتای سنوور و لێواری ئاو (بەراوردی بکە لەگەڵ «یەقە»ی تورکی) هەروەها سەیری واتای «چەقە» بکە لە مقدمەالادب دا (ل ٢٠١ بەواتای «یەخە» و ل ٣١٢ بەواتای پشتێن). لە راستیشدا، چۆمی جەغەتو بە رۆیشتن و شۆڕدنەوە [ی خاک]، شوێنێکی جوگرافیایی تەواو پێکدەهێنێ (بڕوانە سەرەوەتر بەشی جوگرافیا).

«تەتەهوو» لە بیچمی ئێستای خۆیدا، دەتوانێ پێوەندی بە «تەتەقوو» ەوە هەبێ بەواتای «لەکێش هاتوو» (مقدمەالادب، ٣١٢) یا تەنانەت بە «تەتەئوول[93]» ەوە بەواتای «خەندەک و قەنات». بەراوردی بکە لەگەڵ «تەتەقول»[94] کە ناوی چۆمێکی بچووکە لە باکووری «دەربەند» لە داغستان.

هەرچۆنێک بێ، «نزهت القلوب» ناوی «تەغەتوو» دەبات[95] کە رەنگە بکرێ وەک «تەقە(ن) - توو دابنرێ بەواتای «خاوەن قەڵەڕەشە»یا «پێوەندی دار بە قەڵەڕەشەوە». مقدمە الادب، ل ٣٤١.

ناوی رووباری سێهەمیش هەر لە تورکی دەچێ: «سائوج (ساڤوج) بولاق (بەواتای کانیاو)» بەڵام ئەو عونسورەی وا لە فارسیدا بە «سائوج» («ساڤوج») حونجە کراوە، زۆر روون نییە. هاوناوێکیشی هەیە کە بریتی بێ لە مەڵبەندێکی سەر بە پێتەختی ئێران [96]



و بیچمە راستەقینەکەی (لە هیچکام لەو دوو حاڵەتەی «سائوج و ساڤوج» دا) پشتگیری لە تەعبیری عونسورە ئەسڵییەکەی بەهۆی «سائوق»ی تورکییەوە ناکات، کە واتای «سارد»ی هەیە[97].

دەنگی «ق» ئەستەم ببێتە «ج»، ئەوددەم تۆ بڵێی ناوەکە لە «ساوجی»ی تورکییەوە هاتبێ کە واتای «وێژەر، پەیامهێنەر و پێغەمبەر»[98] دەدا؟ ئەم ناوە، مەغۆلی نییە و وا هەیە ئەوان خۆشیان لە دەرەوەیان هێنابێ.

ناوی «گادەر» لەو ناوە سەیر و سەمەرانەی ناوچەکەیە، کە هیچ هاوچەشنێکی نییە. لە لای باشوورتری ناوچەکەش، سەرچاوەیەکی «قزل - ئوزەن» بە «تاڵوانتوو» ناو دەبرێ (ن. پۆپ دەڵێ: «تەڵبەنگ توو» بووە بەواتای خاوەن دەشتایی).

لێرەدا، کارێکی بێسوود نییە ئەگەر سەرنج بدەینە نموونەی بەزۆر کورتکراوەی ناوێک کە واهەیە تورکی بێت: تەنیشتی لای راست و پڕئاوی جەغەتوو کە قەڵایەکی گرنگی «پارتی» تا ئێستاش بە سەریەوە وەستاوە، بە«ساروق» دەناسرێ بەڵام لە سەردەمی مەغۆلدا، زۆر جار وەک «سوقورلوق»یا «سوغورلوق» دیاردەی پێکراوە. بڕوانە: رشیدالدین، چاپی جۆن، G.M.S بەشی پێڕست.

### ب) کێو و بستوو

«قەرەج - دەبەن»[99] شوێنێکی باشووری «بانە»یە کە شێوە ئەسڵییە مەغۆلییەکەی خۆی وەک «دەبەن» بەواتای بستوو و« زینوو» پاراستوە. هەروەها لەم پێوەندییەدا، دەبێ دەستنیشانی بستوویەک بکەم کە هێندێک باشوورتر، کەوتوەتە نێوان «شارەزوور» و دۆڵی بچووکی «پیران» (لە مەریوان) و بە «چەغان» ناو دەبرێ کە بە مەغۆلی دەبێتە «سپی». بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، ل ٦٧.

ناوی زۆر شاخ و لووتکەی ناوچەکە بە«توو» کۆتایی پێ دێ[100]، وەک لووتکەی «چوغانتوو» - لەو شوێنەی وا چۆمی سابلاخ و لاجان لێک دادەبڕێن. بەشی کۆتایی وشەکە روونە؛ گەرچی لە وشەیەک زیاد کراوە کە تەنیا هەر لە زمانی تورکی دا نموونەی بۆ دەدۆزرێتەوە. «چۆغەن» (و هەروەها «چۆبگەن») بەواتای «پستە عەرزیلە» کە روەکێکە

ریشــەی وەکــوو ســابوون لەکــار دەکــرێ. بڕوانە: بوداگــۆڤ، ل ٤٩٥ و هەروەها «م.ا. ئەغەکەی» لە [قامووسی] تورکچە سویزلیک دا؛ ئانکارا، ١٩٥٥، ل ١٧٣.

«تەندوورلوو»، شاخێکە لە دۆڵی «ساروق» بەواتای «خاوەن تەندوور»یاخود «خاوەنی چاڵی بورکان». زنجیـر ەشاخی هەرە ناسراوی نێوان «میـانە» و «تەورێز» کـە ئێسـتا «قافلانکوهـ»ی پێ دەگوترێ، پێشتر ناوی «قەپلەنتوو» بوە، بەواتای خاوەن پڵـینگ. وەک ڕاپۆرتەکەی «دەروێش پاشا» ش (ل ٤٩) پەسندی دەکات تەنانەت ئێستاش گوندی «قـەپڵەنتـوو» (لە ڕۆژهەڵاتی «سـەقز»، فـەرهەنگی جـوغـرافـیـایی ئێـران، بەرگی ٥، ل ٣١٥) بیچمە ئەسڵییە مەغۆلییەکەی دەپارێزێ.

لووتکەی رووتاوەی لای باشووری ڕۆژهەڵاتی «سـابلاخ» (مەهابادی ئێستا)، ناوی «تەرەغە»[١٠١]ی بە سەرەوەیە کە بە زمانی مەغۆلی واتای «سەری بێ تووک» دەدا و ناوی کوڕی پێنجەمی «هەلاکۆ» ش بوە... هتد.

## پ. ناوچە و گوند[١٠٢]

لە بەشی ڕۆژهەڵاتی ناوچەکە، زۆر ناوی هەرێم و ئاوایی هەن کە هەڵگری ڕواڵەتێکی مەغۆلین، واتە تا ئەمڕۆش هەر ڕەنگی سەردەمی دەستەڵاتداریی مەغۆلیان پێوە دیارە یا خود ناوی هۆز و کەسایەتی خاوەن زەوی پێشووی خۆیان پاراستوە.

«بۆکان»[١٠٣]، کەوتۆتە نێوەڕاستەکانی ڕێگای «جەغەتوو»[١٠٤] و ئێستا وەک مەڵبەند و ناوەندێکی ئیداری ـ واتە «بەخش»[١٠٥] چاوی لێدەکرێ. ناوی بۆکان وێدەچێ کـوردی بێ (بووک + ان، بە واتای کۆی بووک)[١٠٦] گـەرچی بە گـوێرەی «ڕەشـیـدالدین»، چاپی بەرەزین، بەرگی٧، ل ٩٧، وشـەی بە «بـووکـان» حـونجـەکـراو، ناوی هەواڵبـەرێکی شازادەکانی مەرکیت بوە.

هەرێمی بۆکـان لە ڕابردوودا، بە«بێـهی» (بەهی؟) ناوبراوە، بەڵام ئێسـتـا ئەم ناوە تەنیـا بە سـەر «دێهـسـتـان» ێکەوە مـاوە[١٠٧]. گـوندێکیش بە ناوی «بیـهی ئاباد» لە «ئەختاچی» دا[١٠٨] ناسراوە (فەرهەنگی جوغرافیایی ئیران، ٤، ل ١٠١). نزهە القلوب، ل ٨٧، لە باسی «توومـان»ی «مـەراغـە» دا ناوی «بیـهـسـتـان» دەبا، بێ ئەوەی لە هیچ تایبەتییەکی بدوێ[١٠٩].

گـرنگـتـر ئەو شـتـانەیە وا «عـالەم ئارا» ل ٥٧٥، لەسـەر هۆزە (ئۆیماق) ـەکـانی





«بەئی»[١١٠] و«ئۆریاد»ی[١١١] نووسـیـوە کـە لـەناو «مـوکری»یەکـاندا دەژیان بەڵام لێـیـان جیـابوون و لە سـاڵی ١٦١٠دا، سـەرۆک هۆزەکـانیـان کـەوتنە بەر ئەو ئەتکەی وا بە موکرییەکان کرا و لەگەڵ ئەواندا قەتڵی عام کران.

تۆپۆنیمی ئێستای «بیهی» ئامێتەیەکە (لە تورکی و کوردی). ئەو «بەئی»یانەی وا لەگەڵ «ئوریاد»ـەکان دا یەکیان گرتبوو، کێ بوون؟ من تەنیا دەتوانم شارۆچکەی «بەئی» لە تورکستانی چین و لای بەری ڕۆژئاوای «کوچا»[١١٢] دەست نیشان بکەم.

لە نووسینی فارسیدا، زۆرجار پیتی /هـ/ لە جیاتی «سکوون»ی مەغۆلی دادەنرێ (سەحرای «کێئێر» دەبێتە «کێهێر»، بڕوانە: ڕەشید، بەرگی٧، ل ٣٣) و لەژێر شوێن تێکرانی ئەو «ی»یەی وا بە شوێنیدا دێ، /ئـ/ بە هاسانی دەتوانێ لە فارسیدا ببێ بە/ێ/. لە مەڵبەندی «بێهی» دا [ناوی گوندی] «قاتانقور» دەکەوێتە بەرچاو کە تەنیا دەتوانێ لەگەڵ «قـەتەنقیـر»ی مـەغـۆلی بەواتای لاواز و باریک بەراورد بکرێ. ناوێکی هاوچەشنیشی لە «چارئۆیماق» دا هەیە کە «قیتانقوو» بێ.

لە پێوەندی «بەئی» (بێهی) دا، کارێکی بەسوودە ئەگەر ناوی ناوچەی «ئوریاد» ببرێ لەسەر هێڵی نێوان «مەراغـە» و «میـانە» (کە ئێسـتا «چارئۆیماق»ی پێ دەگـوترێ - بەواتای چوار هۆز[١١٣] و کەوتۆتە بەخشی «قەرەئاغاج»ی سەر بە شاری مەراغەوە). ئەم ناوە سەیرە هیچ نییە جگە لە ئاڵوگۆڕکراوی «ئۆیرات» کە ناوی هۆزێکی خاوەن هێزە و لە مێژووی ئێران دا زۆر جار باسی لێوە کراوە. بڕوانە: ڕەشید، چاپی بەرەزین، ٧، ل ١٠٧. ئەمـیـرانی ئۆیرات بەشـدارییـەکی چالاکـانەی ئەو ئاژاوەیان کـرد کـە دوای لە ناوچوونی ئیلخـانەکـان نرایەوە. بڕوانە: حـافظ ابرو، چاپی ک. بەیانی، لل ١٤٨، ١٥٦، ١٦٠، ١٦٨.

«ظفـرنامـە» ش، ب ١، ل ٦٤٧، دەسـتنیـشـانی «شـیخ عـەلی ئۆیرات» دەکـات کـە حـاکمی «ئەردەبیل» بوە لە سـەردەمی حکوومەتی تەیموور دا، بەڵام لە دەسـتەڵاتداریەتی شاعەبباس دا دیومانە کە ناوەکە وەک «ئوریاد» حونجە کراوە. (لە وتاری «ڕاولینسن»، گۆڤاری «ئەنجومەنی شایانەی جوگرافیایی»[١١٤]، ژمارە ١٠، ساڵی ١٨٤٠، ل ٥٨ دا، بە هەڵە «ئۆریارد» هاتوە و پیتێکی «ر» یی ئینگلیسی لێ زیاد کراوە).

گوندی «ئوریادجیق» ئێسـتاش وەک بیـرهێنەرەوەی ناوە کۆنەکـەی، لە «چارئۆیماق»ی ئێسـتـادا مـاوەتەوە و زۆر نـاوی دیکەی ناوچەکـەش هەر بیـچـمی مـەغـۆلی یان هەیە:

چووکەت (چوکەتوی؟ بەواتای «بە بەردی بچووکەوە»)، مەکەتوو (مەکەتوی بە واتای «سەوەتە»).

گوندێک بەناوی ئوریاد لە بەشی رۆژهەڵاتی سنە (بەخشی قوروە) دا هەیە. بڕوانە: فەرهەنگی جوغرافیایی، ب ٥، ل ٢٩.

لە باکووری رۆژئاوای بۆکان و سەرچۆمی تەتەهوو، ناوچەی «ئەختاچی» (بەواتای «زاوا») هەڵکەوتوە کە ئێستاش هەر هەیە. ناوەکەی بی هیچ گومانێک پێوەندی بە «ئەسپی فەحل»ـەوە هەیە (بە تورکی «ییێلخی» پێ دەڵێن). زۆر گوندی ئەختاچی (کە ئێستا بە سەر دوو دێهستاندا دابەش کراوە)، ناوی مەغۆلییان بە سەرەوەیە.

ئەوەی زۆر شایانی باس بێ، ئەو گوندەیە کە ناوی «بورهان»ـە و تەواویش لە ناوێکی ئیسلامی دەچێ.

لە کاتێکدا رەنگە چاوەڕوانی ئەوە بین کە ناوەکە لە بنەڕەتدا «برهان الدین» بێ، بە سەرسوڕمانەوە، لە نەخشەی ئازەربایجانی «خانیکۆڤ» دا[115]، گوندەکە بە «بیرخان» ناوبراوە کە شێوە نووسینەکەی وە مەغۆلی دەچێ. «بورخان»[116] بەواتای «بوت»یا «پەیکەری بوودا» (بڕوانە، رشیدالدین، چاپی جان، پراگ، ل ٦٧): «شەکموونی بورخان»[117] بەواتای «پەیکەری بوودا»[118]؟.

هەبوونی گوندێک لە باشووری رضائیە (ورمێ) بە ناوێکی نزیک بەو ناوەوە، واتە «قوتلووی بورهانلوو» بۆچوونی ئێمە دەسەلمێنێ. لێرەدا «قوتلوو»، بەواتای پیرۆز و موبارەک، دەگەڕێتەوە بۆ پیاوچاک (قیددیس) ێک[119].

«سونجاق»[120]، ناوێکی مغولییە (بڕوانە، رشیدالدین، ب٧، ل٢٣١) بۆ ئەمیرێکی سوڵدووز کە لەگەڵ «هولاکۆخان» دا هاتە ئێران.

«تبت» (لە فەرهەنگی جوغرافیایی دا بە هەڵە «تەبەت» نووسراوە)[121]، دیاردە بە بوونی هێندێک «تەبەتی» دەکا لەوێ و «ئاخ ـ تەتەر» لە (لە فەرهەنگی جوغرافیایی دا نییە)[122]، قۆڵ بۆ «تەتەرەسپی یەکان» رادەکێشێ[123]. ناچیت بەواتای (باز)[124]، تەنیا بیچمێکی دیکەی «ناچید»ـە کە لە «چارئۆیماق»ی مەراغە دا دەبینرێ.

ناوی هەرێمی دراوسێ، واتە «قەرەلەر» (ئێستا سەر بە «مەراغە»یە)، سەرەڕای ناوە تورکییەکەی، بەکارهێنانی زاراوەی مەغۆلی «خەرە / قەرە» دەگەیێنێ کە واتای «وەرزێر و کرێکار»ی هەیە[125].



دوورگەی نێوان جەغەتوو و تەتەهوو، میاندواوی[126] پێ دەگوترێ (بەواتای «نێوان دوو ڕووبار») و لەناو گوندەکانی دەوروبەری دا، ئاواییەک بەناوی «چەلیک» هەڵکەوتوە (کە هاوناوەکەی لە «ئەردەبیل»یش هەیە). ئەم وشەیە لە تورکی دا واتای یارییەک دەدا (هەلووکێن) [لە موکریان لەکاتی گەمەی «هەلووکێن» دا، زاراوەی «دەچەلی؟» بەکار دەهێنرێ. وەرگێڕ]، بەڵام ئەگەر نامۆبوونی ئەم چەشنە ناوە [لە ناوچەکە دا] بخرێتە بەرچاو، رەنگە بتوانرێ بیر لە دەست تێوەردراویی وشەی «چەریک» بکرێتەوە کە زاراوەیەکی مەغۆلییە (تسریک) بۆ (چریک) و هەروەها بۆ ئەرکی «کۆکردنەوەی باج». بڕوانە رشیدالدین، لە زۆر شوێندا.

لە رۆژهەڵاتی بۆکان و لێواری راستی جەغەتوو، ناوچەی «سائین قەڵا» هەڵکەوتوە (ئێستا ناوی تازەی «شاهین دژ»ی لەسەرە و سەر بە مەراغەیە[127]). لە زمانی مەغۆلی دا، «سەئین»[128] مانای «باش/ خاس» دەدات. شوێنێکی دیکەش هەر بەو ناوە لە نیوەڕێی ئەبهەر و زەنجان هەیە و گوندێکیش بە ناوی سائین کەوتۆتە باشووری ئەردەبیل. هەروەها بستوویەک لە نێوان ئەردەبیل و سەراب ناوی «سائین گەدیک»ـە کە لە تورکیدا بە مانای «بستوو/ زینوو»ـە.

گوندێکی شاهین دژ ناوی «ئاجەری»یە. «راوڵینسن» (گۆڤاری ئەنجومەنی شایانەی جوگرافیایی، ژمارە١٠، ساڵی ١٨٤٠، ل ٤٠) ناوەکەی وەک «ئاجاری» بیستوە بەڵام نووسینیی لە فەرهەنگی جوگرافیایی ئێراندا (ب٤ ،ل ٥) «ئاجوری»یە کە شێوە دەربڕینێکی خەڵک خوازانەیە[129] بە مەبەستی بەستنەوەی شتەکە بە فارسیەوە. ئاجور[لە فارسیدا] واتای خشتی سوور دەدا.

ناوە ڕاستەقینەکە، لە کورتکراوەی وشەی ئەسڵی «ئاغاج – ئەری» دەچێ بە واتای «پیاوی دارستان» کە ناوی تایفەیەک بوە لە هۆزی «ئۆغوز». بە ٠گوێرەی رشیدالدین (٧، ل ٢٥) «ئەری» بەشێک لە فۆرماسیۆنی ئەوی دوایی [ئۆغوز] بوە و ناوەکەی نوێنەری مەفهوومی مەغۆلی «هۆیین ـ ئیرگەن»[130]، بە مانای «خەڵکی دارستان»ە. «ئاغاج ئەری»یەکان دەبێ پێش مەغۆل هاتبن [بۆ ناوچەکە]. ابن الاثیر، ب ٩، ل ١٧٤ ئاماژە بۆ «ابوالمظفر ئەنوش تەگین ـ ئەل ئاغاجەری» دەکا کە لە ساڵی ٤٠٥/١٠١٤ دا هاوڕێ لەگەڵ ئەمیرزادەی کورد «هیلال کوڕی بەدر» دەست بەسەر کرا، ئەمەش نیشانەیەکی بایەخدارە بۆ دەستەڵاتداری و هەروەها بڵاوبونەوەی زۆر زووی «ئاغاج – ئەری»یەکان.

دانەری «نزهت القلوب» (ساڵی ١٣٤٠ز)، ل ٨١، هێندێک بە گومانەوە دەڵێ: ئەوان پێشتر بە حاکمان (ی «خەڵخاڵ» لە باشووری «ئەردەبیل») یان دەگوت «ئاغاجاری» (حکامش را آغاجریان می گفتند).

ناوەکە، هەروەها لە ناوچەی چاڵە نەوتەکانی باشووری ئێرانیشدا ناسراوە. لەو ناوچەیەش، باش لە شتەکە نەگەیشتوون و بە شێوەی رەسمی وەک «ئاغا - جاری» لە جیاتی «ئاغاج ـ ئەری» نووسیویانە. بڕوانە: فەرهەنگی جوغرافیایی ئێران، ب ٨، ل ١٨، وشەی «آغاجاری».

لە نزیک بۆکان و بەری رۆژئاوا (ی نیوەی رێی تەتەهوو) دێهستانی«تورجان» [131] هەڵکەوتوە کە ناوەکەی لە ئێرانی دەچێ و دانیشتوانی هەموو کوردن بەڵام تۆپۆنیمییەکەی تێکەڵاوی تورکی بوە. ناوی دوو گوند [ی ئەو دێهستانە] سەرنجڕاکێشن:

یەکەم «هەبەکی» کە بۆی هەیە لە وشەی مەغۆلی «هەباکی» گیرابێ بە واتای «جاڵجاڵۆکە» و دووهەم «شیلان ئاباد» [132]. عونسوری شیلان بێگومان دەگەڕێتەوە بۆ رۆژانی رۆژووگرتنی گشتی و دابەشکرانی شۆرباو. بڕوانە: «مقدمە الادب»، ل٣٣٣ و هەروەها «سلسلە النسب صفویە»، بەرگی ٣.

ئەو ناوچەیەی وا کەوتۆتە نیوەڕێی چۆمی سابڵاخ، بە شێوەی رەسمی «ئێل تەیموور»ی پێ دەگوترێ ( ف ج، ب٤، ل٦٦) و لە تەلەفوزی کوردیدا «ییەڵ تەمر»ـە [133]. پیتی /ی/ تەنێ زیادکراوەیەکی کوردییە بەر لە ڤاویلێکی سەرەتای وشە، بۆ وێنە لە ییەختەچی دا [133]. «ئیل تەیموور» وەک کەسایەتییەکی «جەلایری» ناسراوە. بڕوانە: رشیدالدین، چاپی بەرەزین، ب٧، ل١٣.

گوندێکی ئەو ناوچەیە (کە فەرهەنگی جوغرافیایی دەستنیشانی ناکات)، ناوی «توختا» [134] بوە (دوور نییە «توختۆغا [135] بووبێ) کە ناوێکی گشتییە لەنێو مەغۆلاندا. بڕوانە ناوی «بەیاوت» [136] لە رشیدالدین دا، ب٧، ل ٣٦، کە حاکمی «مەرکیت» بوە و هەروەها لاپەڕەی ٩٢ («تۆقتا») [137] و... هتد.

لە خوارووی چۆمەکەدا، ناوەندی ئیداری «سابڵاخ» هەڵکەوتوە کە ئێستا بۆتە مەهاباد («مەهـ» دەلالەتی ماد دەکات). لە خوارووی ئەویش دا دەشتاییەک بۆ لای دەریاچەی ورمێ دەکشێ کە ناوچەی شارویران پێکدێنێ (بڕوانە خوارەوەتر لە بەشی «پاشکۆی دووهەم» دا) و«شیلان ئاباد» یێکی [138] دیکەی لێیە (بڕوانە سەرەوەتر، لە باسی تورجان دا).



لە شێوە ئاخافتنی تورکی تازەدا، ناوی گوندی «ئیندرکاش» هێندێک جار وەک «ئاگری - قاش» دەبیسترێ بە واتای «برۆی خوار»یاخود «هوندر- قاش» بەواتای برۆی بەرز. وشەی «هوندر»ی مەغۆلی لە تورکی ئازەربایجانیش دا کەڵکی لێ وەردەگیرێ، بەڵام ڕیشەی ئەو دوو وشەیە خەڵکخوازانەیە و دەگەڕێنەوە بۆ ناوێکی کۆنی نەزانراو [139].

ناوچەی «سوڵدووز» سووچی رۆژئاوای دەریاچەی ورمێی داگرتوە کە هەڵگری ناوی هۆزی مەغۆلی «سوڵدووز»ـە. بڕوانە رشیدالدین چاپی بەرەزین، ب٧، ل ٢٤٤. ئەمیرانی سوڵدووز لە سەردەمی دوایین ئیلخانەکان دا، دەورێکی گرنگیان گێڕا و تەنانەت بوون بە جێگری دواکەسیان (زنجیرەی «چۆپانییەکان»).

ناوچەی سوڵدووز کە دەبێ لە سەردەمی حاکمانی موکری، کوردی تێدا نیشتەجێ بووبن، ئێستا تەنیا لە «قەرەپاپاخ»ـە کۆچەرەکان پێکهاتوە کە دوای ساڵی ١٨٢٨ لە بەشی «ئەوپەڕی قەوقاز»ـەوە هاتوونەتە ئەوێ [140].

وەک لە سیاییەکانی ئێمە دەردەکەوێ، ناوی مەغۆلی لە تۆپۆنیمی ناوچەکەدا دەتوانێ بەهۆی پاشگری «توو»یاخود لەرێگای بەراوردکردنیان لەگەڵ ناوی کەس دا روون بێتەوە. سەبارەت بە بەشی یەکەم، نموونەی باشی باسەکە، «کەرەفتوو»ـە کە هەرێمێکی بچووکی دۆڵی «ساروق» بێ (بڕوانە سەرەوەتر) و لێرە دا بوو کە سیر ر. پۆرتر [141] ئەشکەوتێکی بە بەردەنووسی یۆنانییەوە دۆزییەوە. بڕوانە: سیر ئـ . ستەین(جادەکۆنەکان ، ل ٣٢٤ تا ٣٤٦) [142].

بە هۆی راپۆرتێکەوە رووناکی خراوەتە سەر ئەم ناوە کە سەبارەت بەو لەشکرەیە وا «تەیموور» لە سەربازگەی خۆی لە «ئاق - سەی» (بە فارسی «سفیدرود») ەوە ناردی بۆ «ساریق ـ قۆرغان» [143] و «کردتو» (بڕوانە: ظفرنامە، بەرگی ١، ل ٦٢٨). من دڵنیام کە ئەو ناوەی دواتریان، دەبێ وەک «کروتو» بنووسرێتەوە (بڕوانە: ن. پۆپ، «کەرەئۆیتوو» بە واتای هەبوونی دارستان لە شانی باکوورەوە). بوونی ناوی «کەرەفتیسکایا» [144] - بە کۆتاییە رووسییەکەیەوە، لە کانگای ئاڵتوونی «ئەوپەڕی بایکاڵ» (ناوچەی «بەرگوزین») پشتیوانی لە مەغۆلی بوونی کاراکتێری ناوەکە دەکات.

زۆر باشوورتر لە ناوچەی موکریان، واتە سەر رێگای سەقز بۆ سنە، هەرێمێکە بە ناوی «هۆبەتوو» [145] (ئێستا بە رەسمی «ئوباتو» ف.ج. ٥، ٢٦) بە مانای «خاوەن ئۆبۆ/ ئۆبە» (بۆ نموونە «ستوونێکی یادگار یا بەردێکی سەرگۆڕ») بڕوانە رشیدالدین، چاپی جۆن،(G.

M. S,pp. 47 - 53): «برای نشان میلی ساختند که مغولان آنرا «اوبا» گویند». دەنگی زیادکراوی «هـ» لە پێش «ئوبا» شتێکی ئاساییە بۆ زمانی مەغۆلی کۆن[١٤٦].

لە باسی ئەو ئاواییانەدا کە بە نێوی ئاوەدانکەرەوە و خاوەنانی پێشوویانەوە کراون، دەتوانین چەند نموونەیەک لەو مەڵبەندانە بێنینەوە کە دراوسێی ناوچەی موکریانن: لە دۆڵی تەنیشت چۆمی سەقز (کە دەڕژێتە ناو جەغەتوو)، گوندی گەورەی «مەرخوز» هەڵکەوتوە کە بە رواڵەت بە نێوی هێندێک تاقمی مەسیحی مەغۆل یا «ئۆیغور»[١٤٧] و «مەرکوس»[١٤٨] کراوە. بەراوردی بکە لەگەڵ ناوی باپیرەگەورەی «کەرەیت»[١٤٩] کە «مەرغووز بویوروق – خان»یان پێگوتوە[١٥٠]. بڕوانە: رشیدالدین، ٧، ١٢٣.

لە دۆڵی «میرەدێ» (ی سەر ڕێگای سەقز ـ بانە)، ئاوایی گەلی «تەمۆغە» و «قەرەچەر» هەڵکەوتوون. «تەمووقە»[١٥١]، ناوی شارێکی هۆزی «بارین»[١٥٢] بوە لە سەردەمی چەنگیزخان دا (رشیدالدین، ٧، ٢٦٤).

قەرەچەر (ف. ج. ٥، ٣٢١) یش وێدەچێ مەغۆلی بێ (و ڕەنگە مانای ڕەشتاڵە و سەوزە بدا). بەراوردی بکە لەگەڵ ناوی «تۆقوچەر»[١٥٣] (مێژووی شاراوە [ی مغول]، ٢٨٠) و هەروەها لەگەڵ «توغاچار»[١٥٤] (رشیدالدین، چاپی جۆن، پراگ، ٩) و.... هتد. لەمەڕ پاشگری «چەر» بڕوانە: Pelliot, La horde d'or, 52 .

قەرەچەر ناوی یەکێک بوە لە باپیرانی تەیموورییەکان. شوێنێکیش بە ناوی «کەرەچەرۆڤ»[١٥٥] لە چیرۆکە پاڵەوانییەکانی ڕووسی (بیلینا)[١٥٦] دا هاتوە.

بۆ کۆتایی هێنان بەم ژمارە کردنانەم، دەبێ ناوی گوندی «کۆندەلان»ی سەقز بێنم (ف. ج. ٥، ٣٨٣). ئەم ناوە زۆر جار لە مێژووی مەغۆل دا هاتوە (هەرچەند ڕەنگە خۆی لە بنەڕەتێکی مەغۆلییەوە نەهاتبێ) و واتای ڕەشماڵی گەورە و خێوەتی سەحرایی دەدات بەڵام بە گشتی بۆ خێوەتی شایانە بەکار دەبرێ. بڕوانە نامەی «ئەرغون خان»[١٥٧] بۆ «ڕۆی دو فڕانس» (ئیراد بارانس)[١٥٨] کە دەڵێ: «لە کۆندەلان نووسراوە».

«و. کۆتویز»[١٥٩] (Rocznik Orientalistyczoy, XVI, 1950, 376) ئەم «کۆندەلان»ـە بە ناوی شوێن دەزانی. ناوچەیەک لە بەشی باکووری چۆمی «ئاراس» – باشووری ڕۆژئاوای «شووشا» (ئەوپەڕی قەوقاز) – ناوی «کۆندەلان سوو»ی لە سەرە و «کەهدەلان» (ف. ج. ٤، ٤٣٦) ی نزیک «سەراب»یش دور نییە ئاڵوگۆڕکراوی هەمان وشە بێ.





**ت: هۆز و خێڵ**

پێشتر دیتمان کە ناوی دوو هۆزی ناسراوی مغول «سولدووز» و«ئۆیرات» هۆی دانرانی ناون لە سەر ناوچەی سولدووز[١٦٠] و ئۆیرات (کە ئێستا ناوی «چارئۆیماق»ی لێ نراوە).

زۆر دوور لە چاوەڕوانی ئێمە، ناوی هۆزی مەزنی «موکری»یە [١٦١]. وا دیارە کەس لە وێچوونی بە رواڵەتی ئەم ناوە و وشەی «مووکری»[١٦٢] ورد نەبووبێتەوە کە «تیئۆفیلاکت»[١٦٣] وەک هاوسێی «تەویات»[١٦٤] (تەبغەج» لە باکووری چین) لە دەوروبەری ئەو سەردەمەدا کە ئیمپراتۆر «موریشس»[١٦٥] لەشکری دەنارده لێوارەکانی دەریاچەی ورمێ، دیاردەی پێدەکا.

هەرچۆنێک بێ، «تیئۆفیلاکت» دەتوانێ ڕێنوێنێکی مەترسی دار بێ: «موکری»یەکەی ئەو ڕەنگە خەڵکێک بن کە چینییەکان «مو ـ کی» (وو ـ کی؟)[١٦٦] و دواتریش «مۆ – هۆ»[١٦٧] یان پێدەگوتن یان ئەوانەی وا لە باکووری «کۆریا» دەژیان و «شاوانیس» بە ناوی نەتەوەی «تونگوز»ـەوە؟[١٦٨] دەیانناسێنێ[١٦٩].

«هەوسیگ» [١٧٠] لە سەرچاوەی باسکراو، ل٣٤٠ دا ئەو ناوەی «تیئۆفیلاکت» هێناویەتی لە شێوەی «مورکیت/ مەرکیت»[١٧١] دا دەنووسێ و ئەوەش دەسەلمێنێ کە ڕەنگە ئەو هۆزە بە هۆی «مەرکیت»ی سەرچاوە مەغۆلییەکانەوە بناسرێتەوە[١٧٢].

من ئەو لێهاتووییەم نییە لەم پرسیارە بدوێم بەڵام دەبینم کە «برێتشنایدر»[١٧٣] «مو ـ کئو ـ لی»[١٧٤] لە هۆزێکی دیکە بە ناوی «مەکرین»[١٧٥] جیاواز دەکاتەوە. حونجەی وشەی «مەکرین» زۆر جێی دڵنیایی نییە). ڕاستە کە بە گوێرەی قسەی رشیدالدین، ٧، ٩٠، «م. رکیت» لەسەردەمێکدا «م. کریت»[١٧٦] ی پێگوتراوە، بەڵام زۆر جیاواز لەم دوانە، «ب. کرین»ـە کە پێ یان دەگوت «م. کرین»[١٧٧] (رشیدالدین، ٧، ١٦٦)[١٧٨] و ئەوان «نە مەغۆل بوون نە ئۆیغور»[١٧٩] بەڵام لە چیا ئەستەمەکانی «ئۆیغورستان» دا دەژیان[١٨٠] و ناوی تازەی «قەیەچی» واتە «شاخەوان»یان پێدرابوو.

لەو سەرشێواوییە گەورەیەدا، کە لەمەڕ هاوناو بوونی ئەو دوو هۆزە هاتۆتە پێشێ، نازناوی تایبەت و پڕبەپێستی «قەیەچی»یەکجار سوودبەخش دەنوێنێ. چەنگیز «مەرکیت»ی لەناو برد. مێژووی شاراوەی مەغۆل، بەشی ١٩٧ و ١٩٨ و هەروەها رشیدالدین، ئاماژەیان بە هیچ «مەرکیت» ێک لە ڕۆژئاوا نەکردوە[١٨١] لە کاتێکدا ئەمیان

پەسندی ئەوە دەکا کە تاقمێک (تایفەیەک) لە «بکرین» هاورێیی هولاکۆیان کرد و لەم شانشینە، (واتە لە ئێران) دا بە «قەیەچی» (شاخەوان) و کوهرەو ناسرابوون. ئێمە لە کتێبی«ژیانی قەشەی نستووری یەبەلاهای سێهەم لە سووریا» (١٣١٧ ـ ١٢٨١) دا برگەیەکی یەکجار ڕوون بۆ باسی «قەیەچی» دەبینینەوە[١٨٢].

بە گوێرەی ئەم سەرچاوەیە، نزیک بە ساڵی ١٢٩٧، سەربازە مەسیحییەکانی سەربازخانەی «ئەربیلە» (هەولێر) عاید بە هۆزی شاخەوانی «قەیەچی»، موسوڵمانێکی خاوەن شکۆیان کوشت. مەغۆلی فیرقەی نۆی موسوڵمانی«نەورووز»[١٨٣] و هێندێک کورد و عەرەب، ئابلۆقەی قەڵاکەیان دا. شەڕ هێدی بووەوە بەڵام لەساڵی ١٣١٠دا، سەرلەنوێ پەرەی سەند و ئەویش کاتێک بوو کە «قەیەچی»یەکان لە دژی ئەمیری خۆیان ـ ئەمیر زەینەدین بالوو ـ ئەو ئەمیرەی کە ئەرکی دابەش کردنی مواجبی سێ هەزار کەسی لەسەرشان بوو سکالاّیان هێنایە بارەگا.

ئیلخان ئەمیری دەستبەسەر کرد و ئینجا موسوڵمان و کوردەکان «ئەربیلە» [هەولێر؟] یان گەمارۆ دا و داوایان لە مەسیحی و قەیەچییەکان کرد لە قەڵا بێنە خوارەوە. «ئەمیرچۆپان»ی خاوەن دەستەڵات کە لەوە دەچوو پشتیوانی زەینەدین بێ، قەیەچییەکانی (ل ١٦٧) گرتە بن باڵی خۆی بەڵام موسڵمانەکان گوێیان بەوە نەبزوت و لەئەمری دەرچوون.

مەسیحی و قەیەچییەکان کە بڕوایان بە بەڵێنییەکانیان کردبوو هاتنە خوارەوە و قەتڵی عام کران وئەو قەیەچییانەش کە لەناو قەڵاکەدا مابوونەوە لەسەر دیواری شارەوە فڕێدرانە خوارەوە. لەم چیرۆکە دا، هاودەستی مەسیحییەکانی ناوچە لەگەڵ قەیەچییەکان بەتەواوی ئاشکرایە.

نوختەیەک لەم باسەدا بۆ ئامانجەکەی ئێمە گرنگە و ئەویش ئەوەیەکە قەیەچی و بۆ نموونە «بکرین/ مکرین»لە هەولێر خاوەنی دەستەڵاتێکی زۆر بوون و ڕووداوی دڵتەزێنی ساڵی ١٣١٠ بەتەواوی نەبوە هۆی لەبەریەک چوونی هۆزەکە، چون تەنانەت تەیموور لە کاتی لەشکرکێشانی ساڵی ٨٠٣ / ١٤٠٣ دا بۆ سەر گورجستان کەڵکی لە کارزانی «مکریت»ەکان وەرگرت[١٨٤].

دانەری شەرەفنامە (بەرگی ١، ل ٢٩٦ ـ ٢٨٨) دەڵێ: «بنەچەکی حاکمانی موکری (حکام مکری) ناوچەی باشووری دەریاچەی ورمێ، دەگەڕێتەوە بۆ هۆزی موکری کە لە شارەزوور دامەزرا و هێندێک دەڵێن لقێکی «میرانی بابان» ن.



ئەو کەسەی وا شەرەفخان بە یەکەمین ئەمیری موکری ناوی دەبا «سەیفەدین»ـە کە ژمارەیەکی زۆری هۆزی بابان و عەشایری دیکەی کوردستانی لە خۆی کۆ کردەوە و لە سەردەمی حوکمی تورکمانەکان دا(نیوەی دووهەمی سەدەی پازدەهەم) «دریاسی گرت و لەوێوە دەستەڵاتی بەرەو ناوچەکانی «دۆڵ باریک»، «ئەختاچی»، «ئێڵ تەموور» و «سولدووز» پەرەپێدا.

ئێمە دەزانین کە کوردی «هەزبانی» و «زەرزاری» (ئێستا زەرزا)[١٨٥] و هتد...، بۆ ماوەی چەند سەدە لەناوچەکەدا ژیابوون[١٨٦]. کۆچی سەیفەدین بەواتای ئەوە نییە کە ناوچەکە بەکۆڵۆنی کرابێ، بەڵکوو هەنگاوێکە بۆ یەکخستنی دانیشتوانی ئەو مەڵبەندە لە ژێر سەرکردایەتی تاقمێکی چەکداری نوێ دا.

ئەم چەشنە گۆڕانکارییەی ناو ڕێکخراوەی عەشیرەتەکان، لە مێژووی کورد دا زۆر جار رووی داوە. سەرۆکەکانی موکری و دەست و پێوەندەکانیان تەنیا قورسایی «عەشیرەت»ێکی نوێ یان لەسەرشانی وەرزێڕ (رەعیەت، گۆران) ـەکان و لق و پۆپی هۆزە بچووک و لاوازترەکان زیاتر دەکرد. لە ڕاستیدا، پێش ئەو سەردەمە، هیچ ئیشارەتێک بە هۆزی موکری لە ناوچەی گۆلی ورمێ نەکراوە و ئینسیکلۆپێدیای مصر «مسالک الابصار» (کە پێش ساڵی ١٣٥٠ نووسراوە) لەناو لیستەی هۆزە کوردەکان دا، ناوی موکری هەڵدەبوێری[١٨٧].

سەردەمی نێوان کوشتاری قەیەچییەکان لە هەولێر(١٣١٠) و نیوەی دووهەمی سەدەی پازدە، چی تێدا نییە و ماتریاڵی بەردەستیش، هیچ ئیشارەیەک بە شەرح و بەیانی ناوچەی موکری ناکەن جگە لەو بۆچوونەی کە دەڵێ سەرکردە تازەکان، نوێنەرانی تەواو بەکورد کراوی «شاخەوانە» پێشوەکانی هۆزی بکرین و مکرین و مکریت[١٨٨] بوون کە لە هەولێر لەناو کوردەکان دا نێشتەجێ بووبوون[١٨٩].

ناوی هۆزێکی دیکە کە سەرنجمان ڕادەکێشێ، «دێبوکری»یە. ئەم تاقمە عەشیرەیە لە شەرەفنامە دا ناوی نەهاتوە، بەڵام «راولینسن» (لە سەرچاوەی ناوبراو، ل ٣٤دا) ناوی «دێبوکری» لە ژێر ناوی «موکری» دا دێنێ و دەڵێ ئەمانە [واتە دێبوکری] دەستەڵاتی دارایی و ماڵییان بە سەر هۆزەکە [واتە موکری] دا هەیە. ئوسکارمان[١٩٠] دێبوکری وەک دانیشتوانی سەرەکی ناوچەی سابلاخ ناو دەبا کە لە لایەن «موکری»یەکانەوە بندەست کراون. رەنگە ئەم بۆچوونە زۆر لەشوێنی خۆیدا نەبێ، چونکە «دێبوکری» ش لە ئاغاوەتی

دەوڵەمەند و ڕەعیەت پێکهاتوە و بۆچوونەکەی «مان» تەنیا چینی سەربەخۆی دووهەم دەگرێتەبەر. بەڕواڵەت دەبێ دێبوکری لە گوندی «دێبوکر»[191] ەوە هاتبێ کە ١١ کیلۆمیتریک کەوتۆتە شانی باشووری سابلاخ (دیهـ ـ ی بوکر، وەک چۆن «دیگورجی» لە شنۆ «دیهـ ـ ی گورجی»یە).

عونسوری سەخڵەتی ناوەکە «بوکر» ە. لە ساڵی ١٩١٤ دا، بنەماڵەی دێبوکری پەسندی ئەوەیان کرد کە باپیرە گەورەی چوار جیل پێشەوەتریان «بەیرەم ئاغا» لە دیاربەکرەوە هاتوە.

گۆڕانی «بەکر»ی عەرەبی بۆ «بوکر»، زۆروێچوو نییە[192] ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە ناوی بابەکر (ابوبکر) ناوێکی گشتی یە لە ناو کوردان دا. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییە کە هۆزی «مکرین»، «بکری»یشیان پێدەگوترێ، ڕەنگە بتوانرێ عونسوری «بوکر» وەک شێوەیەکی جیاوازی «موکری» بناسرێ، بەڵام بۆچوونێکی وا، هێندێک سەخڵەتی لە ناوی گوند (ی دێبوکر) و هێندێکیش جیاوازی لە ڤاویلی/ۆ/ و/وو/ دا پێکدێنێ.

هۆزێکی گرنگی دیکەی کورد، کە دانیشتووی بەشی ڕۆژئاوای ناوچەکە و سەر لێواری باشووری گادەر و سەرچاوەکانی زێێن، هۆزی «بلْباس» ە. بە وتەی شەرەفخان، بەرگی١، ل ٣٥٨، کۆنفیدراسیۆنی «ڕۆژەکی» (لە بدلیس)، خۆی لە دوو لق پێکهاتبوو: «بلْباسی» و «قەوالیسی»[193] کە سەر بە ناوچەی «هەکاری»یە (لەسەر زێی بچووک). لە ڕاستیدا، ناوی قەوالیسی وێدەچێ لە ناوچەی «بۆتان» ناسراوبێ. هەکاری و بۆتان هەردووکیان کەوتوونەتە شوێنێکی دوور لە گۆلی ورمێ. شەرەفخان لە بۆچوونی خۆی زۆر دڵنیا نەبوە و باسی نەریتێکی دیکە دەکا کە بەگوێرەی ئەو، بدلیسی و قەوالیسی (ڕەنگە لە قۆناخێکی دواتر دا)، سەر بە «فیدراسیۆنی بابان» (ی شارەزوور) بوون و دەگوترێ کە بنەچەکی موکری لەوێوە سەری هەڵداوە. لە ڕۆژگاری ئێمە دا، بلْباس لە لاشانی زنجیرە شاخی «قەندیل» دەژین و بنەچەکی بنەماڵەکانیان (ئوجاق) لە ڕابردوو دا، زستانی لە «مێزۆپوتامیا» و هاوینی لە («بەرزاییەکان») ی بەشی ڕۆژهەڵاتی زنجیرەی قەندیل دەبردەسەر. ناتوانین لەمەڕ بنەڕەتی ناوەکە واتە ئەو وشەیەی کە لە ناو هۆزە مەغۆلی و تورکەکانیشدا نەناسراو ماوەتەوە[194] هیچ چەشنە بۆچوونێکی دەربڕین.

تیرەیەکی[195] فیدراسیۆنی بلْباس کە ئێستا بەتەواوی لە مەڵبەندی موکریدا نیشتەجێ



بوون، ناویان «مەنگوڕ» ە. پسپۆڕی مەغۆلناس ـ پرۆفیسۆری خودا لێخۆشبوو «و. کۆتویز» جارێکیان بۆی نووسیم (٣١ مارسی ١٩٣٥) کە ئەو ناوە دەیخاتە بیری «مەنگیت[196]». ڕشیدالدینیش ب٧، ل ٢٥٣، ناوەکە وەک «مەنگقووت[197]» دەنووسێ و ناوی ئەو ئەمیرانەیان دەبا کە لە ئێراندا خزمەتیان کردوە. گوندێکی ناوچەی سەراب (ف.ج، ٤، ل ١٨٣) «مەنقوتای»[198]، بەڕواڵەت ڕەنگدانەوەی ناوی ئەمیر «مەنگقودەی»[199] (باوکی «قوتلۆغ ـ شا»، شاهی بەنێوبانگە)، بڕوانە ڕشیدالدین، ٧، ٢٥٤. لە ئاکامدا، ئەو بۆچوونە نابێ وەلابنرێ کە بنەڕەتی «مەنگوڕ» ڕەنگە هاوتا لەگەڵ «موکری» بێ، هەر چەند مەنگوڕ وەک تاک، بە کۆی مەغۆلی «مەنگقووت» وە نەبەستراوەتەوە.[200]

ناوی هۆزێکی دیکەی ئەو مەڵبەندە، «گەورک» (لە ڕۆژهەڵاتی بەستێنی کەلوێ) و «سوێسنی»[201] لە بەستێنی لای ڕاستی، لە کوردی دەچن. سوێسنی کە ناوەکەی بە شێوەیەکی ئاسایی نوێنەرایەتی «سۆسنی»یێکی کۆن دەکا، وا وێدەچی کە هی توێژێکی نیشتەجێ بووی سەردەمی زووی دانیشتوانی کورد بێ. ناوی باپیرانیان: بەریاجی، مەڵکاری، و ئالان، لە ئێرانی دەچێ. ئەوی دواتریان، کە بە شێوەیەکی بەرچاو هاوناوی ئالان (ئۆسیت) ەکانی قەوقازە، لە هەموویان سەرنجڕاکێش ترە. ئێمە دەزانین کە ئالانەکان چەندەها جار نفووزیان کردە ناو «پارتیا» و «ماد» (بڕوانە پێشتر، [بەشی٣ ـ چارەنووسە مێژووییەکان] پەراوێزی ژمارە ٣١).





## پاشكۆی یەكەم

### لیستەی زیادكراوی ئەو شوێنانەی وا ناوی مەغۆلییان لەسەرە

لە نێوان شەش تا حەوت هەزار ناو كە لەژێر عینوانی ئازەربایجان، لە فەرهەنگی جوغرافیایی ئێراندا هاتوون، من هەڵبژاردەی هێندێک ناوم (جگە لەوانەی پێشوو) پێكهیناوە و لێرەدا بە ڕێچكەی ئەلف و بێی عەرەبی دەیان نووسم. جیا لە ناوچەی موكری (باشوور) كە پێشتر باسی لێوە كراوە، من ئازەربایجانم بەسەر ئەم مەڵبەندانەدا، دابەش كردوە:

١) ڕۆژهەڵات: ئەردەبیل، سەراب، خەڵخاڵ، موغان

٢) ناوەندی: تەورێز، میانە، قەرەچەداغ

٣) باكووری ڕۆژئاوا: خۆی ، ماكۆ

٤) باشووری ڕۆژهەڵات: مەراغە

٥) ڕۆژئاوا: ورمێ، كە ئێستا رضائیەیە [دوای ساڵی ١٩٨٠ سەرلەنوێ بۆتەوە «ورمێ». وەرگێڕ].

بە شوێن ناوی گوند یا ناوچە دا، ناوی ژمارەیەک مەڵبەند دێنم. بۆ دۆزینەوەی وشەی بەرانبەر بە ناوە كەمترعادەتییە مەغۆلییەكان، چاوم لە پرۆفیسۆر ن. پۆپ كردوە. جیا لە سێزدە مەڵبەندی باشووری ڕۆژهەڵات (موكری)، ئەو لیستەیە پەنجا نێوی گرتۆتە بەرخۆی، یازدەیان لە ناوچەی یەكەم، شازدەیان لە ناوچەی دووهەم، هەشتیان لە ناوچەی سێهەم، دوازدەیان لە ناوچەی چوارەم و سێ یان لە ناوچەی پێنجەمن:

١) ئاچاچی ‹١› بە واتای بارەبەر؛ ٢) ئەربەتان ‹٢› = سەرۆكی دەكەس[٢٠٢]؛ ٣) ئوراتلوو ‹٢› = سنعاتكار (ئورات)؛ ٤) ئەرقوون ‹٤› = ئەرغوون؛ ناوی شەخس ٥) ئەركەوین ‹٣› = مەسیحییەكان (ئركەئوین)؛ ٦) ئۆرگۆتین ‹٢› = شوێنی هوردووی سەرۆک (ئورگوتەن)؛ ٧) ئەڵپاڤووت ‹٢› = چینی خاوەن ماف و دەستەڵات؛ ٨) ئالقوو ‹٤› = ناوی شەخس (ئاڵغوو)[٢٠٣]؛ ٩) ئۆنەر ‹٤› = ناوی شەخس؛ ١٠) ئۆلامچی ‹٤› = ئەوكەسەی ئالف و تفاق بۆ كێبەركێی ئەسپ دێنێ؛ ١١) ئۆنگووت ‹١› = ناوی هۆزی ئۆنگووت؛ ١٢) بارەچوق ‹٤› = ناوی تایبەت[٢٠٤]؛ ١٣) بارووق ‹١،٤› = گەورە و بەرین (بەروغ)؛ ١٤) بەخڵەچی ‹٣› = بوخچەدروو؛ ١٥) بەرانقاز ‹١› = باڵی ڕاست (بەرەنقەز)؛ ١٦) بلارقوو ‹٥› = ماڵی ونبوو[٢٠٥]؛ ١٧) بولقان ‹٤› = ناوی مێیینە[٢٠٦]؛ ١٨) تووپووڵقا ‹١› =؟ لە مغولی دەچێ؛ ١٩) توودان ‹٣› = ناوی شەخس (تۆدۆیۆن)[٢٠٧]؛ ٢٠) توولاچی ‹١› = ڕاوچی كەروێشک؛ ٢١) جالیق ‹٢› = بوت؟[٢٠٨]؛ ٢٢) چارئۆیماق ‹٤› = چوار هۆز (مەغۆلییەكەی «ئەیمەق»ـە)؛ ٢٣) چوكەتوو ‹٤› = بەبەردی بچووكەوە؛ ٢٤) سائین ‹١› = باش، چاک؛ ٢٥) ساتی‹ ٢› ناوی شەخس[٢٠٩]؛ ٢٦) سەپوورغان = گومبەز (سەبووغەن)؛ ٢٧) عەرەقتوو ‹٢› = بۆ پاشگری توو؛ ٢٨) قانچی ‹٢› = قۆڵ؛ ٢٩) قەرتاڤەوڵ ‹٤› = بۆ پاشگری «ـەوڵ»؛ ٣٠) قووتان ‹٣› = ماسیگرە[٢١٠]؛ ٣١) كاردچین؟ ‹٢› = ناوی مێیینە، كەردووجین[٢١١]؛ ٣٢ كێوی ‹١› = هۆزی كویئی[٢١٢]؛ ٣٣) مانقوتای ‹١› = ناوی شەخس[٢١٣]؛ ٣٤) مەرگەن ‹٣› = ڕاوكەری وریا؛ ٣٥) مەرگید ‹٢› = هۆزی مەركیت؛ ٣٦) مەكەتوو ‹٢› = مرۆڤی فێڵباز؛ ٣٧) مووخور ‹٣› = بێ هەست، كورت (موقور)؛ ٣٨) موڤیل ‹١› = گێلاس (مۆڤیل)؛٣٩) ناچید ‹٤› = باز [باڵندە]؛ ٤٠) نەچیق = تەنبەڵ؛ ٤١) ناڤوور ‹٣› = دەریاچە؛ ٤٢) هاروولان (لە سیلوانا ‹٥›) = هۆزی ئەرولان (ئەرولەت).

## پاشکۆی دووهەم

**تویژی کۆن لە تۆپۆنیمی ناوچە: «پەرسوا»و «دەریاوسا»** روانینی خێرامان بەو «کارتی ویزیت» انە دا کـە مـەغـۆل لە ناوچە باشـووریـیـەکـانی دەریاچەی ورمێ بەجـێـی یان هێشـتـوون، تەنها دەمانباتە سەر دوایین تویژ لە تۆپۆنیمی ناوچەکە (واتە سەدەی ١٣ و١٤). بەزوویەکی زوو دوای ئەو سەردەمە، مەغۆلەکان بەهۆی دانیشتوانی تورکەوە[٢١٤] توانەوە. ژمارەیەکی کەمیشیان رەنگە لەلایەن کوردەوە تواینێتنەوە، گەرچی روالەتی تیپیکالی ئەمیان [= کورد]، تێکەلاوییەکی ئەوتۆ نیشان نادات.

دەکرێ کەم و زۆر بلێین کە حەوزەی چۆمی کەڵوی (زێی بچووک)، ناوی تورکی ـ مەغۆلی تێدا بەرچاو ناکەوێ بەڵام لەناوچەی باشووری دەریاچەی ورمێ دەتوانین شوێنی ئاشکرای هێلـێک هەڵبگرین کە لە لایەکەوە، دوا پاژی «کەند»ی[٢١٥] تورکییان بە شوێنەوەیە (وەک شەرەف ـ کەند و عیسا ـ کەندی) یان پاشگری وەک «لیق»یان گرتوە یاخود عونسوری بە ئاشکرا تورکی وەکوو «ئاغاج» و «بولاق»یان هەیە، لەلایەکی دیکەشەوە لیزگەی ئەو ناوە کوردییانەی وا بە «ئاوا» (آبادی فارسی) کۆتاییان پێ دێ یان ئەوانەی پاشگری ئێرانییان هەیە (کۆی «ان»یا «ـەکان») یا ئەوانەی بە «کانی» (کانیەرەش) یا «گرد» (گردەسوور) دەست پێدەکەن، یاخود عونسوری بە هاسانی ناسراوی کوردیان هەیە، وەک «باسکەدرێژ» (چنگاڵ) «کونەمشکە» و... هتد. زمانی کوردی هێشتا بە تەواوی زمانێکی ناسراو نییە و زۆر وشەی تێکنێکی لە زمانی کوردیدا، چاوەڕوانی روونبوونەوەن.[٢١٦]

لە دەرەوەی تویژە کوردییەکان، تورکی یا مەغۆلی بوونی هێندێک ناوی ئاسایی لە تۆپۆنیمی ناوچەکەدا، جێگای سەرنجن. گومانی تێدا نییە کە تاقمێک ناو بەتایبەت لە حەوزەی «گادەر»، مەسیحی ئارامیین، وەک: «سەرگیس»[٢١٧]،«دینها»[٢١٨] (بەواتای دەرکەوتنی [عیسا])، سەڵۆس[٢١٩] و «بیم سورتە» (بەواتای منبەری بچووک، کە ئێستا «بیم زوتە»[٢٢٠] ی پێدەڵێن). بروانە: ف. ج، بەرگی٤، ل ٩٤.

واهەیە تایبەتمەندیی جیاوازی ئەو «ئارامی»یانەی لە مەڵبەندی نێوان «سەردەشت» و «بانە» و ئەو شوێنەدا رەنگی دابێتەوە، کە وا چۆمی «کەڵوێ» بەرەو «مێزۆپۆتامیا» خول



دەخـواتەوە. لەم شـوێنەدا، دەتوانی ناوی وەک «شـمـۆلە» (ف. ج، بەرگی٤، ل٣٠٤: شەموعیلا)[٢٢١] و «شیلمان»[٢٢٢] لە سەردەشت و «سیەوما» لە بانە (بەراوردی بکە لەگەڵ «سیاما»ی سوریانی بەواتای کشتوکاڵ)[٢٢٣] و هێندێک ناوی وا بدۆزییەوە کە بە «بێ» دەست پێدەکا (بێ ی [ئاشووری] = ماڵ؟) بۆ نموونە: بێتووش، «بیران» و «بێورە»[٢٢٤].

بەڵام ناوی «ئاڵوت»[٢٢٥]، «ئەرنەبووس» (ئەربەنووس؟)[٢٢٦]، «دوونیس»[٢٢٧]، «گادەر»، «گاگەش»[٢٢٨]، «لەگز»[٢٢٩]، «نەڵۆس»[٢٣٠]، «نەرزەمیس»[٢٣١]، «تەیەت»[٢٣٢] و هتد... کە لە بەشی رۆژئاوای ناوچەکەدا بڵاو بوونەتەوە، دەبێ چ بن؟

ئەوەی کە دەتوانین شوێنی هەموو شوێنەوارێکی «پێش ـ ئێرانی» واتە میرنشینە زاگرۆسییەکانی وەک «سوریکەش»[٢٣٣] (سەقز؟)، «لارویت» لە مەڵبەندی ئەڵلابیریا و... هتد؛ لە ناوچەی بەر تویژینەوەی ئێستاماندا هەڵبگرین یان نا، کاتێک روون دەبێتەوە کە لیستەیەکی تەواومان لە سیمای جوگرافیایی ناوچەکە (دۆڵ و شیو، بوار، رێچکە و رووباری بچووک) بەدەستەوە بێ.

تۆ بڵێی «ترکەش»[٢٣٤] لەناو مەنگورایەتی و لای رۆژئاوای «کەڵوێ»یا «ترکاشە»[٢٣٥] ی نزیک بۆکـان ـ ف. ج، بەرگی٤، ل١٢٠؛ رەنگدانەوەی ناوی «تکریش»[٢٣٦] بن لە خاکی «مانا» (بروانە: ل. واترمەن، نامەگەلی پادشاهی، میشیگان، ١٩٣٠، ١٣١)؛[٢٣٧]. یا بڵێی ناوی «ئیندرقاش»[٢٣٨] کە گۆڕی بەردینی «فەقرەقا» کەوتۆتە نزیکییەوە، عونسورێکی بۆ بەراورد کردن لەگەڵ ئەو «ترکەش»[٢٣٩] و «سوریکەش»[٢٤٠] ـەی وا «سارگۆنی دووهەم» ناوی بردوون تێدا بێ؟

ئەم چەشنە تەنگ و چەڵەمانە دەبێ لەلایەن پسپۆڕانەوە چارەسەر بکرێن، بەڵام بۆ ئەوەی منیش ئاکامێکم لە وتارەکەی خۆم وەرگرتبێ، دەبێ هێندێک سەرنج و بۆچوون لەمەڕ دووناوی پێوەندیدار بە تویژێکی کۆنتری تۆپۆنیمی ناوچەکە بخەمە بەرچاو:

١) ئەوە راستییەکی زەقە کە ئاشوورییەکان ناوی دوو نەتەوەیان لە باشووری گۆلی ورمێ هیناوە: «مەدا» (یەکەمجار لە ٨٣٦ پێش ز) و «پەرسوا»[٢٤١] (یەکەمجار لە ٨٤٤ ی پێش ز). ئەم خەڵکانە دەبێ نوێنەری نفووزی زۆری مادی و ئێرانییە کۆنەکان بن پێش ئەوەی کە ئەوی دوایییان بەرەو باشوورتر واتە ناوچەی «فارس»ی ئەمرۆ (پارس)[٢٤٢] بڕوات و ناوی خۆی [بەناوچەکە] ببەخشێ.

لە باسی لەشکرکێشانەکەی ساڵی ٧١٤ ی پێش زایینی خۆی دا بەرەو باشوور، سارگۆنی دووهەم دەڵێ: لە «لاروەتە»[٢٤٣] هاتە خوارەوە بۆ ناو «پەر ـ سو ـ اش»[٢٤٤]. پەرسوا وێدەچێ تاقە شوێنێک بێ لە ناوچەکە (سەرگادەری خواروو ـ نزیک سووچی باشووری گۆلی ورمێ) کە بیرورِای پسپۆران لەسەر شوێنایەتییەکەی هاودەنگە. من دەبێ لەم باسەدا بەتایبەت پێ لەسەر واتای «هاتنەخوارەوە» داگرم: ناوچەی بەپیتی گادەری خواروو بەناوێک دەناسرێ کە لەبنەڕەتدا مەغۆلییە واتە «سولْدووز». لەسەردەمی پێشکەوتەکانی ئیسلامدا، ناوی «نیریز»[٢٤٥] بوە (لە«بلاذری» ل ٣٣١دا، بەهەڵە نیریر نووسراوە) و من بە«نیریژ»[٢٤٦] ی دەزانم بەواتای رژانەخوارەوە[٢٤٧]؛ خەڵک بۆ گەیشتن بەشوێنێکی وا، دەبوایە [لە ناوچە شاخاوییەکانەوە] بهاتایەنەتە خوارێ.

«سارگۆن» لە «پەرسوا» وە بەرەو «میسسی»[٢٤٨] لە خاکیماننا هات. میسسی دەبێ کەوتبێتە بەشی خوارووی تەتەهوو و شانی چەپی ئەو لێوارەی چۆمەکە وا «مینوا»[٢٤٩] شای ئورارتوو، بەردنووسێکی بزماری لێ بەجێهیشت و تێیدا گوتبووی دوای سەرکەوتنی بەسەر ماننا دا، کاخێکی لە«مەیشتەخە»[٢٥٠]؟ بنیات ناوە[٢٥١].

لەوانەیە کە میسسی و مەیشتەخە ئیشارەیەک بن بە هەمان شوێن کە «میلیکیشڤیلی» لە لێکۆڵینەوەکانیدا دەستی کەوتوون (١٩٤٩)[٢٥٢]. من لام وایە قەڵای رووخاوی «پەسوێ» چ لە رووی فۆنیتیکەوە و چ لەباری جوغرافیاییەوە مافی ئەوەی هەبێ بلێ نوێنەرایەتی «پەرسوا» دەکەم. «یاقووت» (بەرگی١، ل ٦٢٦) کە خۆی سەری ئەو ناوچە بچووکەی دابوو، ناوەکەی وەک «بسوی» حونجەی دەکا کە بەڕواڵەت هەمان «پەسوێ»یە. هەروەها بڕوانە نزهت القلوب، ل ٨٧.

شێوە نووسینە تازەکەی [لە فارسیدا] «پسوە»یە. ژمارەیەکی زۆری ئەو حاڵەتە لە فارسی تازەدا هاتۆتە پێشێ کە دەنگی/ ر/ یی کۆن لەناو تاقمی جۆربەجۆری کۆنستانت دا لەناوچووبن. بڕوانە: Horn,"Grundriss d. Iran", Phil, 1, 2, 89, 98 و هەروەها لەناوچەی ژێرپرسیاری ئێمەدا، دەبێ زۆر دەستەڵاتی دیکە هاوبەشییان لە کورت و هاسان کردنەوەی ئەو ناوە کۆنانەدا کردبێ کە ئێمە تێیان ناگەین. «پەسوێ» ـ هەر لە رێگا خۆشەکەی «لاجان» (ی نزیک بەسەرچاوەکانی «کەڵوێ» کە دەرژێتە ناو دەجلەوە) تا شوێنی نفووزە کەمەکەی «گادەر»ی سەر بەحەوزەی دەریاچەی ورمێ ـ لە شەڕ و





پێکهەڵپرژانی ناوچەکەدا، دەورێکی گرنگی بینیوە. بناغەی وردبوونەوە لە [مێژووی] «پەسوێ» لەسەر شەڕ و پێکدادانی نێوان هۆزە کوردەکان دانراوە. بڕوانە: شەرەفنامە، ١، ٢٨٠ و بەراوردی بکە لەگەڵ G. Hoffmann, Martyrer, 245

ئەگەر «پەرسوا» کان لە دەشتی بەپیتی سولْدووز ژیابن، شوێنێکی وا، دەبێ بنکەی سروشتی بووبێ بۆ بەرەی پێشەوەی شەڕی دژ بە باشوور و سارگۆنی دووهەم رەنگە لەهەمان شوێن "هاتبێتە خوارێ" و چووبێتە ناو وڵاتەکەیان. لە عەینی کاتدا واهەیە ناوی «پەسوێ» وەک تابلۆیەکی راگەیاندن بووبێ هەم بۆ دوژمن و هەم بۆ هەموو میوانێکی ئاشتیخواز کە ئەو «بەرە»یەی تێپەڕ دەکرد. ئەو«پەسوێ»یەی من لەساڵی ١٩١١دا چاوم پێی کەوت تەواو وێران بوو. بەڵام لە تەرح و رەسمی ناو کتێبی «جادە کۆنەکان»ی Sir A. Stein ساڵی ١٩٤٠، ل ٣٠٥ و ٣٥٨دا، دەتوانی داوەری لە سەر کاراکتێری بەهەیبەتی چیاکەی بکەی.

٢) دەشتی خوار چۆمی «سابڵاخ»، ناوی «شارویران»ـە (شهرویران لە فارسیدا بەواتای «شاری کاول» ە) و لەلایەن «سیر هـ. راولینسن» (هەمان سەرچاوە، ل ١٩، ٣٨ و ٧٤) و هەروەها لەلایەن «دو مۆرگان» و «سیر ئـ. ستەین» (کتێبی «جادە کۆنەکان »ل ٤٠٨تا ٤١٢) ـەوە پەنجەی بۆ راکێشراوە.

شوێنێکی ئەم ناوچەیە «دەریاس»[٢٥٣]، کە بەگوێرەی شەرەفنامە، ل ٢٨٨ تا ٢٨٩، موکرییەکان دوای هاتنیان لە رۆژئاواوە، لەوێدا نیشتەجێ بوون. راولینسن ناوەکەی دەزانی بەڵام ئەو ناوچەیەی نەگرتە بەرچاو کە «دەریاس»ی تێدا هەڵکەوتوە (هەمان سەرچاوە، ل ١٩). لەلایەکی دیکەوە، ناوەکەی لەگەڵ «دەریاوسا»[٢٥٤] ی «بەتلەمیووس» بەراورد کردوە و هەر لەشانی ئەودا پەنجەی بۆ گوندی «سرگان»[٢٥٥] (لە شنۆ و بەشی ژووورووی چۆمی گادەر) راکێشاوە کە بۆی هەیە نوێنەرایەتی «سنکەر»[٢٥٦] بکا وا بەتلەمیووس لای دەریاوسای دانابوو.

«سرگان»، وەک پێشتر لەلایەن «ن. ڤ. خانیکۆف»ـەوە باسی لێوەکراوە[٢٥٧]، دەتوانرێ وەک «سنگان»[٢٥٨] بخوێنرێتەوە. راولینسن هەروەها (هەمان سەرچاوە، ل ٧٤) لای وایە کە سرگان (سنگان) رەنگە هەر ئەو شوێنە بێ کە ئیمپراتوور«موریشس» کاتێک لە ساڵی ٥٨٩ ی زایینی دا، لەشکری بیزانسی بۆ پشتیوانی خەسرەوی دووهەمی

ژێر حیمایەتی [خۆی] نارد، لەسەر ڕێگای چوونی بۆ حەوزەی دەریاچەی ورمێ چاوی پێی کەوت[259]. ئەم بۆچوونەی دوایی زۆر لە ڕاستی نزیکە چون «سنگان» دەڕوانێتە ئەو بستوەی کە لەشکرەکە لە مێزۆپۆتامیاوە بەوێدا تێپەڕ دەبوو. لەباری فۆنیتیکەوە بەرانبەر دانانی «دەریاس» لەگەڵ «دەریاوسا» زۆرمان وەسوەسە دەکات. «دەریاوسا/ دەریاس»ی نزیک «پەسوێ» (بڕوانە سەرەوەتر) بە نزیکایەتی دەنگە ئێرانییەکەیەوە، دەبێ پشتیوانێکی دیکە بێ بۆ دۆزینەوەی شوێنی« پەرسوە»ی ئێرانی[260] لە لێواری ڕۆژئاوای دەریاچەی ورمێ.

پێویستە ئێمە «هەویتی»[261] «سیرەگەنون»[262] ی بیزانسی لەگەڵ «سنگان» و هەڵکەوتی «دەریاس» بپارێزین بەڵام ناسینەوە و جیاکردنەوەیان لە «سنکەر» و «دەریاوسا»ی بەتلەمیووس تووشی موشکیلەی زۆر دێ. بەگوێرەی قسەی بەتلەمیووس (بەرگی٦، فەسڵی٢)، دەریاوسا و سنکەر لەو شوێنانەی خوارێ هەڵکەوتبوون:

| | درێژایی جوغرافیایی | پانایی جوغرافیایی |
| --- | --- | --- |
| دەریاوسا | ٣٠ ٨٧ | ٣٠ ٣٨ |
| سنکەر | ٨٨ | ٣٠ ٣٨ |

لە ئاکامدا، هەردوکیان دەکەونە سەر دوو هێڵی ڕێک؛ تەنیا «سنکەر» هێندێک کەوتۆتە لای ڕۆژهەڵاتی دەریاوساوە. ئێمە هەروەها ئەو [زانیارییانەمان] هەیە:

| | درێژایی جوغرافیایی | پانایی جوغرافیایی |
| --- | --- | --- |
| ئەکبەتەنە[263] | ١٠ ٨٧ | ٤٥ ٣٧ |
| فەرەسپە[264] | ٣٠ ٨٥ | ٣٠ ٤٠ |
| ئەرگەنزەنە[265] | ٨٩ | ٣٠ ٣٩ |

ئەگەر «ئەرگەنزەنە»، زەنجان بێ، «فەرەسپە» ش مەراغەیە (بلاذری، ل ٣٣٠: ئەفرەهروود) ـ وەک لە گۆڤاری «سواس»یشدا وا دانراوە[266] ئینجا دەبێ «سنکەر» لە نزیک هەمەدان، لە شوێنێکی نزیک بە سەرچاوەکانی چۆمی «قزل ئوزەن» (سفیدرود) هەڵکەوتبێ و دووریش نییە نوێنەرایەتی «سنە»[267] ی ئێستا بکا (بلاذری[268]، ل ٣١٠: «سیسەر»[269]).

لە هەل و مەرجی ئێستادا و بە هەموو ئەو خاڵە تاریک و نادیارانەوە وا لەمەڕ «سنە»





و«سنکەر»ی بەتلەمیووس هەن، ئەرکی دابینکردنی شوێنایەتی «دەریاوسا» لە ڕۆژئاوای سنکەر، کارێکی زۆر ئەستەمە و چارەسەرناکرێ. لەگەڵ ئەوەشدا، «دەریاس»ی ناوچەی شارویران و هەڵکەوتنی لەلای ڕۆژهەڵاتی ئەو شوێنەی وا بڕوا دەکرێ «پەرسوا» بێ، هەموو سوودێکی ئارکیۆلۆژی و هەروەها ڕواڵەتە ئێرانییەکەی خۆی دەپارێزێ.

لێکۆڵینەوەی ئێستامان لەمەڕ توێژی تایبەت بە «ناوی شوێن» لە مەڵبەندێکی بچووک، پێویستی بەکورت و موختەسەر کردنەوە نییە. ئەو ناوە مەغۆلی و تورکییانەی وا لە کارەکەی من دا خراونە بەر ئەزموونکاری، گەلێک لەو ناوە ئێرانییانەش قورس و ڕەقترن کە بە درێژایی زەمان چەندەها جار تووشی گۆڕانکاری هاتوون.

توێژینەوە لەم ناوانە، لە بواری «فیلۆلۆژی» دا، کارێکی سەرنجڕاکێشە. ئامانجی ڕاستەوخۆی منیش لە وتارەکەدا، هەڵخلاندن و پاڵپێوەنان بۆ نزیک بوونەوەی سسیتماتیک لە تۆپۆنیمی سەرزەمینی کۆنی ئێران بوو.

تۆپۆنیمی ـ وەک کەرەستەیەکی یارمەتیدەر بۆ ئەرکی مێژوونووسان، دەبێ لە داهاتوودا شوێنی خۆی بە تەنیشت «سکەناسی»[270] و «تاتەنووس خوێندنەوە»[271] وە بدۆزێتەوە*.

* سێ وتاری من لە لیزگەی مەغۆل ناسیدا، بریتین لە:

1) “A Mongol decree of 720 / 1320 to the family of Shaykh Zahid”, BSOAS, XVI, 3, 1954, 515 - 27.

2) Pür-i Baha's ”Mongol” ode, BSOAS, XVIII, 2, 1956, 261 - 78

3) Pür-i Baha and his poems, Charisteria Orientalia, Praha, 1956, 186 - 201

کەمبریج، 1957/2/5.

# پەڕاوێزی ناوی مغولی شوێن

× ئەم وتارە، لە سەرچاوەی خوارەوە وەرگیراوە:

*Mongol Place - names in Mukri Kurdistan, (Mongolica,4) by V. Minorsky. Bolletin of School of Oriental and African Studies,

[بولتەنی قوتابخانەی ڕۆژهەڵاتی و ئەفریقی – لەندەن]

19/1, 1957, pp.58 - 81.

1. V. Minorsky

٢) [زانستی لێکۆڵینەوە لە هۆگەلی دانرانی ناو لەسەر چۆم و کێو و گوند و ناوچە؛ وجە تسمیە]

٣) Element

٤) [Province، محافظە]

٥) [فرهنگ جغرافیایی ایران، ج ١ تا ١٠، عباسعلی رزم ارا، ١٣٢٠، تهران؟]

٦) [ ئەم دابەشکرانە ئەمڕۆ، ئاڵوگۆڕی زۆری بەسەردا هاتوە و بۆ نموونە، ئوستانی پێنجەم کراوە بە سێ ئوستانەوە: کرماشان، کوردستان، هەمەدان و ئیلام. هەروەها ئوستانی چوارەم خۆی بوە بە چوار ئوستان: ئازەربایجانی ڕۆژهەڵات، ئازەربایجانی ڕۆژئاوا، ئەردەبیل و زەنجان].

٧) ناوە غەیرە فارسییەکان (تورکی، کوردی و ئارامی)، بەپێی حونجە (pronuncation) فارسییەکەیان کراونەتە لاتین و بەشێکیان بریتین لە بابەتی «نەزەری» بێ خەوش و نووسرانیان بە پیتی عەرەبی تووشی هەڵەمان دەکات [وەک چۆن وشەی] «دورکە – تەرگون» لە جیاتی دورگە – تەرکوڤوین» دانراوە (بەرگی ٤، ل ٢٩٠) و «قەرگ» لە بری «قرق» نووسراوە (ب ٤، ل ٥٢٣) و «ناڵووس» کراوە بە «نەلوس» و... هتد) تەرتیبی ئەلف و بێی لیستەکەش زۆر جار نادروستە.

٨) کاتێکی زۆر دەبات تا بزانرێ کە ناوی تازەی «شاهپور» دەگەڕێتەوە بۆ «سەڵماس» و«دیلمان» بۆ «دیلمەقان»ی کۆن. [شیاوی باسە کە دوای ساڵی ١٩٨٠، ناوی شاهپور سەرلەنوێ کراوەتەوە «سەڵماس»]. نووسراوە و مێژووەکانی پێشوو گەلێک شێوەی کۆن و لەکارنەهاتووی ئەو ناوانەیان تێدایە؛ بۆ نموونە، ناوی «باسمنج» (لە ڕۆژهەڵاتی تەورێز، ف. ج، ٤، ل ٧٤) لە «عالم ارا» دا، ل ٦٥٧ وەک «فەهوسفەج» هاتوە. بە پێچەوانە، لە ف. ج، ٥، ل ٣٠٧ دا دەتوانی ناوی گوندی ئێستای «پەریسپە» ببینی (لە هەمەدان) کە بە شێوەی «فەرسەفەج» نووسراوە.

9. Visiting Cards

١٠) بڕوانە:

G. Hoffmann, "Auszüge aus syrischen Akten persischer", Märtyrer, 1880.



١١) بڕوانە:

H. Hübschmann, "Die altarmenischen Ortsnamen", in "Indogermanische Forschungen", 16, 1904, 197 - 490

12) Billerbeck

13) W. Belck

١٤) بڕوانە:

M. Streeck, "Das Gebiet d. heutigen Landschaften Armenian, Kurdistan und Westpersien", zeit. f. Assiryologie, 14, 1899, 103 - 72.

15) Thureau - Dangin

16) Forrer

17) E. Speiser

18) Herzfeld

19) W. Tomaschek

20) Nearch's cruise in the Persian Gulf.

21) The great "Khorasanian " high way

22) The roads across the Central Desert.

23) W. W. Tarn

24) J. Marquart

25) Ptolemy's catalogue of Median place - names

26) C. F. Andrea

٢٧) Pauli - Wissaw's Real Encyclopaedia ئەم کتێبە لە پیتی "A" تێپەڕ ناکات. هێندێک بابەتیش لەسەر جوگرافیا (ی پێش ساڵی ١٩٠٠)، لە سەرچاوەی خوارەوەدا هاتوون:

Grundriss der Iran philologie, 2, 371-3, - 387 - 94(W. Geiger) and 605 - 11 (F. Justi)

28) Windschmann

29) Geiger

30) Nöldeke

31) H.W. Bailey

32) W.B. Henning

33) Karta





34) O. Blau

35) A.D. Mordtmann

٣٦) ئامانجی سەرەکی «ئۆ. پاول»، ژمارە ٨، ١٩٣٢، ل ١١٠ – ١٠٥ و ژمارە ١٠، ساڵی ١٩٣٤، ل ٢١٥ – ٢٠٦ و هەروەها «ج. شنیتز (J. Schnetez)، ژمارە ١٠، ساڵی ١٩٣٤، ل ٢٢١ – ٢١٥، بەرپەرچ دانەوەی نزیکایەتی نێوان دوو ناوی «گرمانیی» و «کرمان»ـە.

37) W. Eilers

٣٨) بڕوانە:

"Der alte Name des Persischen Neujahfestes", Akad. d. Wiss. u. d. lit. in Mainz, Abhandl. d. Geistes - u.Sozialwiss. kl, 1953, Nr. 2 (see Index); "Der Name Demavend", Archiv Orientalni, 22, 1954, 267 - 374. 24, 1956, 183 - 224.

٣٩) «نامـهـای شـهرها و دههـای ایران»، بەرگی یەکەم، ١٩٢٩، ٢١ لاپەرە، (تهـران، شـمـیـران و هتـد...)؛ بەرگی دووهەم، ١٩٣١، ٣١ لاپەرە (باسی پاشگری وان، گـان، هان، خـان، دان، لان، زان، ران).

٤٠) [«فدائیان اسلام» کوشتیان].

٤١) ئێستا تەنیا ناوی مەڵبەندی «شووڵستان» و هێندێک ناوی شوێنی دیکەی [ئوستانی]« فارس»، لەو «شووڵ» انە (shül) بەجێ ماوە کە تا سەدەی سێزدە و چاردە [ی زایینی] ش هەر دەناسرانەوە.

42) Balkhan

43) Krasnovodsk Bay

44) Caspian

45) Oghuz Turks

46) Balkan(ancient haemus)

47) بڕوانە: «حدود العـالم»، ل ٣٧٤؛ بەراوردیشی بکە لەگەڵ کاری و. ئیڤانۆڤ لە سەر زاراوەکانی سەحرای ناوەندی لەم سەرچاوەیەی خوارەوەدا:

Journal of Royal Asiatic Society, 1926, 405 - 31; and Acta Orientalia, 8, 1927, 45 - 61.

(هەروەها بەراوردی بکە لەگەڵ وشەی «گیس» بۆ ژمارەی بیست و «گود» بۆ «باد» [= با] لە زاراوەی «خوور» [ناوەندی ئێران] دا). من هەوڵم داوە بڵێم کە دانانی ناوی پێتەختی ئەرمەنستان ـ «دڤین» [Dvin] لەلایەن پارتی یەکانەوە [Parthians] بوە کە لە «ستێپ»ـەکانی تورکمەنستانی ئەمڕۆوە هاتوون. بڕوانە:

Minorski, Transcaucasica, J.As, Juillet 1930, 41 -51.

بە بڕوای من، وشەی «کەنت»ی ڕۆژهەڵاتی («سوغدی» ؟) ش لەلایەن تورکە «ئوغوز»ـەکانەوە لە کاتی



کۆچکردنیان بەرەو ڕۆژئاوا، هاتۆتە ئازەربایجان و «ئەوپەڕی قەوقاز». بڕوانە خوارەوەتر [پاشکۆی دووهەم].

48) Basin

٤٩) [مینورسکی لەشێوەی Tatavu ی دا نووسیوە]

50) S. H.Shipley

51) {archaelogical}

٥٢) بڕوانە وتارەکەی پێشووم بەناوی «کێلەشین و شوێنەوارکۆنەکەی حەوزی گۆلی ورمێ» (بە ڕووسی) "The Kela - shin and the earliest monuments in the basin of Lake Urmiya"(in Russian) in: zap. Vost. Otd, xxiv,1917, 145 - 184.

هەروەها وتارێکی دیکەم بە ناوی «ساوجبلاغ» ( sawdj - bulak) لە «ئینسیکلۆپێدیای ئیسلام» دا و وتارەکەی ترم بە ناوی «لەشکرکێشانی ڕۆمیی و بیزانسی بۆسەر ئاترۆپاتەن» لە بۆڵتەن ی«سواس» دا:

Roman and byzantine campaigns in Atropatene, B. S. O. A. S, xi, 2, 1944, 243 - 65.

[ئەم وتارەش وەرگەڕاوەتە سەر کوردی و لێرەدا چاپ کراوە].

٥٣) شلێر ناوێکی کوردییە بۆ ڕوەکێک کە لە «باخچەی زانستیی کەمبریج» دا بە «فیستیلار ئیمپریال »بە واتای «تاجی شاهی» ناسراوە.

54) Cambridge Botanic Garden, Fistillaria Imperialis

[Parthian]

٥٥)[Sa'uj-bulaq سائوج ـ بولاق]

٥٦)[مینورسکی بە شێوەی« Saukand ی نووسیوە]

٥٧)[مینورسکی لە شێوەی «وێرانشار»ی دا نووسیوە]

٥٨)[ئەم بۆچوونە ڕەنگە لە زۆر شـوێنی چۆمی جـەغـەتوو دا ڕاست بێ بەڵام مـینورسکی لەبارەی «تەتەهوو» ەوە تووشی هەڵە بوە. هەر دوو بەری ئەم چۆمە، لە زوربەی شوێنەکانی ئازەربایجانیش دا هەر کوردی تێدا نیشتەجێن].

٥٩) زۆرتر بەرەو باشـوور، ئەم ئەرکی دابین کـردنی سنوورە [لە نێـوان کـورد و تورک]، جـەغـەتووی ڕۆژهەڵات دەیگرێتـە ئەسـتـۆ و لەو بەری ئازەربایجـان، هەمـوو ناوچەکـانی کوردسـتـان و کـرمـاشـان بەتەواوەتی کوردی تێدا نیشتەجێن.

60) Kharkhar

61) Ellipi

62) Allabria

٦٣) گوندی «خەڵخاڵ» لە ٢٦ کیلۆمیـتـری ڕۆژهەڵاتی کرماشان و ناوچەی بەرینی «خەڵخاڵ» لە





باشووری ئەردەبیل و لای باشووری نیشتگای شاهانی «ئالبانی» کۆن لە «ئەوپەری قەوقاز» (Transcaucasia). رەنگە «مووسا کەلەنکەتقەتسئی» قامک بۆ تێکشکانی خەڵکی «خەرخەر» رابکێشێ: Moses Kalankatvats'i, 1, ch. 19.

٦٤) بڕوانە:

Jermiah, L1, 27,"The Kingdom of Ararat (Urartu, Minni (Manna) and Ashchenaz (Scythians)"

سترابۆن (٨،١٤،١١) زەریاچەی ورمێ بە «مانتیانی» ناو دەبا. بەراوردی بکە لەگەڵ:

W. Belk "Das Reich d. Mannäer", in Verhandl d. Berl, Gesell.f. Anthropologie, 1894, 479 - 87 and G, Melikishvili,"Voprosi istorii Maneyskogo tsartva", in Vest. drevney istorii, 1949, No. 1, 57 - 72.

٦٥) یا خود رەنگە هی ئوستانە سەرسنوورییەکەی خۆی «میسسی» (مەیشتا؟)، بڕوانە: Melikishvi-li (پێشوو).

٦٦) بڕوانە:

F. W. König, "Älteste Geschichte der Meder und Perser , " Der alte Orient, xxxIII, 3/4, 1934

بۆ دەوری هۆزە خۆجێ ییە زاگرۆسییەکان لە پێکهاتنی پاشایەتی ماد دا، بڕوانە:

I. Aliyev, " Ocherki po drevney istorii Azerbayjana, Baku, 1956, 57 - 169.

٦٧) بڕوانە:

F. Thureau - Dangin, Une rédation de la huitième campagne de Sargon, 1912

هەروەها بڕوانە: کاری ئەم دواییەی «هیرتسفیلد»:

Herzfeld, "Bronzener Freibrief eines königs von Abdadana", Arch. Mitt. aus Iran, IX, 3, 1938, 159 -177.

(پێداچوونەوەیەکی سەربەخۆی فایلە ئاشوورییەکان).

هەروەها:

Col, E. M. Wright, "Eight campains of Sargon, in Journal of Near Eastern Studies, II, 3, 1943. 173 - 85.

(بۆچوونی سەرنجڕاکێشی کاربەدەستێکی دەزگای موخابەراتی ئامریکا کە لە نزیکەوە ناوچەکەی خستۆتە بەر توێژینەوە و حەوت جار بە سەر شاخی «سەهەند» دا تێپەڕ بوە.)

دواکاریش لەسەر مێژووی ئۆرارتۆ، لەلایەن پرۆفیسۆر «ب. ب پیۆترۆڤسکی»یەوە کراوە:

B.B. Piotrovsky, Istoriya i kultura Urartu, Erevan, 1944, 364pp.



٦٨) پەنجا کیلۆمیتر لای رۆژهەڵاتی سەقز. بڕوانە:

A. Godard,"Le trésor de Ziwié", 1950.

٦٩) بڕوانە:

Minorsky," Les origines des Kurdes", in Actes du XX e Congrès des Orientalistes, Louvain, 1940, 143 - 52.

٧٠) بڕوانە:

N. Debevoise, "A Political History of Parthia", 1938, Index under Ariobarzanus Artabanus III.

٧١) هەروەها بڕوانە:

Moses of Khoren, II, ch. 50,52(the Aläns in Artaz - Mäkü)and 58; v. inf. p. 75.

٧٢) بڕوانە:

ـ بلاذری، ل ٣٣١، یەکەم،١٨٢

ـ ئەحمەد کەسرەوی، «پادشاهان گمنام»، بەرگی ٢، ل ٣٤.

ـ مینورسکی، «نیریز، ئوشنو» لە «ئینسیکلۆپیدیای ئیسلام» دا.

٧٣) بۆ نموونە، هەزبانییەکانی هەولێر، بڕوانە: ریسالەی دووهەمی «ئەبوو دلف میسعەر»، چاپی و. مینورسکی، قاهیرە، ١٩٥٥، بەشی ٢٥.

٧٤) بڕوانە: باسی«مەراغە» و «تەورێز» لە «ئینسیکلۆپێدیای ئیسلام» دا.

٧٥)[مینورسکی لە شێوەی «لاهیجان»ی دا نووسیوە].

٧٦) مەرکەزی «سەڵماس» تا ئەم دواییانەش ناوی «دیلمەقان» بوو («دەیلەمی»یەکان) و لاهیجانیش لە ئەسڵدا ناوچەیەکی ناسراوی «گیلان»ـە [لە باکووری ئێران] لە G. Hoffmann Auszüge، ل ٢٤٥ دا «سەلەخ» («لاجان»ی ئیستا) هەر بەم شێوەیە ناو دەبات؛ بڕوانە:

Minorsky, "La domination des Dailamites", Paris, 1932.

٧٧) بڕوانە: رشیدالدین، چاپی «کاترمیر»، لە باسی رووداوەکانی ساڵی ١٢٦٣/٦٦٠ دا. هەروەهارشیدالدین، چاپی جۆن (پراگ)، ل٤٤ کە دەڵێ: «خێزانەکە، تازەی مردنی «ئەباقا»یان لەسەر جەغەتوو گرت». بڕوانە:

(خوارەوەتر، پەراوێزی ژمارە ١٨٢) The Life of Yabalaha.

٧٨) لە مەڵبەندێکی دیکە (باکووری «ئەردەبیل») کە پێوەندییەکی نزیکی بە مەغۆلەوە هەیە، دەکرێ بە هاسانی ناوی هۆزی مەغۆلی «ئونگوت» (öngöt) بناسرێتەوە. بڕوانە: رشید، بەرگی ٧، ل ١٤٥ لە باسی ناوی مەڵبەندی ئونگوت دا. هەروەها: فەرهەنگی جوغرافیایی ئێران، بەرگی ٤، ل ٥٢.

٧٩) ظفرنامە، بەرگی یەکەم، ل ٦٢٨. هەروەها لام وایە ناوی ئەو دەشتەی وا لە هەمان فەسڵدا هاتوە،





دەبێ وەک دەشتی «قولاغای» بخوێندرێتەوە (بە مەغۆلی = دز).

٨٠) «سوڵتان میر موقەددەم» دوای لەناوبردنی سەرۆکەکانی موکری کرایە حاکمی مەراغە (عالم آرا، ل ٥٧٤).

٨١) بڕوانە:

A. Roosvelt, jr, "The Kurdish Republic of Mahabad", Middle East Journal, 1, 3, 1943, 247 - 6a.

٨٢) وەک لە سیستمی رووبارەکانی بەشی ئۆرووپای رووسیاشدا هەیە.

٨٣) کە دەتوانێ تەنانەت هی سەردەمی پێش مەغۆل، واتە تورکە سەلجووقییەکان بێ، کە لە سەدەی یازدە لە ناوچە باکوورییەکانی ئێران دا نیشتەجێ بوون. بۆ ماوەیەکی کورت لە سەدەی چاردەدا تورکە «جوغەتایی»یەکانی تەیموور، چۆمی «سەفیدرود»یان ناونا «ئاق – سەی» بە واتای چۆمی سپی. ظفرنامە، بەرگی ١، ل ٦٢٧. ئەم «ئاق – سەی»یەمان نابێ لەگەڵ لقێکی چۆمی «کوڕ» لە «ئەوپەڕی قەوقاز» لێ بگۆڕی کە رشیدالدین (چاپی جۆن، پراگ)، ل ٩ دەنووسێ «چەغان – موران»ـە و ئەوان [واتە مەغۆلەکان] پێی دەڵێن «ئاق – سوو» (کە تێیدا «ئاق» بە «چەغان/تسەغان»ی مەغۆلی تەرجەمە دەکرێتەوە بە واتای سپی.

٨٤) بڕوانە: سەرەوەتر، پەراوێزی ژمارە ٢٠

٨٥) «نزهت القلوب» ل ٢٢٣ دەڵێ: «جەغەتوو» (هەروەها بڕوانە ظفرنامە ب. ٢، ل ٣٧١) لە کێوەکانی کوردستان و لە هاوسێیەتی گوندی «سیاهکوه»ـەوە سەرچاوە دەگرێ و دوای تێپەڕبوون بە پشت ناوچەی مەراغە دا، لەگەڵ چۆمی «صافی» و «تەغەتوو» دەرژێتە ناو گۆلی خوێ ی «تەسووج» (واتە گۆلی ورمێ). دانەری کتێبی:

The Syrian Life of Yabalaha, translated by Chabot, 1895, p.121

دەڵێ: «لە ساڵی ١٢٩٦، دوای راونرانی مەسیحییەکان لە مەراغە، شاژنی مەسیحییەکان – بورغەچین (بولەغەن؟)، قەشەی گەورە و قەشەکانی دیکەی لە ماڵی خۆیدا شاردەوە و ئینجا ئەمان چوون بۆ شوێنێک کە «شاقاتوو»ی پێ دەگوترا. هەروەها بەرەو شاخی «سیاهکوه»یش چوون بۆ ئەوەی «شا» [دەبێ «ئوڵجایتۆ» بێ] لە نزیک هەمەدان بانگیان بکاتە حزوور. شاغاتوو واوێدەچێ کە حونجەیەکی دیکەی جەغەتوو بێ و سیاهکوهیش زنجیرە [شاخ] ێکی رۆژهەڵاتی شلێرەکە ئاو بەسەر جەغەتوو و قزل ئوزەن دا دابەش دەکات.

86) Theophylact Simocatta

87) Life of Mar Yabalaha, trans. by Chabot, 151.

٨٨) [بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٨٥]

٨٩) لە سەر ئەم باسە، بڕوانە وتارەکەی من بە ناوی «لەشکرکێشانی رۆمی و بیزانسی» گۆڤاری S.O.A.S، ١١، ٢، ل ٢٤٨ [تەرجەمەی ئەم وتارەش لە لاپەڕەکانی دواتری ئەم کتێبەدا هاتوە. وەرگێڕ].

٩٠) بەرانبەری «لوو»ی تورکییە. پاشگری لوو بەرەو ئەوە دەڕوا کە ببێتە «لی». پاشگری کەمتر کارپێکراوی «توو» ش وێدەچی هەمان ئاڵوگۆڕی بەسەردا بێ و ببێتە «تی». کەسرەوی خوداڵێخۆشبووش کە خۆی تورکێکی ئازەربایجانی بوو، دیاردەی بەوە کردوە و هەر ئەویش بێ ئەوەی سەری لە پاشگری مەغۆلی دەربچێ، بە هەڵە هەوڵی ئەوەی داوە واتای «کێو» بدا بە پاشگری «تی» لە زمانی کۆنی ئازەربایجاندا. [دەبێ نیازی مینۆرسکی لە زمانی کۆنی ئازەربایجان «ئازەری» بێ کە زمانێکی جیاواز لە تورکی و هاوبنەماڵەی زمانی کوردی بوە. وەرگێڕ].

٩١) ژیانی «یەبەلاها» لە شوێنێکدا (بڕوانە سەرەوەتر)، باسی شاقاتوو (چەغەتوو؟) دەکات بەڵام دواتر، ناوی« جەغەتوو»ی دێنێ کە لەگەڵ حونجە ئەمرۆییەکەیدا یەک دەگرنەوە.

92) Prof. W. Kotwicz

93) Tata'ul

94) tatavul

٩٥) لەو راپۆرتەیدا کە لەمەڕ سەردانەکەی شێخ صفی (١٢٥٢ ـ ١٣٣٤ز) لە کوردستانی موکری نووسیویە، صفوە الصفا، چاپی ١٣٢٩/١٩١١، ل ٣٣٣ ناوی ئەو دوو رووبارە بە «جغاتو» و «تغاتو» دەبات. لە «جیهان نوما» ی چاپی ئەستەمبووڵ ١١٤٥، ل ٣٨٨ دا، ناوەکان تووشی گۆڕان هاتوون و بوون بە «ج.ف.ت» و «ت. ف. توو»، ئەویش لە کاتێکدا کە ئەمیان شێوەی نزهت القلوب رەچاو دەکات.

٩٦) [«ساوجبلاغ»ی قەزوێن]

٩٧) هەرچۆنێک بێت، لە بیرەوەرییەکانی ساڵی ١٩١١ی خۆمدا، ئاماژەم بە «کانیاوێکی ساردی ئاسندار» کردوە کە نیوسەعاتە رێ یەک کەوتۆتە رۆژئاوای «ساوجبلاق» [تۆ بڵێی نیازی مینۆرسکی لە «گراوان» نەبێ؟ بەڵام گراوان گەرم و گۆگرددار بوو!] و نزیک شوێنی بەیەک گەیشتنەوەی هەر دوو سەرچاوەکان. [واتە سەرچاوەی چۆمی ساوجبلاق].

٩٨) بۆ کورت کردنەوەی «جی» (چی) و بوونی بە «ج» (چ)، رەنگە بتوانی ناوی ئەو مانگە ئۆیغورییانە بەری کە مەغوولەکان وەریان گرتوون و بەکاریان هێناون: ئاڵتینج، ئۆنوونچ.

٩٩) لە راپۆرتی «دەروێش پاشا»، چاپی ئەستەمبووڵ، ١٢٨٧، ل ٥١ یشدا هەروا حونجە کراوە. لە پاشکۆی «گەمەزۆڤ» بۆ کتێبی Putevoy Zhurnal, Spb,1875, p.545 ی «چیریکۆڤ»، وەک «قیریش – دەبەن» و لە «سەیاحەتنامەی حدوود»ی «خورشید ئەفەندی، تەرجەمەی «گەمەزۆڤ»، ل٣٩٣ دا، وەک «قیرەژ – دەبەن» هاتوە.

١٠٠) ناوی شاخی «ئەرقەتی» کە کەسرەوی ئیشارەی پێدەکا (بەو گۆڕانکاریە ئەمرۆییەی بە تەرتیب لە

«ئه ـ و» دوه بۆ «ئه ـ ی»)، دەبێ ئەرقەتوو بێ بەواتای «پێوەندیدار بە فێڵەوە»یا «فیـڵبازی لە شەڕ دا». بەراوردی بکە لەگەڵ «اَرغـجااُوت» بەواتای «گـۆڕینی قسـە» و «فڕ و فیـڵبـازی لە شـەڕ دا». لە ڕاپۆرتی «میرخواند» لە مەڕ لەشکرکێشانی «ئولغ بەگ» لە مەغۆلستان.

١٠١) [مینۆرسکی وەک «تەرەقە» (Taraqa) ی نووسیوە].

١٠٢) لەم بەشەدا، ئێمە هەروەها هێندیک ناوچەی هاوسێشمان خستۆتە بەرچاو کە کەوتوونەتە لای باشوور و ڕۆژهەڵاتی مەڵبەندی موکریانەوە.

١٠٣) [مینۆرسکی ئەم ناوەی لە شێوە فارسییەکەیدا، واتە بووکان تۆمار کردوە (Bukan)].

١٠٤) [گەرچی بۆکـان لەسـەر چۆمی تەتەهوو هەڵکەوتوە بەڵام مـینۆرسکی، شوێنایەتی جـوگرافیـایی شارەکەی بە پێوانەی جەغەتوو پێواوە.]

١٠٥) دابەشکردنی سیسـتـمی ئیداری ئێران لە سەرەوە بۆ خوار، بەم چەشنەیە: ئوستـان، شەهرستـان، شەهر، بەخش، دێهستان، دێهـ].

١٠٦) [من بۆچوونی مینۆرسکیم سەبارەت بە «وجە تسمیە»ی بۆکان پێ ڕاست نییە و لام وایە بۆکان لە پێوەندی خودای «بەک»یا «بەغ» دا ناونراوە کە خودای هیند و ئێرانییەکان بوە پێش ئایینی زەردەشت و هۆی ئەم ناونرانەش دەبێ ئاورگەیەکی گەورە بووبێ کە دانیشـتوانی ئەودەمی شار لە شوێنی ئێستـای «قـەڵای سەردار» بۆ خـودای «بەغ»یان دروست کـردبێ. بڕوانە: ئەنوەری سوڵتـانی، «چەند تێبینییەک لەسەر ناوی شاری بۆکان»، گۆڤاری مامۆستای کورد، ژمارە ١٠، پاییزی ١٩٩٢].

١٠٧) گوندەکـانی دەوروبەری بۆکـان بە سـەر سێ دێهسـتـاندا دابەش کـراون: «ئەختـاچی ڕۆژهەڵات»، «ئەختاچی ڕۆژئاوا» و «بێهی».

١٠٨) [ئەم نـاوەش بەبڕوای من پێـوەندی بە خـودای «بەغ»ـەوە هەیە و دوور نیـیـە پێـشـتـر وەک «بەغاباد»یا «بەغاوا» گوترابێ.]

١٠٩) [ئەم ناوەش بێ پێوەندی نییە بە خودای «بەغ»ـەوە. لەبیری نەکەین کە بەغستان یا بێهستان یا بێستوون، ناوی کێوی یەزدانی سەردەمی دواتر واتە «ساسانیان» بوە].

110) Bä'i

111)Uryäd

112)Kucha

١١٣) باش دەبوو ئەگەر ناوی هەر چوار هۆزەکەمان بزانیبایە کە یەکیان بە دڵنیایی دەزانین «ئۆیرات»ـە.

114) JRGS

115) Khanikov, "Map of Azerbayjan", Zeit, F. Allgem. Erdkunde, XIV, 1893, map III

116) Burkhan



117) Shakmuni Burkhan

118) ÇAKYAMUNI BUDDAH

[لە عیبارەتی «پەیکەری بودا» وە، دەردەکەوێ کە دوور نییە پەیکەرێکی بوودا لەو شوێنە دانرابێت. وەرگێڕ].

١١٩) ناوی «سریل» (SIRIL) کە لەو نزیکانە هەڵکەوتوە، یەکجار نادیارە و زۆریش دووربینانە نابێ ئەگەر لەگـەڵ «شـاریل» (SHARIL) ی مـەغـۆلی بەراوردی بکەین، بە واتـای بەشـێک لە کـەلەپووری ئایینی بوودا؛ بڕوانە ڕشـیدالدین، چاپی جۆن (پراگ)، ل ٦٧، [دەبێ نیـازی مینۆرسکی گوندی «سریل ئاوا» لە ناوچەی بۆکان بێ].

120) Sunjaq

١٢١) [ئەم گوندە کەوتۆتە باشووری بۆکان و مینۆرسکی لە شێوەی «توبوت »یدا نووسیوە Tubut].

١٢٢) [لە نزیک بۆکان].

١٢٣) بڕوانە: ڕشـیـدالدین، چاپی بەرەزین، ب٧، ل٨٢ لە باسی سـەرۆکـەکـانی «چەغـان ـ تـاتار» واتە تەتەرە سپییەکان لە ئێراندا.

١٢٤) [گوندیکە لە ڕۆژئاوای بۆکان و نزیک «ئاخ تەتەر»].

١٢٥) «قـەرەلەر» یێکی دیکە لە نزیک «کـەڵخـۆران»ی ئەردەبیل (ئەردەوێڵ) هەیە. [قـەرە، خـۆی لە بیچمی قەرەمۆسالیان»یشدا دەنوێنێ کە گوندێکی نێوان بۆکان و میاندواوە].

١٢٦) [میان ـ دوو ـ ئاب].

١٢٧) [دوای سـاڵی ١٩٨٠، ناوی شـارەکە سەرلەنوێ کرایەوە «سائین قـەلعە» کە خەڵکی ناوچەکە بە کورد و ئازەرییەوە «سایین قەڵا»ی پێدەڵێن و ئێستا سەر بە «میاندواو» ە نەک مەراغە].

128) Sa'in

129) Popular

130) Hoyin-irgen

١٣١) [هەمـوو دێهسـتـانی تورجان لە ساڵی ١٩٦٣وە لە بۆکان جیاکراوەتەوە و کەوتۆتە سەر «سەقز». من خۆم لە کـاتی ئەم ئاڵ و گۆڕە دا لە گوندی باغلووجەی عـاید بە «تورجان»، مـامۆستـا بووم و کەوتمە سەر سەقز. وەرگێڕ].

١٣٢) [مینۆرسکی بەشێوە فارسییەکەی واتە «شیلان ئاباد»ی نووسیوە].

١٣٣) [خەڵکی ناوچەکە پێی دەڵێن «ییێل تەمر»].

134) Tokhta

135) Tokhtoghä

136) Bayäut





137) Toqtä

١٣٨) [خەڵکی ناوچەکە پێی دەڵێن «شیلاناوێ»].

١٣٩) ژووری لە بەرد تاشراوی کۆنی «فەقرەقا» کەوتۆتە نزیک «ئیندرقاش»ـەوە.

١٤٠) [ناوچەی سولدووز (سندووس) تەنیا لە قەرەپاپاخ پێک نەهاتوە و ئێستاش هەر کوردی تێدا نیشتەجێن، واتە کورد و قەرەپەپاخ ژیانێکی هاوبەشیان لەناوچەکەدا هەیە].

141) Sir R. Porter

142) Sir A. Stein, Old routs, 324-46.

١٤٣) لە باشوری مەراغە. بڕوانە: شەرەفنامە، ب١، ل ٢٩٤. بەرواڵەت «ساریق قۆرغان» [لە زاراوەی ئێستای خەڵکی ناوچەکەدا، «ساری قۆرغان»]ە لە ناوچەی تیکاب (بەرەسمی «تیکان تەپە»، لەسەر رێگای سایین قەڵا بۆ بیجار).

144) Kereftitskaya

١٤٥) مینۆرسکی لە شێوەی «هۆیاتوو»یدا نووسیوە.

١٤٦) دەبێ بزانرێ ئایا ئەم شێوەیە، بەتەواوی دەستکردە یا خود زەمینەیەکی زمانناسانەی مێژوویی هەیە. بڕوانە:

Pelliot,"Les mots à H initiale, aujourd'hui amuie J. As, avril, 1925, 193-263.

بە لەبەرچاوگرتنی /هـ/ و «توو»ـەکەی ئەم ناوە، ئەستەمە بتوانێ لە «ئۆبە»ی تورکییەوە وەرگیرابێ کە مانای «کۆخی لبادین»ی هەیە.

147) Uyghur

148) Marcus

149) Kereit

150) Marghüz Buyurug - Khan

151) Tamüqa

152) Bärin

153) Toguchar

154) Tughächär

155) Karachar -ov

156) Bilina

157) Arghun Khan

158) "Roi de France"(irad barans)

159) W. Kotwicz



١٦٠) سولدووز شێوەی تورکییە بۆ «سولدووس»ی مەغۆلی. بڕوانە: رشیدالدین چاپی بەرەزین، ب ٧، ل ٢٢٤. لە کوردیشدا وەک «سوندووس»یا «سندووس»ی لێهاتوە. بڕوانە ئوسکارمان:

O. Mann,"Die Mundart der Mukri-Kurden, 1906, 15, 282, etc.

161) Mukri

162) Moukri

163) H. W. Hausing, "Theophylakts Exkurs über die skytischenVölker", Byzantian, XXIII, 1953, 282 etc.

164) Taviat

165) Mauricius

166) Mu-ki(wu-ki?)

167)Mo-ho

١٦٨)?Tunguz[بێ سوود نییە بگوترێ گوندێک بەناوی «دونگوز» کەوتۆتە بەشی رۆژئاوای بۆکانەوە].

169) Chavannes,"Documents sur les Tou-kiue occidentaux", 230 etc.

170) Haussig

171) Murkit / Markat

172) «هاوسیگ» لە پاشکۆی [کتێبەکەی] خۆیدا، ل ٤٣١، «مووکری» بە شێوەی «مووکەی» دەنووسێتەوە و ئەمەش رەنگە ئیشارە بێ بە دراوسێکانی «تەبغەچ» کە «مو ـ کوان»یان پێدەگوترا و ناوەکەیان زیاتر رووبەڕوو دەبێتەوە لەگەڵ وشەی مغولی «موغەی» بە واتای «مار». ئەمەش خۆی مەسەلەکە ئەوەندەی تر ئاڵۆز دەکات.

173) Bretschneider,"Medival researches",1,28

174) Mo - K'o - li

175) Mekrin

176) M.krit, M.rkit

177) M.krin, B.krin

١٧٨) بەراوردی بکە لەگەڵ:

Plano Carpini, ed. C. R. Beazley, 1903, 80

هەروەها لەباسی جیاوازی نێوان «مەرکەت» و «مەتریت» دا بڕوانە:

ed. Risch, 1930, 109, Merkit and Mecrit

لەم دوانە، یەکەمیان بوتپەرست و دووهەمیان مەسیحی بوون.

١٧٩) تۆ بڵـێـی هەردوو تاقـمی M.krin /B.krin و M.ikrit / M.rkit لە بنەڕەتی هەمـان «تونگوز»ـەکان نەبن؟

١٨٠) روون نییـە ئایا ئەمـە دەگـەڕێـتـەوە بۆ زێدی کـۆنی «ئۆیغـور»ەکـان لە «ئۆرخـون»یا بۆ دوایین پادشاهی لە نزیک «تێن ـ شیـان». بڕوانە رشید، ٧، ٦ ـ ١٦١ ئەو فەسڵەی کەلە «بکرین» دەدوێ و بەشوێنیدا فەسڵێک دێ کە باسی ئۆیغورەکانی تێدا کراوە.

١٨١) هەرچۆنێک بێ، فەرهەنگی جوگرافیایی، ٤، ٤٩٢ دەست بۆ «مەرقید» ێک رادەدێرێ لەنزیک شاری «مەرەند» و یەکی دیکە لەسەر جادەی «تەوریز» بۆ «ئەهەر» ە.

١٨٢) بڕوانە:

Histoire de Mar Jabalaha III, tr. by Chabot, 1895, ch. XVIII, pp. 122 - 30, 152 - 77.

هەروەها، بڕوانە:

Sir. E.A. Wallis Budge,"The monks of Kublai Khan, 1928, 230 - 260, türäye Kaya-jiye

183) Naurüz ?

١٨٤) «نظام الدین شـامی» (چاپی Tauer، ل٢٨٢)، بە چاوی خـۆی کـردەوەی «مکریت»ی بینیـوە. شرف الدین، ظفرنامە، ٢، ٥٢٧، ستایشی «مکریت» دەکا کە «بۆ چیابڕین، وێنەیان لە جیهـاندا (از قاف تا قاف) نەبوو».

185) Zarzari

١٨٦) شەرەفخان. وێناچی شتێکی لەمەڕ «هەزبانی» (خەڵکی هەزبیب» وەکوو «ئەدیەبەنە ـ ئەربەلا») زانیبی و فەسڵی «زەرزا» ش لە هیچکام لە دەستنووسەکانی کتێبەکەیدا دەرنەکەوتوون. لەمەڕ هەزبانی بڕوانە:

Minorsky, Studies in Caucasian history, 1953, 129.

١٨٧) بڕوانە:

Quartremére,"Notices et Extraits, XIII,1838, 300 - 29.

١٨٨) جیاوازی کۆتایی وشەکان، بەهۆی پاشگرە مەغۆلییەکانەوە واتا دەکرێتەوە. دەنگی / ن/ ی دوایین وشە لە مەغۆلیدا بە هاسانی وەلا دەنرێ و «مۆرین» دەبێ بە «مۆری»، دەنگی /ت/ ش نیشانەی کۆیە لە ئاخری وشەدا. تیرەیەک (پێوەندار بە «کوکلان» انە تورکمەنەکان) هەن کە ناوی «موکری»یان لەسەرە. بڕوانە:

G. Jarring,"On the distribution of Turk Tribes in Afghanistan, Lund, 1939, 39.

(لەزمـانی «تۆمـانۆڤـیچ»ـەوە). هەروەها گـوندی مـوکـری لە «ئامـو-دەریا»، بەشی باشووری «کـەرکی» دەبینرێ. بیـچمی مـوکری چ بنەڕەتی بێ و چ (لە ژێر شوێن تێکرانی سەرەتایەکی دەنگی لێویی دا) دا، تووشی ئاڵوگـۆڕ هاتبێ، بۆ کـارەکـەی ئێـمـە رێ نیـشـاندەرێکی بەکـەڵکە. ئایا ئەو موکـرییـانە لقـێکی «قـەیەچی»یەکـان بوون؟ من ناتـوانم بڵـێم کـە ناوی هۆزی «مـورکـوت»ی ئۆزبەک کـە بە گـوێرەی گـوتنی «خانیکۆف»:

Khanikov, Opisaniye Bukharskogo Khanstva, Spb., 1843, 61

لە «بوخارا» دەژیان، ئیشارە بە هەمان عونسور دەکات یاخود بە «مەرکیت»؟

١٨٩) لە «قەزا»ی «سەرا»ی تورکیا (رۆژئاوای «قـوتوور»ی ئێران) دەتوانی هۆزێکی بچووک بدۆزییەوە کە ناوی «موقوری»یە. بەگوێرەی قسەی «سایکس»:

Sir. M. Sykes,"The Caliph's last heritage, 1915, 564.

«ئەم موکـری یانە (V. M پێـشـوو) دەگوترێ پەنجا ساڵ لەمەوبەر هاتوونەتە ئێران». ئەم بۆچوونە، زۆر روون نییە و لەوانەیە سەرمـان لێ بشێـوێنێ. «مەحمـوود افندی بایەزیدی» کورد کە یارمـەتیدەری «ژابا» بوە:

(Notices et recits Kurdes. St Petersburg, 1860, Kurdish text, p. 5)

ناوەکە وەک «مقـری» دەنووسێ و دەڵێ: ئەم تیـرەیە سەر بەهۆزی «شکاک» (شەککاک) ن. «مـوقـوری» بە ٢٢٥ کیلۆمیتر و هەروەها بەهۆی گەلێک شاخ و کێوەوە، لە نزیکترین شوێنی خاکی «موکری» دوورن و ئەگـەر بەڵگەی مێـژوویی بەدەسـتـەوە نەبێ، هاسـان نییـە ئەم دوو هۆزە بە هیچ چەشنێک بەیەکـەوە پێوەندی بدرێن.

190) Die Mundart, I, p. XVIII: "Die ackerbauenden Klassen, die ra'iyat, nennen sich grössenteils zum Stamme der débokri gehörig und man darf wohl vermuten, dass diese Débokri, welche in grösseren Massen die östlichen Teile des Mukrilandes, den Distrikt Shar-wérän, und die nach Mian dü-ab hin gelegenen Täler des Tataû und Ja-gatû bewohnen, die Reste der einstigen Bevölkerung darstellen, die von den stammes und sprachverwandten Mukri aus dem Besitze verdrängt worden ist".

١٩١) لە فەرهەنگی جوغرافیایی ئێراندا، بەهەڵە «دیهبوگر» نووسراوە.

١٩٢) لەشاری «بەم»ی کرمان، گوندێک بەناوی «دیهبەکری» هەیە کە دانیشتوانی بە فارسی دەدوێن. ف. ج. ب٨، ل١٦٩ [لەبیرمان نەچێ کە زانیارییەکانی «فەرهەنگی جوغرافیایی ئێران» زۆر ناتەواون و روانگەی رەسمی دەوڵەتی رەزاشا دەخەنەڕوو. هەر لەو شوێنی «کرمان» و «موکران»ـە، هێندێک گوند و ناوچەی بچـووک هەن کـە ئێـسـتـاش هەر بە زمـانێکی جیـاواز لە فـارسی دەدوێن یاخـود پاشـمـاوەی زمانەکانی تر و واهەیە کوردی، بە ئاخافتنی ئێستایانەوە دیارە. وەرگێڕ].

193) Qawalisi

١٩٤) من توانای ئەوەم نەبووە بەدڵنیـاییـەوە بنەڕەتی بنەمـاڵەیەکی رووسی بەناوی «بلـباکـۆڤ» روون

بکەمەوە کە دەزانم کوردی نییە بەڵام دوور نییە ئاماژەیەک بە خزمایەتی تورکی و مەغۆلی بکا.

195) Clan

196) Mangit

197) Mangqüt

198) Mangütay

199) Manguday

٢٠٠) جیاوازی نێوان / گ/ و / ق/ خۆی موشکیلە دروست دەکات.

٢٠١) ناوی گوندی «سوێسناوا» لە دەرەوەی مەڵبەندی موکری ـ لە ناوچەی «مەرگەوەڕ»ی ڕۆژئاوای ورمێ نیشانەی کۆڵۆنییەکی هەمان هۆزە.

٢٠٢) بڕوانە: نامەکانی رشید الدین چاپی م. شافی. ل١٧٧، باسی «هەربەتان».

٢٠٣) بڕوانە: حافظ ابرو، چاپی بەیانی، ل٦٠ کە دەڵێ: ئەمیر «ئەلغوو» هێرشی بردە سەر «ئەبوو سەعید»... هتد.

٢٠٤) رشید، چاپی بەرەزین، بەرگی٧، ل١٦٣: بەرچووق، سەرۆک هۆزێکی ئۆیغورو... هتد.

٢٠٥) بڕوانە: گۆڤاری قوتابخانەی توێژینەوەکانی رۆژهەڵاتی و ئەفریقایی، بەرگی١٠، (٣)، ١٩٤١، ل ٧٨٦.

٢٠٦) زۆر کچە شازدە و ئەمیرزادە ناویان «بولـ (ـە) غەن» بوە بەواتای سمۆرەی رەش.

٢٠٧) رشید، چاپی بەرزین، بەرگی٧، ل٥٩.

٢٠٨) «مێژووی مظفرییەکان»، G. M. S، ١٤، ١، ٦٤٢، لە باسی شەڕی ئەمیر موزەفەر لەگەڵ مەغۆلە «ئەوغان»ـەکاندا (لە ئەفغان جیاوازن) دەڵێ ئەوانەی دوایی «جالیغ» یێکیان بوو کە بە شێوەی مەغۆل دەیانپەرست و قوربانییان بۆ ئەو بوتانە (کذا) دەکرد. هەروەها بڕوانە «چالیق»ی نزیک «ئەهەر»(٢): «رادلۆف»، لە بەرگی٣، ساڵی ١٨٨٤دا، وشەی «چەلوو» بە «دەفەی بوت» مانا دەکاتەوە (ئاڵتای).

٢٠٩) «ساتی بەگ»ی کچی ئولجایتو لە ساڵانی ٩ ـ ١٣٣٨زایینیدا حکومەتی کرد. بڕوانە: «تاریخ گزیدە، ل٦٠٦؛ هەروەها ئەمیریکی «جەلایری» بەناوی «ساتی بەهادور» (دەوروبەری ٧٦٥ ـ ١٣٦٤) [لاپەڕە] ٦٩١ی هەمان کتێب].

٢١٠) واهەیە «گوتەن»ی تورکی بێ، بەواتای حەوشی مەڕ و ماڵات.

٢١١) بڕوانە: تاریخ گزیدە، ل ٥٣٣: «مەنگو تیموور»ی کوڕی «هولاکو». هەروەها بڕوانە: حافظ ابرو، چاپی بەیانی، ل ١٣١و١٣٤: ژنی ئەمیر چوپان.

٢١٢) نووسینی لە فەرهەنگی جوغرافیاییدا، بەرگی٤، ل ٤٤٠، بە شێوەیەکە کە دەنگی /وی/ بنوێنێ بەڵام نزهت القلوب، ل ٨٢ وەک «کوویی» دەنووسێ. کوویین («کوی ئین»ـەکان لقێکی هۆزی تاتار بوون



و رشید، چاپی بەرەزین، ٧، ٨٢، ناوی «کوی ئین» یێکی زۆر دەبا لە ئێراندا).

٢١٣) رشید، چاپی بەرەزین، بەرگی٧، ل٢٥٣ باسی مەنقوت ناوێک دەکا کە باوکی «قوتلوغ شا» بوە.

٢١٤) هۆزی «ئۆغوز» کە لەگەڵ «سەلجووقی»یەکاندا گەیشتبوونە ئازەربایجان و لە سەدەی ١٥دا، برا تورکمانەکانی خۆیان بەهێز کردبوو، لە لایەن حاکمانی«قەرە ـ قۆیونلوو و ئاق ـ قۆیونلوو» هوە لە ئەرمەنستان کێشرانە دواوە.

٢١٥) [کەند] لەبنەڕەتدا [وشەیەکی] «سوغدی»یە! تورک دەبێ ئەم وشەیان لە ئاسیای ناوەندییەوە هێنابێ. وشەکە تەنیا لە ئازەربایجان و ئەوپەڕی قەوقاز دەبێتە زاراوەیەکی گشتی.

٢١٦) «سوورەپونگان» بە واتای درووی سوور، شلێر بەواتای رووەکی «تاجی شاهی» (بڕوانە سەرەوەتر)و... هتد.

217) Sargis

218) Dinha

219) Salos

220) Bem-surta(bem-zurta)

بڕوانە: راولینسن، هەمان، ل ١٧ کە هەندێ لەم ناوانە بەناوی چەند قەشەی نەستووری ناوچەکە پەیوەند دەدات وا لە سەرچاوە ئایینییەکاندا ناویان هاتوە (Assemani, Bar Hebraeus). هەروەها بڕوانە «قەلعەکۆکە» لە «لاهیجان» و ناوی ئەو کلیسەیەی وا یەبەلاها لە بەغدا دروستی کرد. وەرگێڕاوی Chabot، لاپەڕە ٣٠ و ٤٢.

221) Shmola(shamu'ila)

222) Shilman

٢٢٣) Siyauma (siyämä)، ئەم ناوە لە فەرهەنگی جوغرافیایی ئێراندا نییە.

٢٢٤) هەروەها «بێتاس» لە «یێڵ تەموور»، «بێکووس» لە«مەنگوڕان»، بەڵام جیاواز لە«بێژوێ» ـ کە وەک کوردی دەچێ (گوندێک بەم ناوە لە ئالان [ی سەردەشت] و یەکی تر لە شنۆ هەیە). [بێوران = بێوری سەروو و بێوری خواروو لە سەردەشت. وەرگێڕ].

255) Alöt

٢٢٦) Arbanüs [مینۆرسکی ئەم ناوەی بۆ روون نەبۆتەوە، ئەربەنووس ناوی گوندێکی دەوروبەری بۆکانە. وەرگێڕ].

227) Dunes

228) Gagash

229) Lagiz

230) Nalös

231) Narzames

232) Teyet

233) Surikash(Saqqiz?)

234) Tirkash

٢٣٥)[مینۆرسکی لە شیوەی «تەرکاشە»یدا نووسیوە] Tarkasha

236) Tikrish

237) L. Waterman,"Royal Correspondence", Michigan, 1930, 231.

٢٣٨) بڕوانە سەرەوەتر.

239) Tir-kash

240) Suri-kash

241) Parsua

242) Persians [فارسەکان؟]

243) Läruete

244) Par-su-ash

245) Niriz

246) Ni-rezh

٢٤٧) «نیریز»ی فارس لە نزیک دەریاچەی «مهارلو» ش هەر لەو بابەتەیە.

248) Missi

249) Menua

250) Meishtakha

٢٥١) [ئەم بەردنووسە] هەر زوو لە سەردەمی راولینسن دا(هەمان سەرچاوە، ١٢) بەشی زیاتری لەناو چووبوو. میسیۆنێر(موبەشیر) ێک بەناوی «فەیبر» Faber بەبێ ئیحتیاتی لەجێی خۆی گوێستەوە و لەت و پەتەکەی ئێستا لە مووزەخانەی بریتانیایە و نووسراوەکەشی لەلایەن «و. بیلک W. Belek »ەوە تەرجەمەکراوەتەوە. بڕوانە:

C. F. Lehmann-Haupt, Corpus inscriptionum Chaldicarum, Textband, 1 Lief, 1928, p. 45, No.20.

252) Melkishvili, Vest. drev. istorii, 1949.

253) Daryäs

254) Dariausa

255) Sirgan



256) Sincär

257) N. V. Khanikoff, Melanges Asiatiques, 3,1859, 76.

258) Singän

٢٥٩) بڕوانە:

Minorsky,"Roman and Byzentine campaigns in Atropatene", BSOAS, XI, 2, 1944, 244-5

لە وتارەکەدا دەبی لەجیاتی Theophanes بە Theophylact بخوێندرێتەوە، لاپەڕەی ٣١٧:

«لەو گۆلە نزیکە و هەر لە نزیک ئەوانیش ... ئەو خەڵکەی وا لەوێ دەژیان پێیان دەگوترا سیراگەنوون».

٢٦٠) [نیاز لە «ئێرانی»، «ئاری» بوونی وشەکانە بەرانبەر بەو وشانە کە پێوەندیان بە زمانە «پێش ـ ئاری»یەکانەوە هەیە. وەرگێڕ].

261) identity (هەوێتی)

262) Siraganön

263) Ecbatana

264) Pharaspa

265) Aganzana

266) BSOAS, XI, 2, 261.

267) Sinna

268) Sisar

٢٩٦) «بەتلەمیووس»، «ستڕاتۆ» (Strato) تاریک و نادیارەکەی خۆی لای رۆژهەڵاتی «دەریاوسا» ـ «سنکەر» دادەنێ کە لەو شوێنەدا لە سەرچاوەی باشووری «ئەمەردووس» (Amardus) دەچوون. ئـ . هونیگمەن (E. Honigmann)، «ستڕاتۆ» بە شوێنی «هەرهەزپەی Harhaz-pey» دادەنێ لە مازندەران!

270) Unmismatics

271) Epigraphy

# لەشکرکێشانی رۆمی و بیزانسییەکان بۆ سەر « ئاترۆپاتەن »*

**بەشی یەکەم:**

**لەشکرکێشانی بیزانس، دژی بەهرامی چۆبینە (٥٩١ ز)**

**بەشی دووهەم:**

**لەشکرکێشانی هیراکلیۆس (٦٢٦ و ٦٢٨ ز)**

**بەشی سیهەم:**

**جادەی دینەوەر ـ مەراغە**

**بەشی چوارەم:**

**ئاورگەی شیز**

**بەشی پێنجەم:**

**لەشکرکێشانی ئانتۆنیۆس (٣٦ پ.ز): فرەئەتە، ویرا**

**بەشی شەشەم:**

**گۆلی چیچەست**

تەنگ و چەڵەمەی ناخۆشی جوغرافیای کۆن، دۆزینەوەی شوێنایەتی ئەوجێگە





دوورەدەستانەی ئاترۆپەتان (ئازەربایجان) ـە، کە ئانتۆنیۆس (٣٦ پ.ز) و هەروەها خوسرەوی دووەم، لە ٥٩١ زایینی و ئیمپراتۆر هیراکلیۆس (لە ٦٢٤ ـ ٦٢٧ی زایینی) پێیدا تێپەڕ بوون.

مێجەر هـ.س (دواتر سێر هێنری) راولینسن، لە «یادداشت لەمەڕ شوێنی ئەکبەتەنەی ئاترۆپەتان»[2] دا، ئەم پرسیارەی خستۆتە بەر لێکۆڵینەوە. نووسەر لە کاتی نووسینەکەدا، تەنیا سی ساڵی تەمەن بوە و ژیانێکی پڕ هەوڵ و تێکۆشانی سەربازی بردۆتە سەر، لە گەڵ ئەوەشدا، کارەکانی نەک هەر روانگەیەکی روون بۆ داوەری کردنی تێگەیشتوانەی نەخشەی ناوچەکە دەخەنە بەرچاو، بەڵکوو بە هۆی کۆکردنەوەی سەرنج راکێشی بەڵگە کلاسیک و رۆژهەڵاتیەکانەوە، بایەخێکی زۆریان هەیە.

تێزی سەرەکی راولینسن لەمەڕ هەبوونی ئەکبەتەنەی دووهەم، زۆر زوو رەخنەی لێ گیرا[3]. بەڵام بۆ شیکردنەوەی لەشکرکێشیەکان و ئەو گرینگایەتیەی وا بە شوێنیایەتی «تەختی سولەیمان» ی دەدا، بۆ ماوەیەکی زۆر وەک دوا دەسکەوت سەیر دەکرا. تەنیا ئەو دەمە نەبێت کە چاپی بڕواپێکراوی نووسراوەی نووسەرانی کۆن [ی ئەورووپی] و دەقی زیاتری عەرەبی و فارسی لە چاپ دران و گومان لە تەنیا خاڵێکی بۆچوونەکانی راولینسن کرا[4] گەرچی گەلێک لە پسپۆرانی زانا نەیانتوانی بەگژی دوایین بۆچوونەکانیدا بچنەوە[5].

بۆ چارەسەر کردنی ئەو تەنگ و چەڵەمانەی لە لایەن راولیسنەوە کەوتوونەتە بەر توێژینەوە تا ئێستا هیچ هەنگاوێک نەنراوە، بەڵام ئەو نیشانانەی لە بەردەستماندان، داکۆکی لە تێزە سەرەکیەکانی راولینسن (ل ١١٣) لە مەڕ هەندێ ناوی جۆربەجۆری وەک "فرەئەتە"، "پرە ئەسپە"، "ویزە"، "گەزە" و "گەزەکە"»[6] دەکەن ... [و هەر هەموویان] ئاماژەن بە تەنیا یەک شار، کە ئەو، دواتر (ل ١٤) بە تەختی سولەیمانی دەزانێ.

سەرچاوەکان لە مەڕ "گەزەکە"، ئاورگە و... هتد، چەند جار بە شێوەیەکی سیستەماتیک هەڵسەنگێنراون[7]. ئەوەش، توانای ئەوەمان دەداتێ لە عەینی کاتدا "بە هۆی هەڵگێڕانەوەی خاکی کۆنەوە، دانەویڵەی تازە بڕوێنێ" و زەین بدەینە مەسەلە گرنگەکان.

بە هۆی ئەو راستیەوە کە تۆمارە بیزانسیەکان، زیاتر و روونترن، سوودیکی بەرچاوی دەبێت ئەگەر سەرەتا باسی ئەوان و ئینجا باسی لەشکرکێشانەکەی ئانتۆنیۆس بکرێ.

## لەشکر کێشانی بیزانسیەکان دژی بەهرامی چۆبینە

سەرچاوەیەکی رۆژئاوایی کە بە دوور و درێژی باسی ئەو لەشکرکێشانەی کردبێت، «تیئوفیلاکت سیموکەتە» [٨] یە (چاپی بۆن، لل ٢٠٤ ـ ٢٣٨). ناوبراو، لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی هیراکلیۆس [٩] (٦١٠ ـ ٤٠ ز) دا ژیاوە و رووداوەکانی سەردەمی پاشایەتی «موریس» [١٠] (٥٨٢ تا ٦٠٢ ز) ی تۆمار کردوە. تیئۆفیلاکت دەبێ شوێنی راپۆرتێکی رەچاو کردبێت کە یەکێ لە ئەندامانی سوپاکەی تێیدا باسی هەندی هەڵەی ئێرانیەکانی کردوە و لە شێوەی هەڵس و کەوتی خوسرەو لە گەڵ هاوپەیمانەکانی رازی نەبوە.

لە ساڵی حەوتەمی پاشایەتی موریسدا (٥٨٩ ز)، خوسرەوی دوهەم[١١] تووشی راپەڕینی بەهرامی چۆبینە[١٢] هات و پەنای بردە بەر بیزانسیەکان. لەسەر داواکردنی ئەو، ئیمپراتۆر فەرمانی بە جەنەڕاڵی خۆی ـ نەرسیس[١٣] دا بە خۆی و سوپایەکی دیاریکراوەوە، لە گەڵی بکەوەن[١٤]. هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا، دەبوایە خاڵی خوسرەو، واتە «بندووە» [١٥] بە یارمەتی «جۆن»[١٦] ـ فەرماندەری ئەرمەنی، لە باکووری رۆژئاواوە هێرش بەرنە سەر ئێران.

مەسەلەی گۆڕەپانی [شەڕی] خوسرەو و نەرسێس لە لایەن راولینسن (لل ٧١ ـ ٧٨) و «هۆفمان»[١٧] (ل ٢١٧) ـەوە، شی کراوەتەوە. هاوپەیمانەکان، لە «ماردین» و «دارا» وە هاتن و دیجلەیان لە شوێنی دیناداڤۆن [١٨] تێپەڕ کرد. (راولینسن، ئەم شوێنە بە وێرانەکانی «نمروود»[١٩] دەزانێ). ئینجا لە «زێی گەورە» [٢٠] پەڕینەوە.

لەشکر لە رۆژی چوارەمدا گەیشتە «ئەلێکساندریا»[٢١] (راولینسن: هەولێر). رۆژەڕێیەکی دیکە گەیاندیە شوێنێک بە ناوی کلیما گزنێتاس[٢٢] (سوریانیەکەی «حنایثا»[٢٣] یە). ئەو ناوە لە باسی لەشکرکێشانەکەی هیراکلیۆسدا، بە شێوەی «گزانەیثا»[٢٤] نووسراوە (تیئۆفان[٢٥] چاپی de Boor، ل ٣١٧). شوێنەکە بێگومان، لە باکووری هەولێرەوە دەست پێدەکات (واهەیە لە دۆڵی «بەستوورە»[٢٦] وە) ـ گەرچی پانتایی ناوچەی ئوسقوفایەتی «حنایثا» هێشتا روون نیە (هۆفمان، ٢١٦ تا ٢٢٢).[٢٧]

کاتێ بەهرام بەو هەواڵەی زانی کە باڵی راستی هێزەکەی «جۆن» لە هەولی بڕینی زێی گەورە دایە، پردی خوارەوەتری داگیرکرد. لێرەدا، نەرسیس فەرمانی دا هاوڕێکەی خۆی «رۆفینوس» [٢٨] بوارەکەی دیکە (واتە دیاڤاوسیس)[٢٩] بگرێ. ئینجا خۆی هێرشی بردە سەر ناوچەی «ئەنی سی نی» [٣٠] (بە ولاتی[٣١] «ئەنی سی نۆن»[٣٢]) ی بخوێنەوە و . بە هۆی ئەو راستیەوە کە هاوپەیمانەکان پێشتر گەیشتبوونە سەر لێواری رۆژهەڵاتی زێ، دەبێ نەرسیس ویستبێتی جگە لەو پردەی وا پێشتر گرتبووی، لە بەرەی پشتەوەی خۆشی دڵنیا بێت.

وا وێ دەچێ «جۆن» لە پلانی خۆی بۆ ئەوەی بەلێواری زێ (یا خود بە هێڵی «وان ـ مەروانەن ـ عیمادیە»[٣٣] دا) داگەڕێتە خوارێ، سەرکەوتوو نەبووبێت و ئەم پێک گەیشتنە لە شانی رۆژهەڵاتی زاگرۆسدا روویدابێت.

شوێنایەتی «ئەنی سێنی» هێشتا روون نیە، بەڵام مەزەندەی راولینسن لە مەڕ یەکبوونی «ئەنی سێنی» و «ئەزۆنی» [٣٤] هەندێک سەرنج راکێشە[٣٥]. پلینی[٣٦] بەرگی ٦ ل ١١٨ (لەچاپی Detlefsen ساڵی ١٩٠٤، لاپەڕە ١٥٤دا) دەڵێ «گۆردیائیس» [٣٧] [گوردوینی][٣٨]. هەر چۆنێک بێت، بۆ ناسینەوەی «ئەنی سێنی»، دەبێ بەرەو «رەواندز» چاوی بۆ بگێڕی.

کاتی هەواڵی ئەم هێزەسەرەکیانە گەیشتە بەهرام، سوپاکەی خۆی بۆ باکوور و رۆژهەڵات بەڕێ کرد تا بزانێ هێزی «جۆن» رووی کردۆتە لەشکری نەرسیس یان نا ؟ لە درێژەی ئەم مانۆر کردنەدا، گەیشتە «زەریاچەیەکی دیاریکراو» (گۆلێکی نزیک)[٣٩] کە تەنیا دەتوانێ گۆلی ورمێ بێت. [٤٠] ئینجا جۆن لە سوپای بەهرام جیا کەوتەوە (بە هۆی ئەوەوە کە بەرەو باشووری رۆژئاوا داگەڕان) و ئەوەش لە شوێنێکی نزیک سۆڵدووز روویدا.

«جۆن» بەرەو باشوور (روو لە دۆڵی گادەر[٤١]) درێژەی بە رۆیشتن دا ـ [دۆڵی چۆمی گادەر] هەر ئەو شوێنە بوو کە نەرسێس و خوسرەو دوای ئەوەی لە ناوچەی «ئەنی سێنیەن»[٤٢] ـەوە راونرابوون، گەیشتبوونە ئەوێ. جۆن، گەیشتە گوندێک کە بەناوی «سیرەگەنون» ـەوە دەناسرا (لەو نزیکە رابرد... خەڵکێ کە لەوێ دەژیان پێیان دەگوترێ سیرەگەنۆن)[٤٣]. راولینسن، زیرەکانە، توانی ئەم شوێنە لە گەڵ گوندی «قەلعەسینگان»[٤٤] ی ئێستادا، بەیەک دابنێ[٤٥] کە ئەویش کەوتۆتە دۆڵی «شنۆ» وە[٤٦] ـ بەرەو رۆژهەڵاتی جادەکە.

لێرەدا سوپاکان، یەکیان گرتەوە، رێک و پێکیی دوژمنان، ترسی خستە دڵی بەهرامەوە و لە ئاکامدا، رێگەی بەرزاییەکانی گرتە بەر (بە چیادا هەڵگەڕان). واهەیە رووی کردبێتە بەرزاییەکانی باشووری سابڵاخ. خوسرەو ئەرکی پاشەکشێ پێکردنی بەهرامی گرتە ئەستۆ، بەڵام بەهرام تێکی شکاندن و کشاندنییەوە. هەرچۆنێک بیت، بەهرام لە تاو و تینی بیزانسییەکان ترساو هوردووی خۆی کێشایەوە ئەولاتر (تەنیشت) بۆ مەڵبەندێکی ئەستەم

که سواره دەستیان پێ نەدەگەیشت (واتە چیاکانی ناوەندیی «کورتەک» وا چۆمی «کەلۆی» لە «تەتەهوو» جیا دەکەنەوە).

بیزانسیەکان، بە دەشتایی نزیک ئەو شوێنە دا (کذا) تێپەڕبوون کە شاری دەوڵەمەندی «کەنزەکۆن» کەوتبوە ئەوێ. بەهرامیش لەو شوێنەی وا لێی گیرسابوەوە، بۆ ماندووکردنی بیزانسیەکان، هێزی خۆی هێنایە گەڕ. بیزانسیەکان بە خێرایی کەوتنە شوێنی و گەیشتنە سەری. ئینجا بەرەو چۆمی «بەلەرەت» (چۆمی ڤەلەراتۆ، کە «ڤلاراتۆ» ش گوتراوە)[47] چوونە پێشێ. بەیانی ڕۆژێک، پێشڕەوییان کرد و گەیشتنە دەشتاییەکی بەرفراوان. لێرەدا شەڕ دەستی پێکرد و بەهرام شکا. ژمارەیەکی ١٠ هەزارکەسی بیزانسیەکان تەرخان کران بکەونە شوێنی. ماوەی سێ ڕۆژ بیزانیسیەکان لەگەڵ خوسرەو لە نزیک گۆڕەپانی شەڕدا مانەوە[48]. بەڵام ڕۆژی چوارەم، بە هۆی بۆگەن و بۆساری زۆرەوە، مەجبوور بوون بچن بۆ نزیک «کەنزەکۆن»[49] و لەشکری بیزانس لەوێ خوسرەوی بەجێ هێشت.

طەبەری و فیردەوسی هاوچەشنی ڕۆژهەڵاتیی «ئیتۆفیلاکت» ن. «نۆلدکە»[50] و هۆفمان[51]، شاهیدییەکانی ئەوانیان خستۆتە بەر ئەزموون.

(طەبەری، بەرگی یەکەم، ل ١٠٠٠)، ناوی دوایین گۆڕەپانی شەڕی بە «دلڤ» نووسیوە، کە بەڕواڵەت لە: د.ن.ق. دەچێت. فیردەوسی (شاهنامە)، چاپی Mohl، بەرگی ٧، لل ١٤٠، ١٤٢ و ١٥٠ باسی گەیشتنی خوسرەو بەم شێوەی خوارەوە دەکات: "شاه، خەیمەی شاهانەی لە دەشتی «دوک» لێدا؛ سوپاکەی یەکجار زۆر بوو و ڕێباز و شێوازێکی ڕاستەقینەشی هەبوو.

سرا پرده زد شاه در دشت دوک
سپاهی چنان گشن و راهی سلوک

فیردەوسی لە بەشی دواتری [شیعرەکان] دا، بەرگی ٧، ل١٥٠، ئاماژە بە چیایەک دەکات کە هەمان ناوی لەسەرە: «کوەدوک» (کێوی تەشی) کە خوسرەو لە سەر ئەوشاخەوە سەیری شەرگەی دەکرد. وشەی عەرەبی «سلوک» قافیەیە و بۆ وشەی دوک (د.و.ک) هاتوە. بۆی هەیە د.ن.ق (ی طەبەری) بریتی بێت لە خوێندنەوەیەکی هەڵەی وشەی دوک (د.و.ک) بە بنەمای [زمانیی] ئێرانی ناوەڕاستەوە، کە تێیدا، نیشانگەلی /ن/ و /و/ جێگەی یەکتر دەگرنەوە.

ئێمە نابێ وشەی «دوک» وا هاسان بەجێ بهێڵین بەهۆی ئەو ڕاستیەکەوە کە لە ئەلف و بێی عەرەبیدا، گەلێک جار پیتی «ک» و «ل» لە گەڵ یەکدا جێگۆڕکێ دەکەن. لێرەدا



پرسیارێک سەر هەڵدەدات: تۆ بڵێی بە هەڵکەوتیش بووبێت، نوسخەهەڵگرانی دواتر [ی شاهنامە] «دوک» یان لە جیاتی «دوڵ» نەنووسیبێت؟ «دوڵ»[52] یش لە تۆپۆنیمی قوژبنی باشووری ڕۆژهەڵاتی گۆمی ورمێ دا بە باشی ناسراوە.

«راحەالصدور» ، ل ٢٤٤[53] ئاماژە بە «مەنزڵی دۆڵ» دەکات و دەڵێ کەوتۆتە یەک مەنزڵیی "تەورێز" ەوە (مرحله دول به یک منزلی تبریز)، کە سوڵتان مەسعوودی سەلجووقی لەسەرەتای زستانی ساڵی ٥٤٤ (١١٤٩ ز) دا دوومانگ لەوێ مایەوە.

بە گوێرەی نزهت القلوب (کە لەساڵی ١٣٤٠ی زایینیدا نووسراوە)، ل ٨٧، ناوی یەکێ لە شەش مەڵبەندی سەر بە [شاری] مەراغە «گاودۆڵ»[54] ە. (لە لاپەڕە ٢٢٣ دا بە شێوەی «کاودوان» نووسراوە) و چۆمی «مورد»[55] («موردێ چای» ئێستا)، بەوێدا تێپەڕ دەبێت و دەچێتە ناو «جەغەتوو» ەوە (کذا)[56].

«عالەم ئارا»[57]، لل ٥٧٣ تا ٥٧٥، باسێکی دوور و درێژی لەسەر «دزگاودول مراغە» یا قەڵای گاودولی مەراغە کردوە ـ شوێنێک، کە شاعەبباس لەوێوە چوو بۆ چەمەن (واتە ئولانگ) ی «قەرەچبووق»[58] بۆ چاوەدێری کردنی یەڵخییەکانی شاهی. قەرەچبووق (کذا) ی تورک، لە شەرەفنامە[ی بەتلیسی]، ل ٢٨٨دا ئاماژەی پێکراوە و تەنانەت ئەمڕۆش هەندێ خەڵک لە مەڵبەندی نێوان «بناو» و «مەڵکەندی»[59] دا هەن کە ناوی ئەو هۆزانەیان لە سەرە. نووسرانی وشەکە بە پیتی /ل/ و دووپات بوونەوەی بە هەمان شێوە، دژ بەو بۆچوونەی ئێمە دەوەستی کە پێشتر هێنامانە گوڕێ و گوتمان لە گەڵ «ک» دا گۆڕاوە. بەڵام تەنیا لە ڕێگەی توێژینەوەی ڕاستەوخۆی پاشماوەکانی «تۆپۆنیمی»[60] ناوچەکەوە، دەتوانری وەڵامی ئەم پرسیارە بدۆزریتەوە.

ناوەکە هەرچیەک بێت، پێویستە ئێمە شوێنی مەیدانی شەڕ لە «موردی چای» ی دراوسێیدا هەڵبگرین. بەپێچەوانەی [هەواڵی] مستوفی، ئەوی دواتریان [واتە «موردێ چای»]، چۆمیکی سەربەخۆیە، بەڵام بەرەو باکوور دەکشێ و هاوپەرایە لەگەڵ «لەیلان چای» ـ کەئەمەیان دەچێتە جەغەتووەوە. جا بەهۆی گەلێک بەڵگەوە کە «گەنزەک» و «لەیلان» بەیەک دادەنێن، دەگونجێ دەشتی نێوان لەیلان و موردێ چای گۆڕەپانی ئەو شەڕە بووبێت کە تیئۆفیلاکت باسی کردوە.

چیای دوک (فیردەوسی) ڕەنگە بەچیای «مەندیل سەر» بناسرێتەوە، کە چۆمی موردێ چای لە دۆڵێکی ئەو شاخەوە بەرەو دەشتایی دێتەخوارێ[61].

سەرچاوەی سەربەخۆی سێهەم، مێژوونووسی ئەرمەنی «سێ بیئۆس»[٦٢] ـە (کە هاوچەرخی خوسرەو بوە و گۆڕەپانی شەڕ بە «وەرەرەت»[٦٣] دادەنێ (تەرجەمەی Macler، ل ١٩).

نە «تێئۆفان» و نە «سێ بێئۆس» ئاماژەیان بە ئاورگەی شکۆداری «شیز» نەکردوە، لە کاتێکدا نووسەرە عەرەبەکان گەلێکی لە سەر رۆیشتوون[٦٤]. روخساری سەرەکی لەشکرکێشانەکە، چۆمی «ڤەلەڕاثو»[٦٥]یە. ناوێک کە بێگومان لەگەڵ «وەرەرەت» ی ئەرمەنیەکاندا بە یەک دەناسرێتەوە.

تێئۆفیلاکت (چاپی de Boor، ل ٣٢١)، لە باسی لەشکرکێشانی هیراکلیۆس بۆ سەر مێزۆپتامیادا ئاماژە بە چۆمی «ڤەراس روث»[٦٦] دەکات، کە لەگەڵ «بەلەد ـ روز» ی ئەمڕۆدا، یەک دەگرێتەوە. ناوە کۆنەکەی بە ئاشکرا، «بەراز ـ رووذ» ی ئێرانی بە واتای «چۆمی بەراز» ە. لە بەر ئەوەی «روث»[٦٧]ی یۆنانی واتای «رووذ» [٦٨] ی هەیە، ئێمە دەبێ چاوەڕوانی هەمان عونسور لە ناوی چۆمی «ڤەلەراس»[٦٩] یشدا بین. بەڵام بیچمی یۆنانی و ئەرمەنیەکەی، هەردووکیان بە «راث» [٧٠]یارات کۆتایی دێت.

شتێکی نەگونجاو نیە ناوە ئەسڵیەکە لە زاری بێگانانەدا تووشی هەندێ هاسان کردنەوە («لە قەڵەم کەوتن») هاتبێت و ناوەکە لە بنەڕەتدا «وەرەران» بووبێت. («وەرەهران» یش بیچمی کۆنتری «بەهرام» ە. بڕوانە «ئوارارانیس»[٧١]ی بیزانسی، ئاگاثیاس[٧٢] (کە مێژووی ٥٨٢ ی زایینی بەسەرەوەیە)، II، ٢٤)[٧٣].

ئەو گریمانە، لە لایەن مەسعوودیەوە سەلماوە کە سێ جار ناوی «الشیز» و «الران» ی بەیەکەوە پەیوەندی داوە. مەسعوودی دەڵێ: (مروج [الذهب]، ٢، ١٣١)، "ئەفراسیاب «ببلاد السرو والران» کوژرا. هۆفمان، سەرکەوتوانە ئەم ناوانەی لە بیچمی *«الشیز» و «الران» دا ساغ کردۆتەوە و دەڵی: «ئەرەشکی» یەکان[٧٤] (٢، ٢٣٥) شاهی «الشیزوالران» بوون و هەروەها دەڵێ: (٤، ٧٤) لە هەمان وڵاتدا (ببلادالشیزوالران) ئاورگەیەکی ناودار هەیە کە هەندێ بوتی تێدا دانرابوو و نەوشیرەوان لەوێ رایگوێستن، نەوشیروان، هاتە سەر ئاورگەکە، کە ئاگرێکی گەورەی تێدا هەڵکرابوو و بردی [واتە ئاگرەکەی بردە] شوێنێک بە ناوی «البرکە» (گۆل، بەند)".

پاشان جیلەکانی دواتر [ئەم ناوەیان] بە «الشیزوالران» خوێندۆتەوە. لە راستیدا فیردەوسی تاراوگەی «ئەفراسیاب» ی لە «بەردەع» ی ئەوپەڕی قەوقاز دیاری کردوە (ناوچەی «ئەڕڕان» کە بەئەرمەنی «ئەلوانک» (ئەلوانخ) و بە یۆنانی «ئالۆێنیا»[٧٥] ی پێ



دەگوترێ. بەڵام ناتوانرێ شوێنی ئاورگەکە، لە دووجێگەی جیاواز واتە ئەڕڕان و شیز (لە قوژبنی باشووری رۆژهەڵاتی گۆلی ورمێ) دابنرێت.

هۆفمان، بە دروستی «والران» (*والەڕان) ی بە «وەرەرات» ی ئەرمەنیەوە پەیوەندی داوە و بەم شێوەیە رێگەی بۆ وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارە خۆش کردوە کە بابەتی باسی ئێستای ئێمە بێت[٧٦].

دەقێکی دەست تێوەرداوی دیکەش هەیە کە دەتوانێ وەڵامی پرسیارەکەمان بداتەوە. لە ژینـنامەی گرنگی قەشەی نەستۆری «یەبەلاها»[٧٧] (چاپی Bedjan) و تەرجەمەی فەڕەنسی [قەشە] ج.ب. شابۆ[٧٨] لە ل ١١٩ی تەرجەمەدا، راگەیێنراوە کە قەشەی ناوبراو، لە ساڵی ١٢٩٧ ـ ١٢٩٦ی زایینیدا، چۆتە مەراغە و لەوێوە، بە «شەقەتوو» (واتە چۆمی جەغەتوو) و «سیاهکوه» دا گەیشتۆتە هۆردووی شاهی.

قەشەی ناوبراو، لە ساڵی ١٣٠٤ـ ١٣٠٥ی زایینیدا، لە لێواری چۆمێک، کە بە [زمانی] مغولی پێی دەگوترا «جەغەتووی» و بە فارسی پێیان دەگوت «وەکیەروود» گەیشتە لای «ئیلخان ئولجاتیو». بە هۆی «رەشیدالدین»[٧٩] ـەوە (چاپی Quatremere لل ١٠٢ ـ ١٠٣، ٤١١ و ٤١٧)، دەزانین لێواری چۆمی جەغەتوو بۆ مغولەکان زستانەهەوار (قشلاق) ێکی خۆش بوە. هەروەها بە قسەی رەشیدالدین، ناوی فارسی چۆمەکە «زرینەرود» بە واتای چۆمی ئاڵتوون بوە، بەڵام وادیارە نووسەرێکی نەناسراوی مەسیحی، ناوی جوغرافیایی گەلێک کۆنتری چۆمەکە [وەکیەرود] ی پاراستبێت.

وەکیەڕود (؟)[٨٠] بە فارسی هیچ واتایەکی نیە و ئەم ناوە گۆڕاوە واهەیە لە بیچمی «*لەوێش هەروا»[٨١] (وەرەڕود) یا خود «لێرەش هەروەتر»[٨٢] (وەرەنڕود) یا تەنانەت، «لێرەش هەروا»[٨٣] (وەلەڕود) دا بخوێنرێتەوە. بە هۆی ئەو ڕاستیەوە کە من [زمانی] سوریانی نازانم، سەبارەت بەومەسەلەیە لە گەڵ قەشە «ف.ناو»[٨٤] دا راوێژم کرد، ئەویش (لە نامەی ١٧ی جوونی ١٩٢٩دا)، ساغ کردنەوەکانی منی سەلماند. ئەگەر ئەو دەستکەوتانە جێی بڕوابن ئێمە دەبێ بە ئاکامێکی گەلێک قورس و قایم گەیشتبێتین:

«ڤەلەراث»[٨٥] = وەرەران روذ = والران = جەغەتوو.

کەنزەکۆنیش دەبێ لە دراوسێیەتی ئەو هەڵکەوتبێت. بڕوانە سەرەوەتر، ل ٢٥٤ [ی ئینگلیزی].

## بەشی دووەم:

# لەشکرکێشانی هیراکلیۆس

تەرتیبی مێژوویی و شوێنی ڕووداوەکان لە ماوەی سێ جار لەشکرکێشانی هیراکلیۆس بۆ سەر ئێران (کە بۆی هەیە لە ساڵانی ٢-٦٢١، ٦-٦٢٤ و ٨-٦٢٧ دابووبێتن)، تاقمێک موشکیلەی ئەستەمان بۆ دەخوڵقێنن[86].

هەرچۆنێک بێت، شانۆی یەکێ [لەشەڕەکان] بە شەرح و باسێکی زۆرەوە بۆ ئێمە ئاشکرایە، بەڵام هیچ چەشنە ڕاپۆرتێکی متمانە پێکراومان لە مەڕ لەشکرکێشانەکەی پێشتر (٦-٦٢٤) بۆسەر ئازەربایجانی باشووری پێ نەگەیشتوە. پێدا هەڵگوتنەکەی «جۆرجیوس پیزیدێس»[87] ی هاوچەرخی هیراکلیۆس بە شیعر و «بەدیع» ی یۆنانی بەسەرهیراکلیۆسدا، تەنیا چەند ناوێکی ئەوانەی تێدا هاتوە کە لەدەریادا خنکان.

دواتر باشترین شەرح و بەیان، هی «تیئۆفان» ی «معترف»[88]ە، (کە لە دەوروبەری ساڵانی ٨١٠ تا ٨١٥ی زایینیدا، کارەکەی خۆی کۆتایی پێ هێنا)، چاپی de Boor، ١٨٨٥، لل ٣٠٩ و ٣١٠.

لەمەڕ دواقۆناغی شەڕەکان (٨-٦٢٧ ز)، بەختەوەرانە بەڵگەیەکی هیراکلیۆس ـ خۆیمان بەدەستەوەیە، کە خاوەنی گرنگایەتی تایبەتە و ناوی «کەنزەکۆن» و ڕێکەوتی ١٥ی مارچی ٦٢٨ی بەسەرەوەیە[89]. بەڵگەنامەکە، لە «کرۆنیکۆن پاساله»[90] دا دۆزرایەوە (کتێبەکە لە دەروروبەری ساڵی ٦٢٩ی زایینیدا نووسراوە).

ئێرانیەکان وەک نەریتێک چاو لە گیرانی «گەنزەک» دەقووچێنن ـ و تۆمارکراوەکانی طەبەری و فیردەوسیش ئەو ڕاستیە دەر دەخەن. «سی بی ئیوس»[91] (تەرجەمەی Macler، ل ٨١) تەنیا باسی ئەوە دەکات کە «هیراکلیۆس» بە ڕێگای «کەرین»[92] (ئەرزرۆم) و «دڤین»[93] و «نەخجەوان» داهات و هەڵی کوتایە سەر «گەنزەک» [ی ئاترۆپاتەن] و ئاگردانی «ئاگری گەورە» (واتە هرات)[94]ی لەناوبرد کە «ڤزناسب»[95]ی پێ دەگوترا.

تیئۆفان ئەو ڕێگایەمان بۆ روون ناکاتەوە کە هیراکلیۆس پێش ئەوەی بگاتە «گەنزەک» پێیدا تێپەڕ بوو؛ دەقێکی یۆنانی [کتێبی تیئۆفان] یش، کە راولینسن



کەڵکی لێ وەرگرتووە (چاپی Bonn، ١، ٤٧١)، بێ هیچ گومانێک دەستی تێ وەردراوە.

ئەوبەشەی نووسراوە [کەی تیئۆفان]، تەنیا لە تەرجەمەیەکی لاتینی کۆنی ئامادە کراو لە لایەن ئاناستاسیۆسی[96] کتێبداری «پۆپ» (دەوروبەری ٨٧٤ و ٨٧٥ ز) دا تەواو کراوە، بەڵام بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ گرنگایەتیەکەی نەگیرایە بەرچاو و ئەوەش بەهۆی ناوێکی نائاسایی نێو کتێبەکەوە بوو.

ئێمە لە جیاتی ئەوەی تەرجەمەی یۆنانی بەشی فەوتاوی کتێبەکە لە لایەن «de Boor» ـەوە بنووسینەوە، پێویستە دەقە ئاساییە بە زمانی یۆنانی نووسراوەکە و دەقە زیادکراوەکەی زمانی لاتینی، هەردوکیان وەک خۆیان بهێڵینەوە[97]: «و شاه هێرش کردە سەر گەزەکۆن».

ئەم دەقە ساغ کراوەیە، وێنەیەکی هەمەلایەنی ڕووداوەکانمان بۆ دەکێشێتەوە: هیراکلیۆس کە بیستوویەتی خوسرەو لە گەنزەک بوە، هێرشی کردۆتە سەر شار و گرتوویەتی. ئینجا ئیجازەی داوە سوپاکەی لە دەوروبەری شار ماندوویی بحەسێننەوە. لەهەمان کاتدا، خوسرەو چۆتە شاری «ثی بەرمەیس»[98] لە بەری ڕۆژهەڵات و بەخێرایی ئەو شوێنەی بە جێ هێشتوە. «ثی بەرمەیس» (کذا)، ئاورگە و گەنجینەی جەواهێراتی «کرۆسووس» شای لیدیا[99] و هەروەها «ڕەمزی خەڵووز» ی[100] بەهرامی لێ بوە[101].

خوسرەو ئەو جەواهێرات و ئاگرەی هەڵگرت و [بەرەو باشووری ڕۆژئاوا] ڕۆیی. رووی کردە «دەستەگەرد» (لە نزیک «ئیسکی بەغدا»[102]). هیراکلیۆس «ثی بەرمەیس» ی گرت، ئاورگە و هەروەها شارەکەی سووتاند. خوسرەویشی بەرەو ناوچە ڕژد و ئەستەمەکانی میدیا، راونا بەڵام بۆ ئەوەی زستانەهەوار لەو پەڕی قەوقاز دابمەزرێنێ، گەڕایەوە دواوە.

راولینسن (ل ٧٨) بە هۆی دەقێکی ناتەواوەوە، تووشی گێژ و گومی بوە و وای زانیوە گوایە هیراکلیۆس ئاورگەی «گەنزەک» ی سووتاندبێ. تەنانەت پسپۆڕێکی لێزانی وەک هۆفمانیش (ل ٢٥٢)، کە بە باشی لە دەقەکە تێگەیشتبوو، نەیتوانی بزانێ لە بەرچ هۆیەک مەسەلەی سووتانی ئاورگە، نەک لە شوێنێکی وەک گەنزەک بەڵکو لە شارێکی بچووکی وەک «ثی بەرمەیس» تۆمار کراوە.

کلیلی سەرجەمی مەسەلەکە لە ڕاپۆرتیکدا دەردەکەوێ، کە مەسعوودی[103] لە بەرگی

٤، لاپەڕە ٧٤ [ی مـروج الذهب] دا رایگەیاندوە. بە گـوێرەی راپۆرتەکـە، نەوشـیـروان ئاگرەکەی لە «الشیز» (و) «*والەران» ـەوە بردە «البرکه» (گوڵ)[١٠٤]، کە راولینسن بە شێوەیەکی بێ پێوەند، بە تەختی سولیمانی زانیوە[١٠٥].

سـەرچاوە عـەرەبی و فـارسـیـەکـان، ئامـاژە بە زۆر رووداوی سـەردەمی گـوێزرانەوەی ئاگـرەکـە لە لایەن شـاهانی ئێـرانەوە دەکـەن هەروەها تایبـەتمەندییـە زەقـەکـانی «تەخـتی سولەیمان» یش هۆی بەرچاوی ئەو راگوێستنەمان بەدەستـەوە دەدەن: قەڵایەکی کۆنی قایم لە سەرگردیکی بەتاقەوە کەوتوو، گۆڵێکی قووڵ لە سەر گردەکە، کە هەندێ زنە و کـانیاو پاراوی دەکەن، روانگەی گەلێک رازاوەی دۆڵەکە و هەروەها هەڵکەوتنی لە سەر رێگەی پەیوەندیدەری ئێرانی ناوەندی و ئازەربایجانی باشوور و مێزۆپوتامیا.

ئەگەرئەم راگوێزرانی ئاگرە، لەسەردەمی نەوشیروان (٥٣١ ـ ٥٧٩ ز) دا رووی دابێت، ئەوا دەردەکەوێت:

I بۆچی هیراکلیۆس لە چاوپێکەوتنی یەکەم و دووهەمی
گەنزەکدا، ئاماژەیەک بە بوونی ئاورگەکە ناکا؛
II ناوەندی کەمتر گرینگی «ثی بەرمەیس» ـ کە کەوتۆتە بەری
رۆژهەڵاتی [گەنزەک] ـەوە، ئاورگەیەکی گەورەی تێدا بوە.

هەروەها، لە گەلێک سەرچاوەی دیکەدا ئاماژە بە «ئی ڤار مەیس»[١٠٦] دەکرێ. بەڵام ناوەکـە، بیـچـمی جـۆربەجـۆری هەیە. کـۆنتـرین سـەرنج لە بەشی یازدەهەمی «مـێنـاندر پرۆتیکتـۆر»[١٠٧]، چاپی Dindorf، ١٨٧١، ل ٢٥دا دەردەکـەوێ کـە تێـیـدا گـوتراوە، باڵوێزی بیزانسی «پیـترپاتریسیوس»[١٠٨] گوایە لەو شوێنەدا چاوی بە شای ئێران کەوتوە «کە لەوێ بوو بۆ کرین». بەهۆی ئەو راستـیەوە کە رووداوەکە لە ساڵی ٥٦٢ زایینی و سـەردەمی نەوشـیـرواندا رووی داوە، قـسـەکـانی مـەسـعـوودی (سـەرەوەتر) چەشنە سەلماندنێکی ناراستەوخۆیان بۆ پێک دێت.

تیـئـۆفـیـلاکت، ٥، ١٤، داسـتـانی ئەوەمـان بۆ دەگێـڕێتەوە چۆن خوسـرەوی دووەم کە «ڤیرامەیس»[١٠٩] بوو، داوای لەقەشە «سیرگیوس»[١١٠] کرد دوعا بکات «شیرین» منداڵی بێت. «ئێڤاگریوس» لە کتێبی «مێژووی کلیسـە»[١١١]، ٦، ٢١، (چاپی ، ١٩٨٩، ل ٢٣٦) دا، هەمان داستان دووپات دەکاتەوە.

Bidez ئەوەش جارێکی دیکە دەیسەلمێنێ کە شوێنی ناوبراو وەک کاخی نشیمەنی



شا، کەڵکی لێوەرگیراوە.

کورتی بکەینەوە، «جیۆرجیوس پیزایدیس»[١١٢] (چاپی Boon، ١٨٣٧، ل ٨٥)، لە شیعرێکی پڕ لە زێدەڕۆییدا باسی گەیشتنی هیراکلیۆس بە «دارارتاسی»[١١٣] دەکات [و دەڵی] ئەو شارە "کەوتبوە باکووری ئێران و باشوور" (بەرەو باشوور) ی[١١٤] ئێمەوە (واتە هی ئیمپراتۆریەتی بیزانس)". خوسرەو لەوێ «مەجووس و هەروەها کوانوە ئاگرەکانی خۆی» راگرت. شاعیر ناوی شارەکە بە «ئەرتەشیر»[١١٥]ـەوە پێوەندی دەدات، کە [شاهێکی] فاتیحی پارثیەکان (ئەشکانیان) بوو. بەڵام ئاشکرایە بیچمی ڤیتامەیس، ڤێرامەیس، ثی ڤارمەیس و دارارتەسیس[١١٦] و هەموویان نوێنەرایەتی تاقە ناوێک دەکەن کە ئێستا ئێمە ناتوانین ساغی بکەینەوە.

لە شاهنامە، چاپی Mohl، II، ل ٥٤٦ ـ ٥٥١ (چاپی تاران، III، ٧٦٢ ـ ٧٥٦) دا کەیکاوس کە دەیەوێ ئازایەتی کەیخوسرەو تاقی بکاتەوە، دەینێرێتە قەڵای «دژی بەهمەن»[١١٧]. رێگای شوێنەکەش بە دەروازەی «ئەردەبیل» دا تێپەڕ دەبێت. قەڵاکە، دیوارێکی بەرزی هەبوو (برشدە بارە)، کە ئەهریمەن دروستی کردبوو و دێوی تێدا نیشتەجێ بوون. کەیخوسرەو بەناوی خودا (یەزدان)، «دژی بەهمەن» ی گرت کە پانتایی قەڵاکەی «دەکەمەند» بوو و گومبەزێکی بەرزی لە سەر وەستابوو. ئەو [واتە کەیخوسرەو]، لە دەوروبەری قەڵا و بە فاسیلەیەکی ئەوتۆ، کە نیوە رێگای ئەسپێک بێت (مەیدانە ئەسپێک؟)، ئاگری «ئازەرگوشەسب» ی دانا.

واهەیە ئەم ئەفسانەیە (بە ئاڵ و گۆڕی دوای نەوشیروانەوە)، ئاماژە بە تەختی سولەیمان بکات، بەڵام ئەفسانەکە، پەیوەندی نێوان ناوی «دژی بەهمەن» لە گەڵ بیچمی جۆر بەجۆری [وشەکە لە زمانی] بیزانسیەکاندا ـ کە پێشتر باسیان کرا، روون ناکاتەوە. ئەگەر ئاورگەکە، بە شانازیی «ئامرتا ـ سپینیا»[١١٨] وە دروست کرابێت، ئەوا بیچمی «*ڤیت – ئارمەییس»[١١٩] زیاد لەوەی بگەڕێتەوە بۆ «ڤوهوو ـ مەنوو»[١٢٠] (بەهمەن)، دەگەڕێتەوە بۆ «ئارمەیتی»[١٢١].

هیراکلیۆس، بۆ جاری دووەم، لە ١١ی مارچی ٦٢٨ دا گەیشتە گەنزەک و لە هەشتەمی ئاپریلدا بەجێی هێشت. پەیوەندیە سەرەتاییەکانی [هیراکلیۆس] لەگەڵ رووداوەکانی نێوان ١٧ی ئۆکتۆبەری ٦٢٧ و ١٥ مارچی ٦٢٨ (کە گەیشتنە لای «شیرۆیە» ـ شای نوێ [ی ئێران] یش دەگرێتە بەر)، نەگەیشتۆتە دەستمان، بەڵام دەقی





دووهەم نامەی هیراکلیۆس، کە لە ٨ی ئاپریل [ی ٦٢٨] دا، لە هوردوەکەی نزیک «گەنزەک» ەوە ناردوویە و لە رۆژی ٥ ی مایس دا لە کلیسەکانی «قسطنطنیە» دا خوێنراوەتەوە، لە سەرچاوەی وەک «کرۆنیکۆن پاسکالەی «میگنە» ، بەشی قەشەکانی یۆنان[١٢٢] ، ٤٢، لل ١٠١٧ تا ١٠٢٢ دا پارێزراوە.

لەشکرکێشانی هیراکلیۆس بۆ سەر مێزۆپوتامیا ، لە لایەن «راولینسن» ەوە هەڵسەنگێنراوە و ئێمە تەنیا پێویستمان بە بەشی کۆتایی کارەکەیەتی ـ کاتێ کە لەلایەن سوپای ئێرانەوە کەوتە بەر هەڕەشە و لە رۆژئاواشەوە بانگ کرایە دواوە (بڕوانە Prince، ١٦٤) ، ئەویش ئازایانە، کشایەوە ناو ئازەربایجان و پشت زنجیرەی زاگرۆس. هێڵی گشتی ئەو رێگەیەی وا [هیراکلیوس] پێیدا تێپەڕ بوو، بە هۆی تیئۆفانەوە بۆمان ناسراوە. (چاپی de Boor، ل ٣٢٥).

فێبریوەری ساڵی ٦٢٨ بە وێرانکردنی شارەزوور («تون سیازوورون» ؛[١٢٣] کرۆنیکۆن پاسکالە بە «تووسیاسوورون» ی[١٢٤] نووسیوە) تێپەڕبوو؛ لەمانگی مارچدا، هیراکلیۆس هاتە شوێنێک کە ناوی «ڤارەزن» [١٢٥] بوو. راولینسن ئەم شوێنەی بە «بانە» ناسیوەتەوە چون ناوی بنەڕەتی کوردی بۆ ئەم شارە «بەڕۆژە» یە (بە واتای «لەبەر رۆژ» یا «راکشان بەرەو رۆژهەڵات» ). وەک ئاکامێک [ی ئەم بۆچوونە، راولینسن] لای وایە هیراکلیۆس دەبێ زاگرۆسی بەرێگای «بانە» دا تێپەڕ کردبێت (کرۆنیکۆن پاسکالە: «چیای زارە»[١٢٦] ). بەڵام ناوی «بەڕۆژە» بۆ جوغرافی نووسانی کۆن، ئاشنا نییە و یۆنانیەکان زەحمەتە /Ö/ (ۆ) یەکی درێژیان لە ناوەڕاستی وشەکە دانابێت.

گەلێک گونجاوترە ئەگەر «ڤارزەن» نوێنەرایەتی چوارڕێیانێکی گرنگ بکات، کە جوغرافیانووسە کۆنەکانی عەرەب «بەزرە» یان پێ گوتوە و یەکێ بوە لە مەنزڵەکانی سەر رێگەی دینەوەر ـ مەراغە. واتە لە فاسیلەیەکی بەرچاوی رۆژهەڵاتی زنجیرەی زاگرۆس (بڕوانە خوارەوەتر) . ئەوە شتێکی گەلێک گونجاوە کە لەگەڵ سەقزی ئێستای بەشی سەرەوەی دۆڵی جەغەتوودا ، بەیەک بزانرێ. ئاکامێکی ئەوتۆ بۆ دیاری کردنی ئەو بوارەی وا هیراکلیۆسی پێدا تێپەڕ بوو، یارمەتیمان نادات.

بوارەکە واهەیە رێگایەک لە رێگاکانی بانە بووبێت، بەڵام دووریش نیە ئەگەر بە رێگەی «نەوخووڤان»[١٢٧] بزانرێ، کە هۆزی جاف لە کۆچ و باری ساڵانەیان لە شارەزوورەوە بۆ سەرچاوەکانی جەغەتوو، هات وچۆی پێدا دەکەن.

بە گوێرەی قسەی هیراکلیۆس، هەر لە ٢٤ی فیبریوەرییەوە کە شارەزووری بەجێ هێشت



هەتا ٣٠ی مارچ، بێ وچان بەفرباری و لە عەینی کاتدا، بەپێی هەواڵی «تیۆفان» حەوت رۆژ، لە «بەرزەن»[١٢٨] مایەوە. ئیحتیمالی زیاتر ئەوەیە سوپای بیزانسی لە جیاتی «بانە» ی زۆر بەرز، کە بەهۆی «کەل» ێکەوە[١٢٩] لە جەغەتوو جیابۆتەوە، پەلەی گەیشتن بە شوێنێکی گەرمەسیری وەک جەغەتوویان بووبێت.

هیراکلیوس، رۆژی ١١ی مارچ لە «بەرزەن» ەوە گەیشتە گەنزەک. بەم پێیە دەبێ لەشکرکێشانەکەی هیراکلیوس، لە شارەزوورەوە ١٧ رۆژی خایاندبێت و لەو ماوەیەدا حەوتوویەک لە «بەرزەن» مابێتەوە. دەرۆژە رێ رۆیشتن بەسوپاوە، واهەیە هیراکلیوسی گەیاندبێتە تەختی سولەیمان و بەشی خوارەوەی جەغەتوو. بەڵام لە کاتێکدا، دووهەمیان [واتە جەغەتووی خواروو] ، تەنانەت لە سەردەمی مغولیشدا، بە هاوینە هەوارێکی گەرم دەناسرا، یەکەمیان [= تەختی سولەیمان] ، بە حیسابی ئاووهەوا، بەتەواوەتی نەگونجاو دێتە پێش چاو.

هیراکلیۆس، لە نامە دوور و درێژەکەی خۆیدا [١٣٠] ، کە ناردیەوە بۆ «قسطنطنیە» ، هەندێ شەرحی گرینگ لە مەڕ «گەنزەک» دەدات کە راولینسن، بە شێوەیەکی شایان سەرنجی نەداوەتێ. ئیمپراتۆر باسی زۆریی خواردن بۆ مرۆڤ و تفاق بۆ ئەسپ لە شارەکەدا، دەکات (مەسرەفی زۆر دەکەن لە خەڵک و لە ئەسپ)[١٣١]ـ شارێک، کە نزیکەی سێ هەزار ماڵی تێدایە، باسی گوندەکانی دەوروبەریشی هەر نەکەین.

هوردووگای قورس و قایمی هیراکلیۆس کەوتبوە نزیک شار، بەڵام چارواکان لە ماڵی خەڵکدا ئاگاداری دەکران، "بەشێوەیەک کە بۆ هەر پیاوێکی هوردوو، ئەسپێک دیاری کرابوو» .

چاو خشاندنێک بەو وێنە نوێیەی تەختی سولەیمان[١٣٢] بەسە بۆ ئەوەی بزانین تەختی سولەیمان، ناتوانێ جێگەی شارێکی وای لێ ببێتەوە[١٣٣] . گردەکە بەتیژی لەسەر دۆڵێکی باریک قوت بۆتەوە و چەندین لووتکەی چیا ، دەوریان داوە. بەشی ژوورەوەتری، بەدیوارێکی گەلێک قایم دەورە دراوە. لێرەدا گۆڕاییەکی ٣٢٠ × ٣٨٠ مەتری (١٠٥٠ × ١٢٥٠ فووتی) هەیە و گۆلێکی ٦٨ × ١٠٨مەتریش لە دەرەوەی قەڵاکەدایە. بارودۆخی ناخۆشی شوێنەکە لە وەرزی زستاندا، بەهۆی وێنەیەکەوە نیشان دراوە کە پرۆفیسۆری کۆچ کردوو «ئـ.ڤ. و. جەکسۆن» ،[١٣٤] هەمان، ل ١٣٣ ، هەڵی گرتوە و لە ژێریدا نووسیویە: تەختی سولەیمان "لە ژێر بەفردا نێژراوە."

## بەشی سێهەم:

## ڕێگەی دینەوەر . مەراغە

شی کردنەوەی لە شکرکێشانەکەی بیزانس لەسەردەمی «موریس»[١٣٥] دا، ئاماژەی بەهەل و مەرجی گەنزەک لە دراوسێیایەتی «وەلەرەث»[١٣٦] (جەغەتوو) تێدایە. هەڵسەنگاندنی لەشکرکێشانەکەی هیراکلیوس، بوونی شاری سەرنج ڕاکێشی «گەنزەک» و جیاوازبوونی لە ئاورگەی «ثی بەرمەیس» مان بۆ دەسەلمێنێ. سەرچاوە عەرەبییەکانیش بەو پەڕی ڕوونی و ئاشکراییەوە، شوێنایەتی «گەنزەک» دیاری دەکەن.

ڕێگای دینەوەر. مەراغە، کە پێشتر، بەسێ ریوایەتی جیاواز باسی لێوەکرا، بۆ مەسەلەکەی ئێمە، خاوەنی گرینگایەتی زۆرە. «ئیبن خورداد بیە» ل١٢١[١٣٧] و «قودامە»[١٣٨] ،ل٢١٣، فاسیلەکان بە فرسەخ بەدەستەوە دەدەن، لە کاتێکدا «موقەددەسی»[١٣٩] ، ل٣٨٣ بەقۆناغ (مەرحەلە) ناویان دەبات:

| | **ئیبن خوردادبیە** | **قودامە** | **موقەددەسی** |
|---|---|---|---|
| ١- دینەوەر | ٧ فرسەخ | ٩ فرسەخ | ١ مەرحەلە |
| ٢- ألجبار جان [١٤٠] | ٦ فرسەخ | ٦ فرسەخ | ١ مەرحەلە |
| ٣- تەلل- ڤان [١٤١] | ٧ فرسەخ | ٧ فرسەخ | ١ مەرحەلە |
| ٤- سیسەر | ٤ فرسەخ | بە زستان ٥ و بە هاوین ٤ فرسەخ | |
| ٥- ئەندەراب [١٤٣] | ٥ فەرسەخ | بە زستان ٥ و بە هاوین ١٠ فرسەخ | ١ مەرحەلە |
| ٦- ئەل ـ بەیلەقان [١٤٤] | ٦ فرسەخ | بە زستان ٦ و بە هاوین ٨ فرسەخ | ١ مەرحەلە |
| ٧- بەرزە ٨ | ٨ فرسەخ | ١ مەرحەلە | |
| ٨- سابوورخاست [١٤٥] | ٧ فەرسەخ | ٧ فەرسەخ | ١ مەرحەلە |
| ٩. مەراغە | | | |

لەمەزندەکانی سێ سەرچاوەی ناوبراودا، هەروەها شەرحی ڕێگایەک لەمەراغەوە بۆ ورمێ دەدرێ کە یەکەم جار بەرەو باشوور ـ بۆ لای « بەرزە» دەکشێ، (قۆناغی٩، ٨ ئـ، ٨ب و ٧).ئینجا، لەوێوە بەرەو باکووری ڕۆژئاوا دەڕوات (بڕوانە خوارەوەتر، ل ٢٥٣ ی ئینگلیزی). بەشی یەکەمی ئەو ڕێگای هات و چۆیە، هەندێ شەرحی گرینگی لەمەڕ ڕێگای بەرزە ـ مەراغە تێدایە :

| | ئیبن خوردادبیە | قودامە | موقەددەسی |
|---|---|---|---|
| ٩ مەراغە | ٦ فرسەخ | ٦ فرسەخ | ١ مەڕحەلە |
| ٨ ب جەنزە [١٤٦] | ٥ فرسەخ | ٥ فرسەخ | ١ مەڕحەلە |
| ٨- مووسائاباد | ٤ فرسەخ | ٤ فرسەخ | ١ مەڕحەلە |
| ٧ بەرزە | ٢ فرسەخ | ١ بەرید | |
| ١٠ ت. فلیس [١٤٧] | ٨ فرسەخ | ٦ فرسەخ | ١ مەرحەلە |
| ١١ جابرڤان [١٤٨] | ٤ فرسەخ | ٤ فرسەخ | ٢ بەرید |
| ١٢ نیریز [١٤٩] | ١٤ فرسەخ | ١٤ فرسەخ | ١ (؟) مەرحەلە |
| ١٣ ورمێ | | | |

فاسیلەی ڕاستەقینەی نێوان دینەوەر و مەراغە ـ لەسەر پێوانەی ١:١،٠٠٠،٠٠٠، دەوروبەری ٢٢٥ میلە [= ٣٦٠ کیلۆمەتر]. بەهۆی ئەو ڕاستییەوە کە لیستەی بە وردەریشاڵی قۆناغەکان تەنیا ٥٥-٥٠ فرسەخ دەگرێتەبەر، پێویستە مەزندەی هەر فرسەخێک بە {٤،٥ تا ٤،٠٩} میل دابنێین.

پێش ئەوەی بچینەسەر خاڵەکانی تر، کارێکی بەسوودە ئەگەر لە ناوچایەتی دوو شوێنی گرینگی «بەرزە» و «سیسەر» بکۆڵێینەوە کە لە سەرچاوەکانی دیکەشدا ناسراون. فاسیلەی ١٥ فرسەخ (٦٧،٥-٦١،٣٦ میل) بەرەو باشووری مەراغە، دەبێ کەوتبێتە ناوچەی «بۆکان – سەرا». وەک ئێمە دەزانین، فرسەخ لە ئازەربایجاندا کەمێک درێژتر بوو[١٥٠]. بۆشوێنی گرینگ و کەونارای سەقز (٢٠ میل تا بۆکان و ١٠ میل تا «سەرا»). ناسینەوەکەی ئێمە دەتوانێ بە هۆی ئەندازەگرتنێکیەوە بسەلمێ کە لەسەر هەمان پێوانە (بەرانبەر لەگەڵ ١٥ فرسەخ)، بەرەو باشوور دەکشێ و «سیسەر» لە شوێنی [ئێستای سنە، دادەنێ (بڕوانە خوارەوەتر).







ئەوپەڕی باشووری «سیسەر ـ دینەوەر» ـ کە بەرانبەری هێڵێکی راستی ٧٤-٦٧میلییە، بۆ فاسیلە ٢٢-٢٠ فرسەخییەکەی «ئیبن خوردارببە» و «قودامە»، هەندێ کورتی دێنێ، ئەوەش وا دەگەیێنێ کە رێگاکە دوای بەجێ هێشتنی دینەوەر و رەنگە بە ئامانجی کەوتنە سەر رێگای سەرەکی کرماشان ـ سنە، هەندێک لابدات. هەروەها دەگونجێ «فرسەخ» ی ناوچە باشوورییەکان لە فرسەخی ئازەربایجان کورتتر بووبێت.

دوای ئەو بۆچوونە سەرتاییانە، دەگەینە ئەزموونکردنی نزیکتری ئەو رێگە و بانە ئەستەمەی من لە سالّی ١٩١٦دا ـ کاتێ لە کرماشانەوە دەچووم بۆ سەمەنگان، دینەوەر، سونقوڕ و سنە، بەشێکیم پێوا. زوربەی ناوەکان، یاجێی دلّنیایی نین، یاخود لەگەلّ ئۆپۆنیمی ناوچەکەدا، یەک ناگرنەوە.

١) وێرانەکانی «دینەوەر» کەوتۆتە نزیک گوندی «قەلاّی جوو» لە ١٧ میلی باکووری بێستوون و بە هۆی چاوچنۆکی بەشێک لە خەلّکی ناوچەکەوە، کە بەدوای گەنج دا دەگەڕێن، لەناوچوون.

٢) ناوی «ئەلجەبارجان» (قودامە: الجورجان. بڕوانە وتارەکە)، واهەیە پەیوەندیی بە هۆزی * «جەبرەکان»، گەورەکان، گەورەگان و دواتر «گۆران» ەوە هەبێت.[١٥١]

دووگوند بەناوی «جەبارئاباد» (؟) لە نەخشە [ی ئێران] دا، دەردەکەون؛ یەکیان ١٨ میل کەوتۆتە بەری ڕۆژئاوای دینەوەر (لە «بیلەوار»)، ئەوی دیکەیان لە باکووری دینەوەر، خوارەوەی کەلی «ملەماس» ـە[١٥٢]. تەنانەت ئەگەر ئەو دوو شوێنەش لەگەلّ «جەبارجان» ی ئەسلّیدا یەک نەگرنەوە، رەنگە شوێنی ناوی ئەویان هەلّگرتبێ و پاراستبێتیان[١٥٣].

٣) بارودۆخی «تەلل ـ ڤان»[١٥٤] بەتەواوەتی خەیالّی و فەرزییە. واهەیە کەوتبێتە سەر یەکێ لەو رێگایانەی وا لە «گاوەرۆ» وە دەچن بۆ دۆلّی سنە (قشلاّق). هەروەها بۆی هەیە لەنزیک «دەرگاه» یاخود ئەگەر رێگاکە زیاتر بەرەو رۆژهەلاّت بگەڕێتەوە، لە «کەرگاباد»[١٥٥] بێت.

٤) هۆی باش بەدەستەوەن بۆ ئەوەی لە نزیک «سنە»[١٥٦] چاو بۆ «سیسەر» بگێڕین، گەرچی دوا پێتەختی[١٥٧] والیانی ئەردەلاّن وادیارە درەنگتر دروست کرابێت، نیشانەی ئەوەش بەدەستەوەن کە مەرکەزی پێشوو[١٥٨]، زیاتر کە وتۆتە لای باکوور و نزیک بەسەرچاوەکانی [چۆمی] قزل ئوزەن (سفیدڕوود).



٥) ئەگەر بەگوێرەی ناوەکەی داوەریی بکەین، ئەندەراب کەوتۆتە نێوان دوو سەرچاوەی ئاو، ئەو دوو سەرچاوەیە واهەیە «سفید روود» [سیروان] و یەکێ لە لقەکانی بن.

٦) بەیلەقان (کە، ناوی لە شوێنێکی دیکەشدا دەردەکەوێ)، دەبێ لە «خوڕخوڕەی سەروو» چاوی بۆ بگێڕین.

٧) بە «بەرزە» دا (تیئۆفان؛ «ڤارزەن»)، دەگەینە زەمینەیەکی بەهێزتر. بەرزە شوێنێکی گرنگ بوو کە رێگەی مەراغە و ورمێ لەوێ لێک جیادەبوونەوە و لە سەرەتاکانی سەدەی نۆهەمی زاییینیدا، زنجیرەیەکی تەمەن کورتی حکوومەتیی خۆی لێ بوە (بڕوانە: بلا ذری،[١٥٩] ل٣٣١). ئەستەمە بیرلەوە بکرێتەوە رێبوار و گەڕۆک لە مەراغەوە ئەو هەموو رێگەیە بێن و لەوێوە بابدەنەوە لای ڕۆژئاوا [بۆ ئەوەی بچنە ورمێ]. ئەم کارە، بۆ ئەوانەی لە باشوورەوە دەهاتن، کارێکی ئاسایی بوو. بۆی هەیە، لە سەفەرنامەی ئەسلّیی [هیراکلیوس] دا، بەرزە ـ ورمی، لە درێژەی هێلّی دینەوەر ـ بەرزەدا بووبێت و تەنیا بە شێوەیەکی میکانیکی بەهێلّی بەرزە ـ مەراغەوە پەیوەندی درابێت (تەرتیبی پێچەوانەی، دەبیتە؛ مەراغە ـ بەرزە ـ ورمێ)[١٦٠]. رێگایەکی راستەوخۆ لە سەقزەوە بەرەو باکووری رۆژئاوا هەیە و من خۆم لەسالّی ١٩١١ لە سابلاّغەوە راستەوخۆ پێیدا چوومەتە سەقز[١٦١].

سەقز، بە شاهیدێکی وەک گردەبەرزە کەوناراکەیەوە ئاوەدانییەکی گەلێک کۆنە. رێگاکە، لەدوای بەرزە، دەبوو بە دوو لقەوە. ناوی قۆناغی ٨ تووشی ئالّ و گۆڕ هاتوە و دەبوایە لە نێوان «٨ب» ی جەنزە و «٨ئـ» ی مووسائاباد هەلّبکەوتایە[١٦٢]. ئێمە، پاشان سەبارەت بەم قۆناغە زیاتر دەدوێین.

سەرنج راکێشترین ناوی ئەم سەفەرنامەیە، «جەنزە» یە.

«de Goeje» لە چاپی موقەددەسی، ل ٣٨٢دا، ناوێکی هێناوە، کە بە «خرە روود» دەخوێنرێتەوە، بەلاّم بیچمێکی دیکەی [ئەم وشەیە] واتە «حزە» بێگومان نیشاندەری ئەو راستییەیە کە پێویستە ناوەکە وەک «جەنزە» ساغ بکرێتەوە و ئەوە، لە [کتێبی] ئیبن خورداد بیە و قودامەشدا هاتوە[١٦٣].

بەشی زیادکراوی ئەم وشەیە ـ واتەو «روود»، وا دەگەیێنێ [کە شارەکە] لە لێواری چۆمێک بووبێت. سێبەری هیچ گومانێک لەسەر ئەو بۆچوونە نییە کە «جەنزە»، هەمان «گەنزەک» ی کۆنە. نزیکەی ٦ فرسەخ دوور بوون [ی گەنزەک] لە مەراغەوە، شوێنەکە

لەسەر لێواری [چۆمی] لەیلان دادەنێ بەشێوەیەک کە بکەوێتە بەری راستی ئەو لقەی «جەغەتوو»ەوە [کە «لەیلان» بێت].

دوو سەرچاوەی بیزانسی و عەرەبی، لە دیاریکردنی شوێنایەتی گەنزەکدا، هاودەنگن ـ شوێنێک کە بۆ یەکەمجار،«کۆلۆنیل مۆنتییث»[164] لەساڵی ١٨٣٢دا ناسیبیەوە[165]. ناوبراو، بەچاوپێکەوتنی وێرانەی پان و بەرینی سەر ئەو گردە قایمانە ـ کە روخساری تایبەتی بە هەموو شارێکی «ئێران دەبەخشن»، شاگەشکە بوو. بەگوێرەی پێوانەکانی ئەو، ئاڵقەی وێرانیەکان، نزیکەی ١٤ میلیان دەگرتەوە و زیاترین درێژاییان لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا کشابوو. «مۆنتییث» ئەم ئاکامە بەدەستەوە دەدات: شاری تەوریز، لە فاسیلەیەکی گەلێک دووری لای باکوور هەڵکەوتوە کە بتوانێ شوێنی «گەنزەکە» بێت، بەڵام ئەم وێرانانە دەتوانن شوێنی گەنزەکە بن. هەروەها، گەنزەکە کەوتۆتە بەشی زۆر سارد و بێ پیتی ئازەربایجان؛ بەم پێیە وەڵامێکی کەم بۆ ئەو پرسیارە بەدەستەوە یە کە ئامانج لە زستانەهەوار بۆ سوپایەکی گەورەی وەک سوپای ئەمپراتۆر هیراکلیۆس لە ماوەی لەشکرکێشان بۆ سەر ئێران دا، چ بووە؟ ئەوان [= وێرانەکان]، هەروەها نزیک بەشوێنی یەک گرتنەوەی سێ رێبانێکن کە لە تیسفوونەوە بە سنە و سابلاغ و «بوررانیدێزی»دا[166]، دەگەنە پێتەختی ئێران.

راولینسن، لل ١١٩.٣٩، چاوی بە وێرانەیەکی گەورە کەوت بە ٣/٤ میل (= ١٢٠٠مەتر) درێژایی و نیوەی ئەویش پانایییەوە، کە لەسەر چەند گردی یەک بەدوای یەک پێک هاتبوو و گردەکان ٤٠ تا ٥٠ فووت [١٢ تا ١٥ مەتر] بەرز بوون. راولینسن ناسینەوەکانی «مۆنتییث» لەم بارەیەوە دەداتە دواوە، کە دەڵێ «گەزە[167]، وەک هاوینەهەواری شای میدیییەکان گیراوەتە پێش چاو، بەڵام «لەیلان» لەدەشتایی میاندواو، بێگومان یەکێکە لە گەرمترین شوێنەکانی ئازەربایجان».

هەر چۆنێک بێت، بەرپەرچ دانەوەی راولینسن لەسەر ئەو بناغەیە دانراوە کە پێویستە نووسینە ئاڵۆزەکانی سترابۆن لەبەر رووناکایی زانیارییە روون و بێ گرێکانی تیئوفیلاکت هەڵسەنگێنرێنەوە. تیئوفیلاکت، گەنزەکی لە دەشتایی داناوە (هەمان، ل ٢٤٥).



## بەشی چوارەم:

## ئاورگەی شیز

لەکاتێکدا تیئوفیلاکت هیچ ئاماژەیەک بە بوونی ئاورگە لە گەنزەک ناکات، تیئۆفان بە لێبڕاوییەوە دەیسەلمێنێ ئاورگەکە، لە «ثیبەرمەیس» بوە. ئەگەر رەقیبێک کە دواتر پەیدا بوە، واتە «چ. سێدرێنوس»[168] (کۆتایی سەدەی یازدە و سەرەتای سەدەی دوازدەهەمی زایینی)، چاپی Bonn، ل ١٢١، ئاورگەکە، لە گەنزەک دادەنێ (شاری گەزەکۆن)[169]، تەنیا ئەو راستیە دەردەکەوێ کە بەشی گرنگی نوسراوەکە، لە تەرجەمەی کۆنی لاتینی [کتێبی] تیئۆفاندا[170] فەوتاوە وەک چۆن لە چاپە سەرەتاییەکانی ئەورووپاییشدا، کەوتبوو.

بەقسەی فیردەوسی، خوسرەوی پەروێز، پێش شەڕی بەهرام، چوە ئاورگەکە و دیاریی خۆی پێشکەش کرد. شاهنامە، هیچ ئاماژەیەک بەشوێنی «حەرەمی پیرۆز» ناکات.

بەهۆی ئەو راستییەوە کە، راوانی بەهرام بۆ جاری دوایی، لەبەری باکووری رۆژهەڵات بوە (مەراغە ـ میانە؟)، بۆی هەیە ناوبراو هەموو ناوچەکەی هەتا باشووری گۆڕەپانی شەڕ بەجێ هێشتبێ و بەم بۆنەیەوە هیچ کۆسپێک لەسەر رێگەی خوسرەو نەماوە بۆئەوەی خێرا بگاتە ناوچەی تەختی سولەیمان.

ناسینەوەی «ثی بەرمەیس» و دانانی لە شوێنی ئەمڕۆی تەختی سولەیمان، ئاکامی هەندێ نیشانەی «مسعربن مهلهل»[171] (نیوەی یەکەمی سەدەی دەهەم [ی زایین]) یە، کە لەژێر عینوانی «الشیز» دا، باسی لێوە کردوە، هەروەها «حمدالله مستوفی» لەژێر ناوی مغولی* «سقورلوق» دا ئاماژە بە هەمان شوێن دەکات. گرنگایەتی ئەو دوو دەقە بەشێوەیەکی جێگەی بڕوا، لە لایەن راولینسنەوە دەست نیشان کراوە (لل ٦٤، ٧٠).

گەڕۆکی عەرەب [مسعر؟]، پێشینەیەکی گومان لێکراوی لە مەسەلەی راستگۆیی سەبارەت بە رۆژهەڵاتی دوورتر (تورک، هیند) هەیە، بەڵام لە رۆژئاوای ئێراندا دەبێ گەلێک شوێنی گرنگی چاو پێ کەوتبێت. «مسعر» شەرحێکی زۆر لەمەڕ «شیز» دەدابە دەستەوە (مەعدەنی زۆر و گۆلاوی قوول). باسی ئاورگەیەکیش دەکات کە دەڵێ ئاگرەکەی ٧٠٠ ساڵ بوو دەئایسا بێ ئەوەی خۆڵەمیش لە خۆی بەجێ بهێڵێ. ئەو بۆچوونە، لە

ئاماژه کردنی به رەمز و رازی جیورجیوس و تێئۆفان (و هەروەها سێدرێنووس) به «رەمزی زوخاڵ» دا، سەرەتای هەودایەکمان بۆ دەدۆزێتەوە. زۆریش لە راستی دوورنییە کە بوونی زەریاچەیەکی قووڵ لە تەنیشت ئاورگەکە، هۆی ئەوە بووبێت کە خۆڵەمێشی ئاگر پاشماوەی نەمابێت.

«مستوفی»، نزهت [القلوب]، ٦٥، هیچ شتێک سەبارەت بە ئاورگەکە نادرکێنێ بەڵام تەختی سولەیمان ـ بە ئەفسانەی کەیخوسرەو (و ئەفراسیاب) ەوە پەیوەندیی دەدات، کە ئەویش بەش بەحاڵی خۆی گەلێک لە نزیکەوە بە ستراوە بە ئاورگەی «ئازەرگوشەسب» ەوە. ئێستا پێویستە بکەوینە شوێن ئەو ئاماژە و ئیشاراتەی کە بەدرێژایی سەدەکان بۆ «ئەلشیز» کراون.

شوێنی گرینگی «تەختی سولەیمان» تەنانەت لەسەردەمی پێش ئاری و بەر لە دەوری مێدییەکانیش سەرنجی زۆری خەڵکی بەرەو خۆی راکێشاوە. تاقمێکی ئەمریکی لەو شوێنەدا ژمارەیەکی زۆری سواڵەتی نەخشاوی پێش مێژوویان دیتەوە، بەڵام گردەکە لەوە ناچێ بەشێوەی هەمیشەیی خەڵکی تێدا نیشتەجێ بووبێت. ئاو و هەوای ناسازگاری شوێنەکە ـ بەتەنیایی ئەم بۆچوونە زامن دەکات. هەروەها ئاوی گۆلەکە ـ کە پڕە لە «عەناسوری کانی»، نابێ جێگەی رەزامەندیی ئەو خەڵکانە بووبێت وا بە شێوەی دایمی لەوێ نیشتەجێ بوون.

«مارکوارت» لە رێگەی شیچ (شیچیکان) ی[172] گریمانی فارسی ناونجییەوە[173] ـ کە زۆر جاران وەک ناوی گەنجینە و خەزینە لە کتێبە زەردەشتییەکاندا هاتوە، شەرحی «شیز» دەکات. دیارە هێشتا هەندێ بێ متمانەیی سەبارەت بە خوێندنەوەی فارسی نێونجی هەرماوە[174]. بەڵام «پلینی» لە نوسراوە گردوکۆکراوە جوغرافیاییەکەی خۆیدا، کاتی باسی شارەکانی میدیا دەکات، ناوی «فیس گەنزەگە» (و بیچمی دیکەی واتە «فیس کەنزەگە»)[175] دەبات،[176] کە مارکورات لە بیچمی «*فیس (لەجیاتی «شیچ») ـ کەنزەگە» دا،[177] ساغی دەکاتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ *«گەنجی شیچیکان»[178] ی فارسی نێونجی. ئەم ساغ کردنەوەیە، دەمانگەیێنێتە سەرەتاکانی سەردەمی خۆمان، بەڵام مارکورات بە هۆی ئەوەوەی دەڵێ وا هەیە «شیچ» ناوێکی «ماننایی» بێت، هەندێکی دیکەش بەرەوە پێشەوە دەچێت.

هەرچۆنێک بێت، ئێمە لێرەدا دەچینە گۆڕەپانی بیرکردنەوەیەکی بێ خەوشەوە. دواتر



لە لاپەڕە ٢٦٤ دا، پێویستە شێوازی وەرگێرانێکی جیاوازی وشەی «شیز» لە «چیچەست»[179] بگرینە بەرچاو. ئەگەر لەسەردەمی رۆمییەکاندا شوێنەکە (واتە «ئۆپیدوم»[180]) ناوی «*شیچ» یا «شیز» بووبێت، ناوانی ڤی ئارماییس و ڤی ڤارماییس[181] لەلایەن بیزانسییەکان بۆی، بەهۆی ناوێچوویانەوە دەبنە هۆی سەرلێ شێوان[182].

گەشتی تاقمێکی ئەمریکایی لەساڵی ١٩٣٧دا، بوە هۆی ئەوەی دیوار و هەروەها کۆنترین بنچینەی بینای تەختی سولەیمان، ببرێنەوە سەر بناغەیەکی پارتی [ئەشکانی]. بەتایبەت، گرینگە لەبیرمان نەچێت کە مەسعودی لە «مروج [الذهب]»دا، II، ٢٣٥، پارتیەکان بە «شاهانی الشیز» (و) «*والران» ناودەبات و لە «تەنبیه» دا، لەسەری دەڕوات و دەڵێ: «ئەرشاکەکان،[183] زستانیان لە عیراق و هاوینیان لە «الشیز» ی ئازەربایجان (من بلاد ئازەربایجان) دەبردە سەر.»

بوونی قەڵاکە، نیشاندەری هەندێ رێگای گرنگی پەیوەندیدەری فلاتی مەرکەزیی ئێران لەگەڵ ناوچەی باشووری گۆلی ورمێ و لەویش دوورتر لەگەڵ میزۆپۆتامیایە. ئەم قەڵایە، لە کاتی پێویستدا، دەیتوانی رۆژهەڵات لە مەترسییەک کە لەلای رۆژئاواوە دەهات بپارێزێ. پێچەوانەکەشی ـ بەتایبەت لەکاتی راپەڕینە ناوچەییەکاندا، راست بوو. بۆی هەیە خەڵکی وەحشی ناوچەکانی «کاسپیەن» [خەزەر]، بەرێگای زەنجان ـ تەختی سولەیماندا، بەرەو رۆژئاوا هاتبێتن.

نیشانەکانی بنیات نانی ئاورگەی «ثێ بەرمەیس ـ الشیز» لە لایەن ئەردەشیری ساسانییەوە، زۆر جێگەی دڵنیایی نین. بەڵگەکانی «جیورجیوس پیسیدێس»[184] لە مەڕ قەڵای داراتائیس[185] کە ئەردەشیری ساسانی بنیاتی نابێت، بایەخیان نییە چون واهەیە ناوبراو، شیعرەکانی خۆی لە کاتی شایی لۆغانێکدا هۆندبێتەوە کە بە بۆنەی گەیشتنی راپۆرتی شەڕەکانی «هیراکلیوس» گیرابوو.[186] لەو سەردەمانەدا، هێشتا ناوی بێگانەی ئاورگەکە، نەکەوتبوە بەر سەرنجی ورد. ناوی بنیات دانەرەکەی واتە ئارتاثیر[187] وێ دەچێ ئیشتیقاقی دووبارەی دار-ئارتاثیر[188] بێت چون جیورجیوس لەمەڕ مێژووی ئەردەشیر (بڕوانە خوارەوەتر)، تووشی هەڵەیەکی گەورە هاتوە.

راستە کە «کرۆنۆلۆجییەکانی مسعر ـ کە بە گوێرەی ئەوان، ئاگرەکە بۆ ماوەی

٧٠٠سالٚ هەر ڕۆشن بوە، ئاماژەیەک بە بەشی سەرەتایی سەدەی سێهەمی زایینی و بۆ نموونە بە سەردەمی ئەردەشیر دەکات، بەڵام ئیشارەتەکەی گەلێک تاریک و نادیارە و هیچ شتێک لەسەر راگوێزرانی ئاورەکە لە گەنزەکەوە بۆ شیز نادرکێنێ. هەروەها ئاشکرا نییە نیازی لە «بوون» ی ئاورەکە بۆ ماوەی حەوت سەدە، چییە؟ شتێکی چاوەڕوان نەکراو دەبێت ئەگەر ئاگرەکە لەسەدەی چوارەمی هیجری و لەو کاتەدا کە مسعر چاوی بە «الشیز» کەوتوە، هەر رۆشن بووبێت.

مەسعودی (٤ ، ٧٤) و هەروەها «ابن فقیە» ل ٢٤٦٠ راپۆرتی گرنگیان لەسەر راگۆیزرانی ئاگری «ئازەرگوشەسب» بۆ شوینی تازە هەیە. نوسراوەکەی مەسعودی لەسەرەوەتر هەڵسەنگێنرا و وا راپۆرتی «ابن فقیە» یش لە خوارەوەدا باسی لێ دەکرێ:

«* ئازەرگوشناسپ» - ئاگری کەیخوسرەوە، لە ئازەربایجان بوو بەڵام نەوشیروان بردی بۆ الشیز».

هەردوو راپۆرتەکە وەک یەک دەچن بەڵام مەسعودی، بەپێی عادەت، الشیز (و) «والهران» ی وەک [دوو ووشەی] «معطوف» چاولێکردوە، کە یەک ناوچەی جوغرافیایی (بلاد) دەگرنەوە. مەسعودی دەبێ گوتبێتی ئاگرەکە لە «*والهران» ەوە برا بۆ گۆلی الشیز و وشەی ناساییەکانی «ابن فقیە» یش دەبێ بەهۆی هەڵسەنگاندنی شوێنی پڕ رەمز و رازی تەختی سولەیمانەوە ئەزموون بکرێ. تەنانەت لەسەردەمی مغولەکانیشدا «مستەوفی» لەیلان (گەنزەک) ی لەژێر ناوی «تومان» ی[189] مەراغەدا (لە ئازەربایجان) هێناوە ( نزهت القلوب، ٨٧)؛ لە کاتێکدا «تەختی سولەیمان» ی ئەودەم لەژێر تومانی «ئیجەرود» ( کذا، لەجیاتی «ئەنجەرود» ی دەقە چاپکراوەکە) لە عێراقی عەجەم ناودەبات (ل ٦٤).

شایەدی دانی مەسعودی و ابن فقیە لەسەر راگوێزانی ئاگرەکە لە لایەن نەوشیروانەوە (٥٧٩ ـ ٥٣١ ز)، بناغەی لەسەرهەندێ نەریتی ئەدەبی زەردەشتی دانراوە[190] وهەندێ سەلماندنی ناڕاستەوخۆشی لە «جیۆرجیوس پیسیدێس» وەرگرتوە.

ئاماژەکردنی ئەوی دوایی [واتە جیۆرجیوس] بە ئەردەشیر ([کەدەڵێ:] «٦٠ + ١٦ ساڵ لەمەوپێش»)، گەلێک سەرنج راکێشە چون ٥٥٠ = ٧٦ - ٦٢٦ و ئەوەش لەگەڵ تەئریخی نەوشیرواندا یەک دەگرێتەوە. وا هەیە جیۆرجیوس بێ ئەوەی خۆی ئاگادار بێت





مێژووی راگوێزرانی ئاگرەکەی بۆ تەختی سولەیمان پێ راگەیاندبێتین.

ناوی « الشیز» ، هەروەها لە [نووسینی] «ابن خوردادبیە» ، ١١٩دا، رەنگ دەداتەوە ئەویش لەو شوێنەدا کە بەشێوەیەکی جیاواز باسی «جەنزە» ـ شاری (خوسرەو) ی پەرویز[191] دەکات، ئاورگەی « ئازەرگوشنەس»[192] لەوێ دادەنێ کە شاهانی زەردەشتی، دوای گەیشتن بەپادشاهی، لە «المدائن» (تیسفون) ەوە، بەپێیان دەهاتنە زیارەتی. مەسعوودیش (تنبیە، ٩٥)، بە هەندێ هەڵەوە لەمەڕ ناوی ئاورگەی «ئاذر.خش»[193]، لە جیاتی «*ئازەرجوشنەس»[194]، هەمان بۆچوون دووپات دەکاتەوە.

لە پێش وێران کرانی ئاورگە لە لایەن هیراکلیۆسەوە، خوسرەو گەنجینەی جەواهراتەکەی و بەڕواڵەت ئاگرەکەشی لە شیز راگوێست، بەڵام بۆی هەیە کاتێ کۆتایی بە شەڕ هات، ئاگرەکەی لە شوێنی خۆیدا دامەزراندبێتەوە.

لە کۆتایی پادشاهی ساسانیەکاندا، بنەماڵەی حاکمانی ئازەربایجان بۆ ماوەیەکی کاتی، دەوری گرینگیان لە رووداوەکاندا گێڕا؛ بڕوانە: ئیرانشەهر، ١١٣ ـ ١١٢، یەکیان «بەهمەنی جادوویە» بوو، کە شەرحێک سەبارەت بەو لە [تاریخی] تەبەریدا، ٤/١، دەوروبەری [لاپەڕە] ٢٠٥٣ هاتوە و تێیدا دەڵێ «ئەو [واتە «بەهمەن»] شاه (مەلیک) ێک بوو کە ئەوان لە الشیر[195] «ملکە» واتە کردیان بە شاه. ئەو ناوەی کە بەبێ هیچ گومانێک دەبێ لەشێوەی «*الشیز» دا بخوێنرێتەوە، نیشاندەری گرنگایەتی لە مێژینەی شۆینەکەیە. تاماوەیەک دوای فتووحاتی عەرەبیش، زەردەشتیەکانی الشیز تووشی ئازار نەهاتن چون لە ژێر [حوکمی] عومەر دا راگەیێنرابوو: «نابێ پێش بە داب و نەریت و هەڵپەڕکێ (زەفین) ی خەڵکی شیز لە رۆژانی جەژنیاندا بگیرێ و هەروەها نابێ بەرهەڵستی راگەیشتن بەکاروباری خۆیان لێ بکرێ.» (بلاذری، ٣٢٦). ئێمە ناتوانین بڵێین ئەو نەریتانەی گوترا، ئایا ئاورگەکەشیان دەگرتەوە یان نا؟

لەسەرەوە، باسی یادی «الشیز» لە نێو جوغرافی نووسەرە عەرەبەکان (ابن خوردادبیە، مسعودی و مسعر) کرا. جێگەی سەرنجە، کە جوغرافیانووسەکانی «نەریتی بەڵخی»[196] سەدەی دەهەم (وەک اصطخری و ابن حوقل)، هیچکام باسی الشیزیان نەکردوە و «یاقووت» یش لەمەڕ شوێنایەتی ئاورگەکە بێگومان تووشی گێژ و گومی هاتوە.

لە سەردەمی مغول دا، ناوێکی تازە، یادی «الشیز» لەبیری خەڵک دەباتەوە.

خوێندنەوەی ئەزمونگەرانەی ناوەکە لەلایەن راولینسنەوە، بریتی بوو لە «سەتووریق»[١٩٧]، بەڵام چاپی «لێ سترێنج»[١٩٨] لە [کتێبی] «نزهت القلوب»، ل ٦٤، بیچمگەلی جیاوازی «سفوریق»[١٩٩]، «سقوریق»[٢٠٠] و «ستروق»[٢٠١] بەدەستەوە دەدات. ئەو شێوە خوێندنەوەیەی وا لە [کتێبی] «رشیدالدین» دا هاتوە ـ واتە «سقورلوق»[٢٠٢] هەندێ باشترە (بڕوانە چاپی Jahn، ل ٣٥٠). رەشیدالدین ناوی «سقورلوق» وەک شوێنی کاخی پادشاهی مغول دەبات و ئەوەش لەگەڵ قسەی «مستوفی» دا یەک دەگرێتەوە کە دەڵێ ئەو کاخە لەلایەن «ئاباقا» [خان] ەوە[٢٠٣] دروست کرایەوە. پاشماوەکانی ئەم بینایە ئێستاش لە تەختی سولەیماندا دەبینرێت[٢٠٤]. تەنانەت «عالەم ئارا[ی عەبباسی]» ش، ل ١٠٦، باسی حوکمی «سوجاس و سیورلوق (*سوقورلوق»)[٢٠٥] لە سەردەمی شاە تەهماسب دا دەکات زۆر واهەیە ناوی ئەمڕۆی چۆمی «ساروق» کە لەتەختی سولەیمانەوە دێتە خوارەوە، هیچ شتێک نەبێ جگەلە هاسان کراوەی ناوە «تورک و مغولییە» کە و ئەوەش بووبێتە هۆی نەناسینەوەی وشەکە[٢٠٦].

[وشەی] تەختی سولەیمانی ئەمڕۆ، وێ دەچێ دروستکراوێکی تەواونوێی (دوای سەفەوی) لە خەیاڵاتێکی ئەفسانەیی خەڵک بێت. بۆچوونی راولینسن (ل ٦٨)، کە دەڵێ واهەیە [تەختی سولەیمان] پەیوەندیی بە ناوی حاکمی تورکمانیی کوردستان ـ سولەیمان شاهی «* ئیڤا» وە هەبێت، هیچ بناغەیەکی نییە چون حکوومەتی ئەو [واتە سولەیمان شاهـ] ئەوناوچە باکوورییانەی نەدەگرتەوە. بڕوانە نزهت [القلوب]، لاپەڕە ١٠٧.



## بەشی پێنجەم:

## فرەئاتە . ڤێرە (Phraata-Vera)

ئێستا، ئەگەر بگەڕێینەوە سەرباسی لە شکرکێشانەکەی «ئانتۆنیوس»، پێویستە لە بیرمان بێت ئەو ئاڵ و گۆڕە گرنگانەی لە ماوەی شەش یا حەوت سەدەدا لە ئازەربایجان رووی دابوو، ساڵی ٣٦ی پێش زایین لەسەردەمی نەوشیروان و خوسرەوی پەرویز جیادەکەنەوە.

کاتێ ئانتۆنیوس رێبەرایەتی لەشکری خۆی دژ بە پارتییەکان دەکرد، ئاترۆپاتەن هێشتا هەر لە ژێر حوکمی حاکمی پشتاوپشتی خۆی «ئەرتەڤەزد»[٢٠٧] ـ یارمەتیدەر و باجدەری شاهی گەورەی پارتییەکان «فرەئاتیس» ی[٢٠٨] چوارەم بوو و دوور نیە بنەچەکی [ئەوحاکمە]، بگاتەوە «ئاترۆپات» (سترابۆن، ١١، فەسڵی ١٣، ل١)، کە بۆ ئەوەی نەکەوێتە ژێر حوکمی ئەسکەندەرەوە، سەربەخۆیی ئازەربایجانی راگەیاند.

درەنگتر، «ئەرتەڤەزد» لەگەڵ رۆمییەکان کەوت و «ئیۆتاپە» ی[٢٠٩] کچی، بوو بە دەزگیرانی «ئەسکەندەر» ی کوڕی ئانتۆنیوس و کلیۆپاترا. دوایین شاە [ی سلووکی] بریتی بوو لە «گایوس جولیوس ئەرتەڤەزد»[٢١٠] کە لە بنەماڵەی «ئەرتەڤەزد» بوو و لە «ڕۆما»[٢١١] مرد.

بارودۆخی سەمەرەی «ئاتروپاتەن» بۆتە هۆی دامەزرانی حکوومەتێکی تایبەت و هیچ پێویست ناکات پێتەختەکەی بەو شوێنە بزانین کە زێدی حاکمی ناوچەکە و لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتێکی گەورەدا بووبێت.

لەسەردەمی فتووحاتی عەرەبدا، سنوورداری ئازەربایجان لە «ئەردەبیل» دادەنیشت کە دوورە لە حەوزەی گۆلی ورمێوە. ئێمە تەنانەت بەو مەسەلەیەش نازانین کە ئایا شاهی ئازەربایجان چەندەی توانای کۆنترۆڵ کردنی خەڵکی چادرنشینی کادۆسی[٢١٢]، ئەمەردی،[٢١٣]، تەپیری[٢١٤] و سیرتی[٢١٥] هەبوو، کە لە لێواری باکووری ڕۆژئاوای خاکەکەی دا دەژیان: سترابۆن، ١١، فەسڵی ١٣، ل ٣.

ئێمە تەنیا سەر خەتە گشتییەکانی جوغرافیای لەشکرکێشانی ئانتۆنیوس دەزانین.

نووسەری سەرەکیی مێژووی ئەم سەفەرە، «کوینتوس دێللیوس» ە،[٢١٦] کە وێ دەچێت لەباری جوغرافیا نووسییەوە گەلێک لە خوارەوەتری رادەی «کنائوس پۆمپیوس تێئۆفان» ی خەڵکی «میتی لینە»[٢١٧] وەستابێت وا ئێمە بۆ زانیاریی زۆر و بایەخدار لەمەڕ ئەو وڵاتانەی وا «پۆمپیوس» داگیری کردن قەرزداری ئەوین[٢١٨].

ئانتۆنیوس ـ بە سوپایەکی گەورەی ١٠٠ هەزار کەسییەوە دەبوایە وڵاتی هاوپەیمانەکەی خۆی واتە «ئەرتەڤەزەد» ی ئەرمەنستان تێپەڕ بکات. بەگوێرەی «پلۆتارخ» (کە لە دەوروبەری ساڵی ١٢٢ی زاینیدا، مردوە)، لە [کتێبی] Vita Antonii، فەسڵی ٣٨دا، ئانتۆنیوس ئەرمەنستانی بەرەو دەستەچەپی خۆی بەجێ هێشت. ئەم دەست نیشان کردنە بە رواڵەت ئاماژە بە «پێتەخت» ی ئەرمەنستان (ئەرتەخەتە[٢١٩]) دەکات کە کەوتۆتە لێواری باکووری چۆمی ئاراسەوە.

ئەوە نەگونجاو نییە کە هێڵی ڕۆیشتنی دواجاری ئانتۆنیوس لە دوو شوێنی [نووسراوەکانی] «سترابۆن» دا، رەنگی دابێتەوە. سترابۆن لە بەرگی ١١، فەسڵی ١٤، ل ١٤دا، باسی چیاکانی ئەرمەنستان دەکات و دەڵی «ئاڤوس»[٢٢٠] و «نیڤەرۆس»[٢٢١]، سەربە [چیای] ئاراراتی گەورەن و[٢٢٢] یەک لەوانە، واتە «ئابوس» کەوتۆتە نزیک رێگەیەک وا رووگەی «باریس»[٢٢٣] (پاراتۆن تیس باریدۆس)[٢٢٤] تێپەڕ دەکات و بەرەو «ئەکبەتانە»[٢٢٥] دەچێت[٢٢٦].

هەرچەندە وا دەردەکەوێ نیازی سترابۆن لە «ئابوس» لوتکە باشوورییەکانی چیای ئارارات بێت، شتێکی گونجاوە کە ئەم ناوە لە [ناوی] ناوچەی بچووکی «ئاواجیق» دا[٢٢٧] رەنگی دابێتەوە ـ شوێنێک کە پەیوەندیی نێوان «ئەرزرۆم» و شاری «خۆی» لە وێوە دەبەسترێ.

سترابۆن لە بەشێکی دیکە [ی کتێبەکەی] دا (١١، بەشی ٢،١٤)، شەرحی دەدات کە ئەو، دوای «نیفاتس»[٢٢٨]، چیای «ئابوس» ی دیت وا «فوڕات» و «ئاراس» لەوێوە سەرچاوە دەگرن؛ یەکەمیان بەرەو رۆژئاوا و ئەوی دیکەیان بەرەو رۆژهەڵات دەڕۆن، ئینجا چیای «نیبەروس» ە[٢٢٩]، کە هەتا «مێدیا» دەکشێت.

لە راستیدا، سەرچاوەی دوو چۆمی «موراد سوو» (فوراتی رۆژهەڵات) و «ساری سوو» کەوتوونەتە دراوسێیەتی «ئاواجیق» ـەوە. بە هۆی ئەو راستیەوە کە بە قسەی سترابۆن (١١، فەسڵی ١٣، ل ٤)، «نیفاتس» لە زاگرۆسەوە سەرچاوە دەگرێت، وا هەیە نیازی لە





«نیەروس» بریتی بێت لەو گردانەی وا بە درێژایی رێگای ئاواجیق ـ خۆی، بەرەو باشووری رۆژهەڵات کشاون و پاشان لە درێژایی بەری باکووری گۆلی ورمێدا قوت بوونەتەوە.

بەڵام هەموو ئەم دەست نیشان کردنانە، تاریک و نادیارن. پلۆتارخ ـ بە بێ هیچ چەشنە شەرحێکی سەرەتایی، دەگاتە سەر [باسی] ئابلۆقەی «شاری گەورەی فرەئەتە» لە لایەن «ئانتۆنیۆسەوە»[٢٣٠] و دەڵێ «ژن و منداڵی شاهی مێدیا لەوێدا بوون».

دیۆکاسیۆس (دوای ساڵی ٢٢٩ی زاینی دەنووسێ)، چاپی Boissevian، ١٨٩٨، ٢، ٣٠٩، پێتەختی «پڕەئەسپە»[٢٣١]، بە (پادشاهی پرەئەسپیس، شوێنی چاوپێک کەوتن)[٢٣٢] ناو دەبات. ئەم هێرشە، دەبێ لە هاوین یا پایزێکی زوو دا سەری گرتبێت چون بە قسەی پلۆتارخ (فەسڵی ٨ ـ ٣٧)، ئانتۆنیوس گەلێکی پێخۆش بوو زستان لە گەڵ کلئۆپاترا دا بەرێتە سەر و گوێی نەدەدایە پلانی سەرەکی بۆ گرتنی میدیا "پێش ئەوەی پارثییەکان لە سەرەتای بەهاردا زستانە هەواری خۆیان بە جێ بهێڵن".

ئەو [واتە ئانتۆنیۆس]، ماوەیەک دوای «اعتدال» ی شەو و رۆژ (٢٣ی سپتەمبر) و پێش هاتنی زستان، لە "فەرەئاتە" کشایە دواوە (فەسڵی ٤٠).

ئەم تەفسیلاتە، بۆ تێگەیشتنی باسەکەی سترابۆن لەمەڕ مێدیای ئاترۆپاتەن (١١، فەسڵی ١٣) کە ئەویش راستەوخۆ لە «دیللیوس» ی[٢٣٢] وەرگرتوە، بێ کەڵک نیە. دیللیوس "دۆستی ئانتۆنیۆس، ئەو کەسەیە وا سەبارەت بە لەشکر کێشانی ئانتۆنیۆس بۆ سەر پارتیەکان بابەتێکی نووسیوە و خۆی لە لەشکرەکەدا وەک فەرماندە، بەشداری کردوە".

مخابن، کۆپلەی پەیوەندیدار بە باسەکە عەیبی هێناوە کە دەڵێ: "پێتەختی هاوینیان، لە دەشتاییەک لە گەزەکە «و شوێنی زستانیان» لە قەڵای قورس و قایمی «ڤێرا» (ئوێیڕا)[٢٣٣]یە، کە لە کاتی لەشکرکێشەکانی ئانتۆنیۆس بۆ سەر پارتیەکاندا، گیرابوو".

ئەو وشانەی لەناو نیشانەی < > خراون، لە لایەن ئیدیتۆر «گرۆسکۆرد»[٢٣٤] ەوە زیاد کراون، بەڵام ئەوەش خۆی موشکیلەی وەرزەکانمان بۆ زیاتر دەکات. وەک ئێمە نیشانمان داوە، دەبێ لە شوێنێکی نزیک «لەیلان» چاو بۆ گەنزەک بگێڕین، بەڵام ئەو شوێنە کەوتۆتە دەشتاییەوە[٢٣٥] و لە هاویندا شوێنێکی زۆر گەرمە (راولینسن)، لە کاتێکدا هیراکلیوس هەوای زستان (فێبریوەری و مارچ) ی ئەوێی پێ خۆش بوو.

له [نووسینەکانی] پلۆتارخەوە دەتوانین بگەینە ئەو ئاکامەی کە بنەماڵەی شاهـ لە کاتی گیرانی «فرەئاتە» و بە ماوەیەکی زۆر پێش «اعتدال» ی پایزەدا ـ کە بۆی هەیە بە کۆتایی هاوین دابنرێ، دەست بەسەر کرابن. دەکرێ چاوەڕوانی ئەوەش بین دەقی ستراپۆن، شوێنی ناوەندی هاوینی [پارثیەکان] بە «فرئاتە» و هی زستانیان بە «گەنزەک» دابنێت.

هەروەها زانراوە کە [236] قەلای «ڤێرا»، هەمان شاری «گەزەکە» بووبێت و بەس، کە پێشتر راولینسن (ل١٢٣) لە گەڵ «ڤەرە»[237]ی «ڤەرەرەت»[238] و هەروەهاله گەڵ ناوی کەسایەتییەکی رەسمی واتە ڤەریس مەناس[239]دا، بەراوردی کردوە و گوتوویەتی ئەو کەسایەتییە بە نزیک بوونەوەی هیراکلیۆس لە گەنزەک، هەڵات.

هەر چۆنێک بێت، وەرەرەت، ناتوانرێ بە هاسانی لە گەڵ * وەرە ـ رووت دا (بروانە سەرەوەتر) بەیەک دابنرێ و تەفسیری ڤاریث مەناس هێشتا جێی متمانە نییە.

توێژێنەرە ئێرانیەکان، هەندێ وشەی هاوپەرای وەک «وەرسمە – پانە»[240] بەواتای «کەسێک کە چاوەدێریی مەسەلەی بەربەرەکانی دەکات» یاخود «وەرزەنە ـ پانە»[241] بەواتای «چاوەدێریکەری شار» یان پێشنیار کردوە، تەنانەت دەگونجێ بیچمە یۆنانیەکەی هیچ نەبێ جگەلە تەرجەمەی «مەرزپان»ی فارسی بەواتای سەرۆکی تاقمێکیی سوپایی. لە کتێبەکەی پرۆکۆپیۆسدا[242]، ڤاریێت مەناس [243]شان بەشانی پیت یاکسیس [244] دا هاتوە کە گەورە پیاوێکە هەمان ئەرک و کاری لە ئەستۆ بوە.

نە پلۆتارخ و نە دیۆکاسیۆس، باسی گەنزەکیان نەکردوە، بەڵام هەردوو، ناوی پێتەخت واتە «فرئەتە / فرەئەسپە» یان وەک شوێنێک هێناوە کە ئانتۆنیۆس گرتوویەتی. ئەوەش دەمانگەیێنێتە ساغ کردنەوەکانی ستراپۆن لە بەرگی ١٣، ل ٣دا کە دەڵێ: پادشاهی ئەوان، هی هاوینیان لە («پرەئاتیس»، هی زستانیان) لە زەوییەکی دەشتایی دا لە گەزکە هەڵکەوتوە، لەلایەن خوسرەوەوە پارێزگاری لێ دەکرا، کە چاوەدێری «ڤێرا» ی دەکرد – ئەو شوێنەی وا ئانتۆنیوس هێرشی کردە سەری.[245]

ئەوە مارکوارت بوو، کە لە ئیرانشەهری ١٩٠١، (ل ١٠٨) دا، ئەم شێوە ساغ کردنەوەیەی خستە بەر چاو و تەنیا یەک شوێنی بەتاڵ هێشتەوە کە دەبوایە ناوی هاوینەهەوار [ی پارثیەکان] بێت و ئەویش من بە «فرەئەتە» ی دەزانم.

موشکیلەی ئەو راستکردنەوە سروشتیە لەوەدایە کە ئەو «ڤیرا» یەی وا ئانتۆنیۆس



دەستی بە سەرداگرت، لە «فرەئاتە» ی پلۆتارخ وەرگیراوە. بیست و هەشت ساڵ دواتر، «کاتالۆگ»ی مارکوارت، ل ١٠٩، شێوەیەکی تازەتری خوێندنەوەی [وشەکان] پێشنیار دەکات، کە بریتیە لە ‹هی زستان› لە دەشتایی گەزەکە بنیات نرابوو و هی هاوینیان لە چیاکانی فرا ئەسپە، کە شوێنێک بوو بۆ چاوەدێری کردنی ڤێرا و هتد...[246]. ئەم ساغکردنەوەیەی دووهەمجار، پەیوەندیی نێوان «ڤێرا» و گەنزەک لەناو دەبات، بەڵام سەربەستییەکی زیاتر بە دەقەکە دەبەخشێ.

سەبارەت بە بارودۆخ و شوێنایەتی فرەئەتە، بەتلەمیوس، ٦، ٢، (چاپی Wilberg، ل ٣٩٣)، ئەم ناوانەی خوارەوەی لە ریزی یەکتردا هێناوە:

| | درێژایی (جوغرافیایی) | پانایی جوغرافیایی |
|---|---|---|
| زەزەکە (گەزەکە)[247] | ٤٠ ٨٣ پلە | ٣٠ ٣٩ پلە |
| فەرائەتە | ٣٠ ٨٥ پلە | ٣٠ ٤٠ پلە |
| فەنائەتە | ٣٠ ٨٦ پلە | ٤٠ پلە |
| ئەگەنزەنە | ٨٩ پلە | ٣٠ ٣٩ پلە |

بەتلەمیوس، سەرچاوەیەکی زۆر دڵنیا نییە[248] و تەنیا دەبێ سەرنج بدەینە ئامانجە گشتیەکانی بێ ئەوەی متمانەی زۆر بەو شتانە بکەین کە رێکی خستوون و زۆر وا هەیە گەورە کرابێتنەوە. نموونەکان هەمووی بە «مایل» (Mile) نیشان دراون و بریتین لە: گەزەکە – فەرەسپە ـ ١١٧، ٣؛ لەوێوە بۆ فەنەسپە ـ ٩٠، ٧؛ و لەوێشەوە بۆ ئەگەنزەنە ـ ٢٠٤، ٤ مایل.

هیچ گومانێک لەوەدانیە کە ئەو فەرەسپەیەی وا کەوتبوە باکووری رۆژهەڵاتی «گەزەکە»، دەبێ هەمان «زەنجان» بێت (ئاندریئاس لە «پاولی ـ ویسسوە» دا).[249] «فەنەسپە» ـ کە بەم شێوەیە نەبێ ناناسرێتەوە، دەبێ لە سێیەکی فاسیلەی «فەرەسپە» بۆ «ئەگەنزە» دا چاوی بۆ بگێرین (بروانە خوارەوەتر[250]).

نزیکترین ناوەندی گەورە لە باکووری رۆژهەڵاتی "لەیلان" (واتە «گەنزەک»)، شاری مەراغەیە و سەرەڕای جیاوازیی زۆر لە فاسیلەکاندا (٦ فرسەخ دەوروبەری ٢٤ مایلە [کیلۆمەتر؟]. لە جیاتی ١١٧٫٣ مایلەکەی بەتلەمیوس!)، من ئەم مەترسیە بۆ خۆم دەکڕم کە «فرەئەتە» و «مەراغە» بەیەک دابنێم ـ بەتایبەت لەو روانگەیەوە کە ناوی مەراغە لە





[کتێبی] بلاذری ل ۳۳۰دا بەم شێوەیە هاتوە: "وکانت المراغە تدعی افراهرود". واتە بە روالّەت "ئەفراهروذ "[٢٥١] [بە ذال]، کە یاقووت (٤، ٤٧٦)، بە شێوەی «ئەفرەزەهرود»[٢٥٢]ی هێناوە، ناوەکەی بە بێ هیچ گومانێک پەیوەندی بە ناوی رووباری «سۆفی چای» ەوە هەیە کە مەراغە کەوتۆتە سەر لێواری ئەو. سروشتی مەراغە ـ کە لەلای باکوور بە هۆی [چیای] سەهەندەوە پارێزراوە و بە ئاو و گیا دەور دراوە و لەو پەڕی باشی دایە.

هەربۆیەش هەم عەرەب (سەدەی حەفتەم و نۆهەم) و هەم مغول (سەدەی سێزدەهەم)، [مەراغە] یان کردۆتە شوێنێکی سەرەکی بۆ مانەوەی خۆیان. خاکی مەراغە هیچ کاتێ بە شێوەی سیستەماتیک هەڵنەکۆڵراوە، بەڵام شوێنەکەی گەلێک کۆنە[٢٥٣] و بۆ دانیشتوانی ئاترۆپەتان شتێکی سروشتی بوە «ئەفراهرود» وەک هاوینەهەوارێک بۆ خۆیان هەڵبژێرن.

ئیلخانەکانی سەرەتاییش وەک ئەوان [واتە وەک عەرەب و مغول] لە مەراغەدا نیشتەجێ ببوون و زستانان بەرەو دەشتاییەکانی جەغەتوو ـ لە دراوسێیەتی گەنزەکی کۆن دەهاتنە خوارێ. قەڵای ناسراوی «رویین دز» لە نزیکەوە پێوەندی بە مەراغەوە هەبوە. قەڵاکە، کەوتبوە فاسیلەیەکی ۳ فرسەخی و لە سەردەمێکی درەنگتردا وەک پەنا و حەشارێک بۆ ژنان و گەنجینەی جەواهیرات، کەڵکی لێ وەردەگیرا.

من بە شێوەیەکی ئەزموونی، [قەڵای] ناوبراوم بە هەمان شوێن ناسیوەتەوە کە لە نەخشەکانی رووسیدا بە «یای شەهەر»[٢٥٤] (بەتورکی واتە «هاوینەشار») ناسێنراوە و کەوتۆتە ١٦ کیلۆمەتری (دەوروبەری ۳ فرسەخی) لای سەرووی مەراغە لە ژوورەوەی داوێنی [چیای] سەهەند.

ئەگەر پێویست بێت «ڤێرا» بە فرائەتە (نەوەک بە «گەنزەک») ـەوە پەیوەندی بدرێت، واهەیە هەمان «بینایەی چاوەدێری»[٢٥٥] بێت، کە ئانتۆنیوس هەوڵی گرتنی دابوو[٢٥٦].

سترابۆن، نووسینە سەخڵەتەکەی خۆی بە ئاماژە کردنێک بە فاسلیەی نێوان «ڤێرا» و ئاراز (لە زمان دیللیوسەوە) کۆتایی پێ دێنێت. سترابۆن ئەم فاسیلەیە بە ٢٤٠٠ «ستاد»[٢٥٧] یان ٢٦٤.٥ مایلی ئینگلیزی دادەنێ. ئەگەر نیازی سترابۆن لە «ئاراز» نزیکترین بواری چۆمەکە (لە نزیک «جولفا») بێت، ئەوا ئەم فاسیلەیەی گوتراوە گەلێک زۆرە و لە راستیدا (لە رێگەی سەهەندی رۆژهەڵاتەوە) ناکاتە ١٦٠ مایل تا لەیلان و ١٧٠ مایل تا مەراغە و تەنانەت ٢٠٠ مایل تا تەختی سولەیمانیش.



هەرچۆنێک بێت، ئەگەر نیازی سترابۆن (وەک پلینی)، ئاراز بووبێت نەک جولفا، ئەوا دەبێ ٩٠ مایلی دیکە لە فاسیلەکە زیاد بکرێ و لە ئاکامدا، رێگای بەری رۆژهەڵاتی مەراغە، پێداویستیەکانی ئەم باسە دەگرێتەوە (٢٦٠ مایل لە جیاتی ٢٦٤.٥). راولینسن بەوپەڕی لێزانییەوە لەمەڕ جوغرافیا و کاری سوپاییەوە، شوێنی پاشەکشەی پڕکارەساتی ئانتۆنیۆس لە سەر ئەو گریمانە دادەنی کە هێرشەکە لە تەختی سولەیمانەوە دەستی پێکردبیت و پاشان رێگای رۆژهەڵاتی سەهەندیان گرتبێتە بەر[٢٥٨].

بە گشتی، راولینسن ماوەی رێپێوانی رۆژانەی سپای ئانتۆنیۆس بە ١٠ مایل دادەنێ، بەڵام چون پارثییەکان بەردەوام هێرشیان دەکردە سەریان و ١٤ جار لە گەڵیاندا کەوتنە شەڕەوە، ناتوانرێ هیچ شتێکی بەمتمانە لەمەڕ قۆناغی جۆربەجۆری شەڕەکە بگوترێ. من لە خوارەوە، شەرحەکەی راولینسن بەکورتی دێنمەوە:

بە لەبەرچاو گرتنی روانگەی جیاوازی خۆم، پێویستە ئەم ئاڵ و گۆڕانە لە بەرنامەکەدا پێک بێنم:

لە بەر ئەوەی رۆمییەکان بە باروجانتای قورسەوە رێگەیان دەبڕی و بەتایبەت لە سەرەتاوە دەبوایە خۆیان لە گەڵ نەزم و نیزامی پاشەکشێ دا رێک بخەن، سێ رۆژ بۆ تێپەڕبوونی فاسیلەی نێوان مەراغە یان رویین دز تا دۆڵی سەرووی «قەرەنغوو» کە بۆی هەیە وەک شوێنی هێرش کردنی پارثییەکان بگێرێتە بەرچاو، زۆر نییە.

هێڵی دواتری پاشەکشێ، دەبێ داوێنەکانی سەهەند ـ لە «قەرەنغوور» ـەوە تا دۆڵی «ئۆجان»[٢٥٩] بووبێت و پێکدادانی هەرەگەورەیان لەگەڵ پارتیەکانیش هەر لەم شوێنەی دوایی [واتە دۆڵی «ئوجان»] دا رووی داوە. پاشماوەی ئەو رێگایەی ئانتۆنیۆس بڕی، لەگەڵ شەرحی راولینسن لەمەڕ چۆمی سوێراو (ئاجی ـ چای) دا یەک دەگرێتەوە، کە تاقە بەشی متمانە پێکراو لە راپۆرتە رازاوەکەی «پلۆتارخ» ـە.

[بۆچۆنی] جیاوازی راولینسن سەرەتا هەندێ سوودمان لە مەڕ فاسیلەکان پێ دەبەخشێ. بەڵام دەبێ رێگاپێوان بەدەوری لووتکەکانی لای باشووری رۆژهەڵاتی سەهەند و پەڕینەوە لە دۆڵی «ئوجان» کارێکی ئەستەم بووبێت و کاتێکی زۆری بردبێت. لە ئاکامدا ریوایەتی سەبارەت بە مەراغە لەم لەشکرکێشانەدا تووشی موشکیلە نابێت.

بە گشتی، پێویستە پەسندی چەند جیاوازییەک لە نێوان لەشکرکێشانەکەی

ئانتـۆنیـوس و هیـراکلیـۆسدا بکەین. ئانتـۆنیـوس قـەتاری جانتـاکـانی خـۆی ون کـرد و دوژمنێکی گـەلێ چالاکـیش لە بەرانبـەریدا وەسـتـابوو. هەروەها وێ ناچێ داسـتـانی [لەشکرکـێشـانەکـەی] بگاتە ئەودیوی خاکی «ئەرتەوەزد» ی ئاترۆپەتان. بەش بە حـاڵی خۆی، کارێکی گەلێک هەڵە دەبوو ئەگەر بەرەو پێشتر و هەتا تەختی سولەیمان بچوایەتە قولایی خاکی دوژمنەوە[٢٦٠].

لە سـەر رێگای چوون [بۆ تەختـی سـولەیمان]، دەبێ دەنگ و باسی هاتنی سـوپاکەی ئانتـۆنیـۆس بۆ نێـو گـەنزەک، [لەناو خـەڵکی ناوچەکـەدا] بلاو بووبێـتـەوە، لە کـاتێکدا واهەیە بۆ گرتنی «فرائەتە» ـ پێش ئەوەی بگاتە گەنزەک و مەسەلەی شارێکی گەورەی نێو دەشتایی چارەسەر بکات، دەبوایە ئامادەی «دژی هێرش» ی سوپای سووکی پارتییەکان بووبێت و لە شوێنێکی نزیک «بناو»[٢٦١] دا لە رێگای ئەسلّی لای دابێت.

ئێمـە بە هیچ شێـوەیەک نابێ ئەو راستـیە لە بیر بەرینەوە کـە لەشکرکـێشـانی ساڵی ٥٩١ی زایینی بووبوە هۆی کـەشفـیـاتی زۆری ولاتەکـە و ئەو زانیـاریانەی وا هیـراکلیـۆس ئەوپەڕی ئاگـاداری لێـیان هەبوو جیـاواز بوو لە ئانتـۆنیـوس کە ئەو چەشنە ئیـمتـیـازانەی نەبوو و تەنیا بە ناشارەزایی دەچووە پێشێ.

ئێـسـتـا، کە هەمـوو ئەو ئەو دیاردانەی وا لێـیان دڵنیـا نەبووین هەڵـسـەنگێنران، وەک ئاکامێکی کارەکە بۆ جیاکـردنەوەی «فرائەتە» لە گـەنزەک و شیـز و دیاری کردنی شـوێنی «فـرائەتە» لە مـەراغـەی ئێـسـتـا بە پێـویسـتـی دەزانم جەخت لە سـەر وێچوویی ناوی «فرائەتە» و «ئەفراهرووذ» بکەم.



**بەشی شەشەم:**

## گۆلی چێچەست

جیا لەو موشکیلانەی وا بەهۆی دەقەکانەوە هاتوونەتە پێشێ، پێویستە خۆمان لەگەڵ هەندێ ئالۆزیی لە تۆپۆنیـمی ئازەربایجـاندا رێک بخـەن. لە سـەردەمی سـاسـانیـاندا [٦٥٢-٢٢٤ ز] مـیـتـۆلۆژی ئێـران ـ کـە بە گـشـتی رووی لە بەشی رۆژهەڵاتی ئێـران بوە،[٢٦٢] خراوەتە نێو زەمینەی رابردووی ئازەربایجانەوە.

ناوە راستەقینە جوغرافیاییەکان ـ وەک «گەنزەک» ، شوێنی دیاریکراویان هەبوە، بەڵام ئەفسانەکان دەتوانن لە هەمـوو شـوێنێک دابنرێن یاخود هاوکات لەگەڵ یەکـتردا لە چەند شـوێنی جـیـاواز دابنرێن. گـۆلێکی تەواو ئەفـسـانەیی وەک «وەر- ی چێـچـەست» («چەیچەسـتـە» ی ئاڤـێـسـتـا)[٢٦٣] یەکـێک لەوانەیە[٢٦٤]، کـە تێـیـدا ئەفـراسـیـاب (فرەنرەسیەن[٢٦٥]) هەوڵی داوە لەو شوێنە لەدەست کەیخوسروە هەڵێت.

فیـردەوسی (٧، ١٤٠)، لە ریوایەتی خۆی لە مەڕ شەڕی نێوان خوسرەوی پەرویز و بەهرامی چۆبینەدا (بڕوانە سەرەوەتر)، دەڵێ خوسرەو بەرەو گۆلی «* چێچەست» رۆیی (ئەم ناوە نەریتیەی «خەنجەست»[٢٦٦]، راولینسن بەوریایی، لە بیچمی «چێچەست» دا ساغی دەکاتەوە).

وەک دەزانین، شەڕی مێژوویی [کەیخوسرەو و ئەفراسیاب] لە شوێنێک روویدا، کە راست کەوتبوە سەر گۆلی ورمێ و ئەوەش موشکیلەی ئەو مەسەلە تایبەتەمان بۆ چارەسەر دەکا. تەفسیلی مەسەلەکە، دەبێتە هۆی سەرسوڕمانی زیاتر لە مەڕ ئەفسانەی ئەفراسیاب (شاهنامە، چاپی Mohl، ٤، ٢٢٠ ـ ١٩٥).

ئەم قارەمانە ئێرانییە، پەنا دەباتە بەر ئەشکەوتێک لە نزیک «بەردەع» («پەرتەو»[٢٦٧] لە ئەوپەڕی قـەوقـاز[٢٦٨])، ئینجـا خـۆی دەخـاتە زەریایەکـەوە، کـە پێـی دەگـوترا «ئاب ـ ی خەنجەست (چێچەست) و ئەویش لە دراوسێیەتی ئاورگەی «ئازەرگوشنەسپ» بوو.

جـیـا لـەو گـێـژ و گـۆمـیـیـەی کـە لەمـەڕ شـێـوانی [ناوی] «ولەران» لە گـەڵ «ئەلران» سەرهەڵدەدات و پێشتر[٢٦٩] باسمان لێوە کرد، واهەیە بەردەع (یا «بەردەعە») هەمان مەراغە بێت، کە بە هەڵە خوێنرابێتەوە. هەمان هەڵە لە تێگەیشتنی «مسکویە» و لە راپۆرتەکەیدا

لەمەڕ هێرشی رووسەکان بۆسەر «بەردەعە» دەبینرێ[٢٧٠]. ئەم شێوە ساغ کردنەوانە، دەمانگەیێننەوە سەر گۆلی ورمێ و تەنانەت بەگوێرەی ئەو باسەی وا لەمەڕ ئەفراسیاب و بەستنەوەی لە «دورگەیەک» دا دەکرێ، شانسی ئێمە لەمەڕ ساغ کردنەوەی شوێنایەتی «مەراغە» زیاتر دەبێت لەبەر ئەوەی گۆلی ورمێ چەند دورگەیەکیشی لەنێو دایە.

لە روانینی سەرەتاییدا، وا دەردەکەوێ کە ناوی «چێچەست» و «الشیز» دوو بنەمای جیاوازیان هەبێ. بەڵام هەندێ نیشانە بۆ ئەو ئیحتماڵە بەدەستەوەن کە یەکەمیان [واتە چێچەست][٢٧١] لە دووهەم [واتە شیز] وەرگیرابێت[٢٧٢]. ئێمە دەتوانین شوێنی ئەو ئاڵ و گۆڕانە، تەنیا لە سەردەمی ئیسلامیدا هەڵبگرین. دەنگی /چ/ ی ئێرانی لە عەرەبیدا بە هۆی /ج/ و /ش/ ـەوە نوێنەرایەتی دەکرێ. بە گوێرەی تەبەری (١/٢، ٦١٦)، ئەفراسیاب خۆی لە گۆلاو (غەدیر) یکدا بە ناوی «بئرجاسف»[٢٧٣] بە واتای بیری «جاسف» شاردەوە.

جۆرایەتی دیکەی وشەکە، «بەرجاست»[٢٧٤] ـە و «هۆفمان»، ئەلفەکەی بە شێوەی «ئیمالە» دەخوێنێتەوە و لە بیچمی «بەرچیست» دا ساغی دەکاتەوە، لە کاتێکدا لەجیاتی «وەر» ی ئێرانی «بەر»[٢٧٥] دادەنێ و [سەرجەمی] بە واتای گۆڵ یا «ئەستێر» پەیوەند دەداتەوە.

کۆتاکردنەوەیەکی دیکەی لەم چەشنە، وا هەیە لە ناوی شوێنێکدا بەرچاو بکەوێ کە دوایین قۆناغی پێش گەیشتنە مەراغەیە و لە دەستووسەکاندا، تەواو گۆڕاوە: «ابن خوردادبیە»، ١٢٠، لە شێوەی سایرحاست یا خواسب[٢٧٦]؛ «قودامە»، ٢١٢، سواکاست[٢٧٧]؛ «موقەددەسی» امیوالحاسب، امیوالحاست[٢٧٨] دا نووسیویانە.

لە بەر رووناکایی دەقی «تەبەری» دا، واهەیە بتوانرێ بیچمی موقەددەسی وەک «بئرالجاست»[٢٧٩] (بیئرالچیێست[٢٨٠]) ساغ بکرێتەوە[٢٨١]. لە «فارسنامەی ابن بەلخی» (لل ٥٠ و ٧٩) دا ئاورگەی ئازەربایجان کەوتۆتە شوێنی «جیس» (< * چێس، چێچ >). هەروەها یاقووت (٣، ٣٥٤)، «شیز» وەک بیچمی عەرەبی (؟) «جیس» ی کۆن چاو لێدەکات.

ئەم نموونانە، چەشنە پەیوەندییەکی گونجاو لە مەسەلەی گۆڕانکاری ناوەکەدا نیشان دەدەن، بەڵام وەرگیرانی «چێچ»[٢٨٢] لە «شیز» (* شێز؟[٢٨٣])، ئاماژە بە هەندێ جیاوازیی زاراوەیی (پارثی، کوردی؟) دەکات.

ئێمە دیتمان کە شوێنی زووی «چێچەست»، پەیوەندیی بە گۆڵی ورمێوە هەیە. بەڵام



ناوی ساغ کراوەی «* شێز»، بە رواڵەت بۆ شوێنی تەختی سولەیمان پارێزراوە کە تەنانەت پێش راگوێزرانی ئاورەکەش واهەیە بە شوێنی مردنی ئەفراسیاب دابنرێت (بڕوانە: مەسعوودی، ٢، ١٣١).

بۆچوونی تەبەری لەمەڕ «غەدیری * چێست»[٢٨٤]، بێگومان ئاماژەیە بە ئەستێریک و ناتوانێ بۆ ئاوێکی بەربەرین وەکوو گۆلی ورمێ بەکار بهێنرێ.

تەنانەت ئەوەش دەگونجێ کە «گۆلی ئەفراسیاب» کاتی خۆی لە شوێنێکی جیاواز لە هەمان ناوچەدا بووبێت. واهەیە ساغ کردنەوەکانی ئێمە لە «قۆناغ» ەکانی موقەددەسی، بەدروستی ئەوەمان بۆ بسەلمێنێ کە هەندێ شوێن لە دراوسییەتی گەنزەک / جەنزە پەیوەندیان بە هەمان ئەفسانەوە بوە. لەبەر ئەوەی گەنزەک کەوتۆتە ٦ فرسەخی باشووری مەراغەوە و *بئرجاست (سابورخاست[٢٨٥]) لە ٧ فرسەخی هەمان لایەنەوەیە، ئێمە دەتوانین لە هەندێ شوێنی دراوسێی «میاندواو» ـ کە ژمارەیەکی زۆری بەند (لە سەر چۆمی «تەتەهوو» و «لەیلان») هەڵبەستراون بە شوێنیدا بگەڕێین و هیچ باسێکیش لە گۆڕانکاری زەوی نەکەین. ئەوەش دەمانگەیێنێتە جیاوازیەکی زۆر جیددی لە [نووسینەکانی] یاقووتدا، کە بەراشکاوی، گومان لە قسەکانی «مسعر» دەکات و بۆچوونی ناو راپۆرتەکەی لەمەڕ «الشیز» لە گەڵ بۆچوونی خۆیدا پێکەوە دێنێ و دەڵێ «خەڵکی مەراغە و ناوچەکە، ئەم شوێنە [کذا] بە کەنزە ناو دەبەن»[٢٨٦]. یاقووت لە پاراگرافێکی کورتی تایبەتدا (٤، ٢٧٢)، کەزنە لە ٦ فرسەخی مەراغە دادەنێت (بەراوردی بکە لە گەڵ "ابن خوردادبیە" و "قودامە") و دەڵێ " لەوێ [کذا] رووگەی مەجووسی و ئاورگەیەکی کۆن و هەیوان (ایوان) ێکی بەرز هەیە و دواتریش لە باسی «جەزنەق»[٢٨٧] دا (٢، ٧٢) بەتایبەت هەمان قسە دووپات دەبێتەوە. هیچ گومانێک نیە کە یاقووت لێرەدا بیر لە «گەنزەک» (لەیلان) دەکاتەوە.

«مسعر» تەنیا گەڕۆکێک بوە شوێنی پاشماوەکانی تەختی سولەیمانی بینیوە و چاوی بە پاشماوەی رووگەکە کەوتوە ـ ئەو پاشماوەیەی وا دەگوترێ تەنانەت ئێستاش لە شوێنەکەدا دەناسرێتەوە (د.ن. ویلبر[٢٨٨]). بەڵام ئێمە ناتوانین بزانین ئایا یاقووت چاوی بە وێرانەکانی گەنزەک کەوتوە یان نا؟ گەرچی دەبێ بە نزیکیاندا تێپەڕ بووبێت[٢٨٩].

وا وێ دەچێ راپۆرتەکانی یاقووت، ئەو خەیاڵە بسەلمێنن کە هێشتا [لە سەردەمی

ئەودا]، بیرەوەری ئەو دەمانەی ئاورگە (بە هەموو ئەو ئەفسانانەوە کە لە گەڵی کەوتبوون)[٢٩٠] لە دراوسێیەتی شارە کۆنەکە دا هەر مابێت.

ئێمە، تەنیا دەبێ دووپاتی ئەو خاڵانە بکەینەوە کە ئەفسانەی چێچەست خەیاڵاتێکی مێژوویین و تەنیا بە شێوەیەکی دەستکرد بە راستەقینە مێژووییەکانی گەنزەک و ئاورگەی ئازەرگوشنەسبەوە پەیوەندیی پەیدا دەکەن، ئەوەش دەمانگەیێنێتە کۆتایی وتارەکەمان کە تێیدا بە پێچەوانەی «سیر هـ. راولینسن» هەوڵمان داوە جیاوازیی نێوان «فرەئاتە» و «گەنزەک» و دوا شوێنی ئاورگەی «ثی بەرمەیس = شیز = تەختی سولەیمان»، دیاری بکەین و لەوەش زیاتر، رێگای جۆربەجۆرمان بۆ ئەو بۆچوونە گرتۆتە بەرچاو کە تێیدا ئەفسانەی کۆنی چێچەست دانراوە.

من ئەم وتارەم پێشکەش بە دۆستم «پرۆفیسۆر ئی.هـ. دو.مینس»[٢٩١] ـ ئەندامی ئاکادیمیای پادشاهی بریتانیا[٢٩٢] دەکەم کە جارێکی تر، بە کێشانی وێنەیەک لە مەنزەرەی تەختی سولەیمان، منەتباری خۆی کردم.

**کەمبریج، ٢٢ی مانگی جون، ١٩٤٤**



## پەراوێزەکان

١. ئەم وتارە لە سەرچاوەی خوارەوە وەرگیراوە:

(گۆڤاری V. Minorsky, Roman and Byzantine Campaigns in Atropatene, B.S.O.A.S
قوتابخانەی توێژینەوە رۆژهەڵاتی و ئەفریقییەکان) .265 - 243 .Vol. XI, 1943 - 46, pp ,

, 1840, X, pp 65 - 158. 2. Major H.C (later Sir Henry) Rawlinson, JRGS)

3. Quatremere, Mémoire sur la ville d'Ecbatane in Mem. de L'Ac. des Inscr. 1851, XIX/1 , pp 419 - 456

4. Kiepert, Atlas Antiquus:Ganzak Leylan. Noldeke, Geschichte der Sasaniden, 1879, p.100: “Ueberhaupt enthalt diese Abhandlung Rawlinsons bei aller Verdienstilichkeit sehr viel verfehltes”. Herzfeld, Arch. Mitt; 2/2, 1930, p.72,
کە قەڵاکە لە ٦ فرسەخی مەراغە دادەنێ و ئەویش
“in Richtung Zinjan” [?]. Marqat, A Catalogue of the Provincial capitals, 1931, 109 (Ganzak, Leylan).

5. G. Hoffmann, Auszuge aus d. Syrischen Akten, 1880, p.252; Fabricuis Thephanes von
Mytilene, Strasburg, 1898, p.228.
(نووسەر دەستکەوتەکانی دەدا بە بەرێوەبەرانی «رۆژهەڵاتناسان» و کۆتایی بە کاری خۆی دەهێنێ)؛
مارکوارت، ئێرانشەهر، ل١٠٨ (بەڵام بڕوانە ساغ کردنەوەکانی لە کاتالۆگی A دا، ل ١٠٠)؛
هەروەها بڕوانە:

A. Perince, L’Imperatore Eraclio, Florence, 1995, p. 125.

کە ئێستاش «le raggioni del Rawlinson convincentissime»ی لێ دەست دەکەوێت؛
هەروەها بڕوانە:

P. Schwarz, Iran im Mittelalter, viii, 1932, pp. 1099, 1454; Sir A. Stein, old Routes in western Iran, 1940, p. 341 (بەهەندێ دوو دڵییەوە)

6. Phraata, Praaspa, Vera, Gaza, and Gazaca

٧) بڕوانە:

Rawlinson, Passim, Hoffmann, index; W. Fabricius, pp.227-231; Weissbach Gazaca in Pauly-Wissowa, Real-Lexicom; A. V. W. Jackson, Persia Past and Present, pp.124-143; Mary Crane in Bull. Amer. Inst. Iran. Art., December, 1937, pp.84-89.

8. Theophylactus Simocatta

9. Emperor Heraclius

١٠. Mauricius ئیمپراتۆری ڕۆم

١١. [خوسرەوی پەروێز، کوڕی هورموزی چوارەم، شای ساسانی، خاوەنی ژن و ماڵی زۆر لە ساڵی ٦٢٨دا کوژرا (فرهنگ معین)].

١٢. [سەرداری سوپای ئێران لە سەردەمی ساسانیان. لە ساڵی ٥٩١ی زایینی خوسرەو شکستی دا و ئەویش پەنای بردە بەر خاقانی تورک (فرهنگ معین).]

13. Narses

١٤. بە گوێرەی قسەی Muralt، ئەم ڕووداوە، لە ساڵی ٥٩١ی زایینی دا ڕووی داوە.

15. Bindöe

16. John

17. Hoffmann

18. Dinabadon

19. Nimrod

20. The Great Zab

21. Alexandria

22. Klima Xnethas

23. Hnäitha

24. Xanaitha

٢٥. Saint Theophanes the confessor (قەشەی بیزانسی ـ ئەنسیکلۆپیدیای بریتانیا) لە دەور و بەری ساڵانی ٧٥٢ تا ٨١٨ دا ژیاوە.

26. Bastura



٢٧. من تەواو دڵنیام کە ئەو هۆزە کوردەی وا بە عەرەبی، « حومەیدی» ی پێ دەگوترێ، پەیوەندی بە «حنایثا» وە هەیە ـ وەک چۆن کوردی «هەزبانی» دوای «هەذایب» (ئەدیەبەنە)، ئەو ناوەیان لێنرا.

28. Rufinus

29. Diabavsis

30. Aniseni

31. The country of

32. Anisinon

33. Van-Mervanen - "Amädia?

34. Azoni

٣٥. [ئەم بۆچوونە] جێگەی گومانە. مارکوارت (Südarmenien، ١٩٣٠، ل ٣٣٧) "زیربیس"(Zerbis) بە " بۆهتان-سوو" و شوێنی "ئەزۆنی" لە «ئەرزوون» (لە دراوسێیەتی سعیرت) دادەنێ. دەستنووسێک هەیە، کە لەجیاتی "ئەزۆنی"، "ئەلۆنی" (Aloni) دەنووسێ، کە واهەیە ناوی لە ناوچەی "ئالان" (Alan) لە دۆڵی "زێی بچووک" ی وەرگرتبێ. [من هەروەها سەرنجی خوێنەر، بەرەو وشەی «ئالۆێنی» لە زاراوەی «قەیسی ئالۆێنی» دا ڕادەکێشم. ئەم زاراوەیە لە موکریان باوە. وەرگێڕ].

36. Pliny

37. Gurdiaeis

38. {Corduene} vero iuncti Azoni, quos Zerbis {zab}fluvius in Tigrim Cadet "Azonis" silices montani.

٣٩. {بۆ نموونە: گوندی سیدەکان لە ڕۆژهەڵاتی ڕەواندز}.

٤٠. [بۆچی «زرێبار» نەبێت؟ ورگێڕ].

41. Gädir

42. Anisenian

43. Siraganon

44. Qal'a Singän

٤٥. ئەوەی زیاتر جێگەی گومان بێت، ناسینەوە و بەیەک زانینی شوێنەکەیە لەگەڵ سینکار دا کە دوای

یارمەتی وەرگرتن لە بۆچوونی "بەتلەمیوس" لە شوێنێکی گەلێک دوورتری ڕۆژهەڵات دادەنرێ (٢/ ٢٧ مایل بەرەو ڕۆژهەڵاتی داری ئەڤسا و ئەویش «دریاز» (Daryäz) ی سەرچۆمی سابلاخە).

٤٦. Ushnu [مینۆرسکی بۆ گەلێک وشە، شێوازە غەیرە کوردیەکانی بەکارهێناوە. ئوشنۆ بۆ شنۆ، ساوجبلاغ لە جیاتی سابلاخ و...].

47. Balarath

٤٨. "لە خاکی دوژمندا" واتە(لە شوێنی شەڕەکەدا). دەقەکە، دەری دەخات کە لەشکری سەرکەوتوو جەنازەیان کۆ کردۆتەوە. هەروەها، [وشەی] "بۆگەن"، ئاماژە کردنێکی تەواوە بە نزیک بوونی مەیدانی شەڕ.

49. Kanzakon

50. Nöldeke, Geschichte der Sasaniden, 285.

٥١. هەمان، ٢٤٨

٥٢. دول Dül [نزیکایەتی وشەی دوک لەگەڵ «بوک» و «بۆکان» یش نابێ نەگرێتە بەرچاو. وەرگێڕ]

٥٣. ["راحە الصدور و آیە السرور"، مێژووی ئێرانی سەردەمی «سەلجووقی و خوارەزمشاهی» یە و ابوبکر محمد راوەندی ـ خەڵکی راوەندی کاشان لە ساڵی ٥٩٩ ی کۆچیدا نووسیویەتی].

٥٤. Gävdül [لە موکریان، وەک «گاوەدۆڵ» حونجە دەکرێ. وەرگێڕ].

55. Murd

٥٦. [نزهەالقلوب، کتێبێکی گرنگە لە زانستی جوغرافیا و هیئت و لە باسی شار و ڕێگاوبانی ئێران دا. کتێبەکە «حمداللە مستوفی» لە ساڵی ٧٤٠ ی کۆچیدا نووسیوە. فرهنگ معین].

٥٧. [عالەم ئارای عەبباسی، کتێبێکە بە فارسی و باسی ژیان و حکومەتی شاە عەبباسی یەکەمی سەفەوی و باپیرانی دەکات. "ئەسکەندەربەگی مونشی" لە ساڵی ١٠٣٨ ی کۆچیدا نووسیویەتی. هەمان سەرچاوە].

٥٨. واهەیە «میاندواو» بێت، کە باریکە خاکێکە لە نێوان چۆمی جەغەتوو و «تەتەهوو» دا و لەوەڕگەی باشی هەیە کە ئێستاش هەرجێ لەوەڕی یلّخی پادشاهیە.

٥٩. [مەڵکەندی یا "ملک کەندی" شارۆچکەیەکە لە باشووری بناو و کەوتۆتە سەر ڕێگای موکریان بۆ شاری تەورێز].



٦٠. [Toponymy زانستی توێژینەوە لە ناوی شوێن، وجەتسمیە].

٦١. [چیایەکیش بە ناوی "مەندیل بەسەر" لە باکووری سەقز و باشووری بۆکانە، کە دەبێ جیاواز بێت لەوەی مینۆرسکی باسی دەکات].

62. Sebëos

63. Vararat

٦٤. لەمەڕ فیردەوسی، بڕوانە خوارەوەتر، ل ٢٥٥ [ی ئینگلیزی]

65. Valaratho

66. Varasroth

67. Roth

68. Ruz

69. Valarath

70. Rath /- rat

71. Ouararanis

72. Agathais

٧٣. لەم پێوەندیەدا، دەبێ لە بیرمان نەچێت: ١) چۆمی «سارووق» کە لەلای باکووری ڕۆژهەڵاتەوە دەڕژێتە جەغەتووەوە واهەیە بتوانرێ وەک لقی سەرەکی ئاوی جەغەتوو دابنرێ. ٢) لە دراوسێیەتی لێواری ڕۆژهەڵاتی سارووقدا، ئەشکەوتە ناودارەکانی «کەرەفتوو» هەڵکەوتوون، کە پێشکەش نامەیەکیان [بەزمانی] یۆنانی بۆ هیراکلیوس، بە سەرەوەیە (ئێستا بڕوانە سیر. ئـ. ستەین، لل ٣٢٤ تا ٣٤٦). ٣) هیراکلیوس، بەرانبەرێکی یۆنانییە بۆ وەرەتراغنا > وەرەهران > وەراران: (Varatraghna >Varahrän>Varärän).

٧٤. [= پارتی یا ئەشکانیەکان، کە لە ٢٥٠ی پێش زایینەوە تا ٢٢٦ی زایینی لە ئێران حکوومەتیان کرد].

75. Alvania.

٧٦. نزهەالقلوب، دووناحیە (توابع) لە شەش ناحیەکەی مەراغە زیاد دەکات، کە ئەوانیش بریتین لە: ئەنکوران [ئەنگووران؟] و لاوەران. ئەوی دواییان، واهەیە ئاماژەیەک بە "وەلەران" بێت. بەڵام بیچمی جۆربەجۆری «مول اوران»، «مرال داوران» و... هتدی هەیە و هەموو، دەگەڕێنەوە بۆ [چۆمی] قزڵ ئۆزەن.

77. Yabalähä

78. Mgr. J.B. Chabot

* ۷۹. [رەشیدالدین فضل الله (٦٤٥ ـ ۷۱۸ ھ) وەزیری ئاباقاخان کوڕی هۆلاکۆی مغول و دانەری کتێبی «جامع التواریخ» ـە. فرهنگ معین].

۸۰ وشەکە بە سوریانی نووسراوە: ە حنە ە ڕ

۸۱ وشەکە بە سوریانی نووسراوە: ەذذ ە ڕ

۸۲ وشەکە بە سوریانی نووسراوە: ەذ حنە ە ڕ

۸۳ وشەکە بە سوریانی نووسراوە: ە حنە ە ڕ

84. Mgr F. Nau.

85. Valarath

86. E. Gerland, Die pers. Feldzüge des Kaisers Heracleios, in Byz. Zeitschrift, iii, 1894, pp. 330-337; A. Pernice, L'Imperatore Eraclio, Florance, 1905 (compilative).

87. Georgius Pisides

88. Theophanes Confessor

89. Dated Kanzakon, 15 th March 628.

۹۰. Chronicon Paschale (لە دەوروبەری ساڵی ٦۲۹ی زایینیدا نووسراوە)

91. Sebeös

92. Karin

93. Dvin

94. Hrat

95. Vsnsap

96. Anastasius

۹۷. [مینۆرسکی، سەرجەمی دەقی لاتینیشی لەناو وتارەکەی خۆیدا هێناوە بەڵام من بە باشم زانی بیخەمەوە پەراوێزەوە]:

Perqse vero, qui configerqnt qd eum, Perhibebqnt, quod

Chosrohes fugiens igne consumpserit omnia sata in locis illis et Perveneritad civita-



tem Thebarman.

98. Thebarmais

99. Lydian king Croesus

100. Charcoal trick

۱۰۱. پێویستە ئەم شەرحە سەرنج راکێشە، لەگەڵ طەبەری، بەرگی ۱ و ۲، ل ۸٦٦ دا بەراورد بکرێ کە تێیدا رای دەگەیێنێ دوای شەڕی سەرکەوتوانەی دژ بە «خاقان»، بەهرامی گۆر، جەواهیراتە تالانیەکەی خۆی پێشکەشی ئاورگەی شیز کرد و ژنی خاقانیشی وەک کارەکەرێک خستە سەر تالانییەکە.

۱۰۲. [گوندێک بەناوی ئیسکی بەغدا (Eski - Baghdad) کەوتۆتە رۆژهەڵاتی بۆکان، بەڵام بەداخەوە نەمتوانی شوێنی "دەستەگەرد" دیاری بکەم. وەرگێڕ].

۱۰۳. [ابولحسن علی بن حسین مسعودی ، مێژوونووسی گەورەی سەرەتاکانی سەدەی چوارەم و دانەری «مروج الذهب» و «التنبیه و الاشراف» ـە و لە ساڵانی ۳٤٥ یا ۳٤٦ لە «فسطاط» ی مصر کۆچی دوایی کردوە. فرهنگ معین].

۱۰٤. [ئاواییەک بەناوی گۆل لەسەر رێگەی تەختی سولەیمان ـ بۆکان هەیە، تۆبڵێی پەیوەندی بە «البرکە» ی مسعودیەوە نەبێت. وەرگێڕ].

۱۰٥. بڕوانە هەمان، ل ۲۲٥. Barber de Meynard ـ ئیدیتۆری (کتێبی) مەسعودی گوتوویەتی «البرکە» شارێکی فارسە چون لەگەڵ «فورق» دا بە روالەت لێی تێک چوە. ئەوەش گیر و گرفتێکی تازەی پێک هێناوە.

106. Thivarmais

۱۰۷. Menander Protector (مێناندری پارێزەر).

108. Peter Patricius

109. Viramais

110. Sergius

111. Evagrius, "Hist. Ecclesiastica"

112. Georgius Pisides

113. Darartasi

114. Pros noton

115. Artashir

116. Vithamais, Veramais, Thivarmais and Darartasis

117. Dizh-i Bahman

118. Amrta - Spenta

119. Vith-Armais

120. Vohu - manö

121. Ärmaiti

١٢٢. [Chronicon Paschale، رۆژمێری ژیانی سێ «پۆپ» ی کلیسای کاتۆلیک. - Jacques Paul Migne (١٨٠٠ ـ ١٨٧٥) قەشەی کاتۆلیکی کلیسای فەرەنسە و خاوەنی گەلێ نووسراوەیە، کە یەکێکیان «سەرجەمی شوێنەوارە ئایینییەکانی قەشەکانی یۆنان» ە. (Patrologia Graeca). وەرگیراو لە ئەنسیکلۆپیدیای بریتانیکا. وەرگێڕ].

123. Ton Siazouron

124. Tou Siasouron

125. Varzan

126. Zara Mountain

127. Naukhuvan

128. Barzan

١٢٩. پێویستە «کێلەشین» لە کێلەشینە ناسراوەکەی ئەو پەڕی باکووری رۆژئاوا و نێوان شنۆ و رەواندز بەجیاواز دابنرێ (کە دوور نییە هێزەکانی بیزانس لە ٥٩١ زایینیدا ئەو شوێنەیان تێپەڕ کردبێت).
[دیارە ئەو کەلەی کەوتۆتە نێوان بانە و دەشتاییەکەی دۆڵی جەغەتووەوە دەبێ "کە لی خان" بێت.
بەڵام روون نیە بۆچی مینۆرسکی لە پەیوەندی ئەم شوێنەدا، راستەوخۆ چۆتە سەر باسی "کێلەشین"؟
بڵێی پێشتر، لەو شوێنەش "کێلەشین" یێکی دیکە نەبووبێت؟ هەرلێرەدا با بڵێم لە سەردەمی منداڵی مندا، "کێلەشین" یێکی دیکە لە داوێنی رۆژئاوای گردی «قولله» لە باکووری رۆژهەڵاتی شاری بۆکان هەبوو، بەڵام من هیچ نیشانەیەکی نووسراوم بە سەریەوە نەدی و لە کەسیشم نەبیست بەڵگەیەکی مێژوویی ـ وەک کێلەشینەکەی نێوان شنۆ و رەواندز بێت کە لە ساڵانی شەڕی ئێران و عێراقدا، لە



شوێنی خۆی هەڵگیراو برایە «ورمێ»؛ ئێستاش دەگوترێ لە مۆزەخانەی ورمێ پارێزراوە. وەرگێڕ].

130. Kelevthis

١٣١. رستەکە یۆنانییە و زۆر روون نییە.

132. Bulli. of the American Inst. for Iranian Art, December 1937, pp. 71 - 105.

133. A.F. Stahl, Peterm. Mitt., 1905, p. 32;

134. A.V. W. Jackson

١٣٥. [بڕوانە پەراوێزی ژمارە ١٠]

136. Valarath

١٣٧. [ابولقاسم عبیدالله بن خردادبه، جوغرافیانووسی بەبنەچەک ئێرانی، کە کتێبی «المسالک والممالک» ی [بە عەرەبی] نووسیوە و لە ساڵی ٣٠٠ ک. دا مردوە. فرهنگ معین].

١٣٨. مێژوونووسی عەرەب

١٣٩. [شمس الدین ابوعبدالله محمد... المقدسی [٣٤٥- ٣٧٥ ک.] گەڕۆک و جوغرافیانووسی خەڵکی بیت المقدس، کتێبی «التقاسیم فی معرفه الاقالیم» ی نووسیوە. فرهنگ معین].

140. Al-Jabärjän

141. Tell-vän

142. Sisar

143. Andaräb

144. Al-Baylaqän

145. Säburkhast (?)

146. Janza

147. T. Flis

148. Jäbrvän

149. Niriz

١٥٠. لە سەردەمی مەلیک شاهـ [ی سەلجوقی] دا [سەدەی پێنجەمی کۆچی]، درێژایی فرسەخ (لە عێراق، کوردستان و هتد) بە دڵنیایی شەش هەزار هەنگاو بوە، لە کاتێکدا فرسەخ لە ئازەربایجان و ئەرمەنستان ١٠ هەزار هەنگاو بوو. بڕوانە: نزهە القلوب، ١٦٤ (تەرجەمە، ١٦١).

151. B.S.O.A.S, X1/1, P.87

152. Mëlemâs

١٥٣. ئیبن خورداد بیهـ، ١٢١، ئاماژە بە قۆناغی «شیز» (بە بێ عینوان) لە چوار فرسەخی دینەوەر لە سەر ڕێگای "سیسەر" دەکات. بڕوانە خوارەوەتر، ل ٢٦٤، ژمارە ٢.

١٥٤. عونسوری "وان" بە واتای "شوێن" (و لە ئەرمەنیدا، "ئاران") گەلێک جار لە باکووری ڕۆژئاوی ئێراندا دەبینرێ: جەبروان، باجەروان، هتد، هەروەها دوور نیە: شیروان، گورزیوان و هتد.

155. Kargäbäd

156. Senne

١٥٧. [ئاماژەی مینۆرسکی بە شاری سنەیە کە دوای حەسەن ئاوا (و پلێنگان) لە ساڵی ١٠٤٦ی کۆچی [٧-١٦٣٦ز] دا، بوو بە پێتەختی خانانی ئەردەڵان. وەرگێڕ].

١٥٨. ڕەنگە بە شوێنێک بناسرێتەوە کە سەرچاوە ئاشوورییەکان بە «صیصیرتوو (Sisirtu) ناویان بردوە. بڕوانە: "سنە و سیسەر" لە ئەنسیکلۆپیدایای ئیسلامیدا [نیازی مینۆرسکی لەوەی دەڵێ: «مەرکەزی پێشوو» دەتوانێ مەرکەزی پێشووی ئەردەڵان واتە حەسەن ئاوا بێت. بەڵام بە بڕوای من عیبارەتەکە دەگەڕێتەوە بۆ پلێنگان. وەرگێڕ].

١٥٩. [بلاذری مێژوونووسی عەرەب]

١٦٠. لە ڕاستیدا، موقەددەسی، ل ٣٨٢، ئاماژە بە ڕێگایەکی ڕاستەوخۆ دەکات لە مەراغەوە بۆ شارەزوور، بە بێ ئەوەی ناوی لاڕێییەک بەرێت کە بە «بەرزە» دا تێپەڕ دەبێ (٦ مەرحەلە و ٣٠ فرسەخ).

[لە پێوەندیی بۆچوونەکەی مینۆرسکی دا دەمەوێ بڵێم:

I. "بەرزە" دەتوانێ هەمان سەقز بێت و بۆ ئەوانەی لە باشوورەوە دەهاتن، ڕێگاکە لەو شوێنەدا بووبێت بە دو بەشەوە: بەرزە ـ ورمێ و بەرزە ـ مەراغە. یەکەمیان دەبێ بەرەو باکووری ڕۆژئاوا کشابێت و «مەرخوز» و «باغلّوجە» ی تێپەڕ کردبێت و بە ڕێگای سابلاخدا چووبێت بۆ ورمێ، دووهەمیشیان بە بۆکان و میاندواو دا چووبێت بۆ مەراغە. بوونی ئەم دوو ڕێگایە واتای ئەوەیان نابێت کە هات و چۆی نێوان مەراغە و ورمێش، هەر بە «بەرزە» دا کرابێت. ڕێگەی ڕاستەوخۆ و هاسانی مەراغە بە میاندواو و سابلاغ دا، سروشتیترین ڕێگای هات و چۆی نێوان مەراغە و ورمێ یە.

II. ئیحتیمالی دووهەم ئەوەیە، "بەرزە" کەوتبێتە شوێنێکی هەندێک باکوورتر لەوەی مینۆرسکی دەڵێت و ئێمە "بۆکان" یا "نسا" ی پێتەختی «ماننایییەکان» بە



«بەرزە» ی کۆن بزانین. «نسا» لە شوێنی ئێستای «سەراو» و «ڕەحیم خان» بوە و لە نزیک میاندواو هەڵکەوتوە. ئەم شوێنە، دەشتاییە و بۆ ناوی «بەرزە» پڕ بە پێست نیە. بەڵام بۆکان دەتوانێ «بەرزە» بووبێت: بوونی قەڵای بەرزی ناوەڕاستی شار لە لایەک و شوێنایەتی جوغرافیایی و هەڵکەوتنی لە سەر ناو ڕێیانی میاندواو، سابلاخ، سەقز، ئیحتمالەکە قایمتر دەکات. دوور نییە دوای ئەوەی ڕێگای دینەوەر – مەراغە بە بانە و سەقز دا تێپەڕ دەبوو، لە بۆکان بووبێت بە دوو لقەوە: یەکەم بەرەو باکوور واتە مەراغە و دووهەم بەرەو ڕۆژئاوا (ورمی).

ئاشکرایە بۆچوونی من، زیاتر پشتی بە ناسینی ناوچەکە بەستوە تا فاکتەری مێژوویی و هەر بەم بۆنەیەوە لاوازە بەڵام بۆ بیر لێکردنەوە دەبێت. وەرگێڕ].

١٦١. هەروەها بڕوانە: سێر. ئ. ستەین، هەمان، لل ٣٤٩ ـ ٣٥١.

[ئەو ڕێگایەی مینۆرسکی باسی دەکات، وا هەیە ڕێگای سابلاغ ـ بورهان ـ بۆکان ـ سەقز بێت و لە ڕاستیدا ئەمڕۆ ڕێگەی ڕاستەوخۆ لە نێوان سابلاغ و سەقزدا نیە. مینۆرسکی لە شوێنێکی دیکەدا، باسی چوونی خۆی بۆ بۆکان و میوان بوونی لە دیوەخانی سەردار حەمەحسێن خان دەکات، واتە ڕاستەوخۆ نەچوە بۆ سەقز. ئەوەش بۆچوونی پێشووی من لەمەڕ پەیوەندی نێوان بۆکان و بەرزە، پتەوتر دەکات گەرچی ئاشکرایە فاسیلەیەکی زۆر لەنێوان ئەو دوو سەردەمەدا هەیە. وەرگێڕ].

١٦٢. [من نزیکایەتییەک لە نێوان «مووسائاباد» و ناوی گوندی «قەرەمووسالیان» دەبینم لە سەر ڕێگای بۆکان ـ میاندواو. ئەم گوندە لە «نسا» ی پێتەختی «ماننایەکان» دوور نییە و تەنانەت ئێستاش دوای ئەوەی لە بۆکانەوە دەگەیە قەرە مووسالیان و گوندەکە تێپەڕ دەکەی، ڕێگایەک بەرەو میاندواو، ڕێگایەکی دیکەش بەوەر سابلاغ و ورمێ دەکشێ. ئەوەی مینۆرسکی دەڵێ "ڕێگاکە، دوای بەرزە، دوو لقی لێ دەبووە"، دەتوانێ ئاماژەیەک بێت بە شوێنایەتی قەرەمووسالیان و نسا، دوای تێپەڕکردنی بۆکان. هەرچۆنێک بێت، من ئەو ئیحتمالەش وەک ئەوانی تر دەخەمە بەر چاوی خوێنەر بێ ئەوەی بمەوێ مەسەلەکە ئاڵۆزتر بکەم یا دژ بە یەکبوونی بەرزە و سەقز بوەستم. ئێستاش دوای هەموو ئەو ئیحتمالاتە، سەقز بە گرد و قەڵا کۆنەکەیەوە ـ کە من لە سەردەمی مێرمنداڵیمدا شاهیدی تێک چوون و ڕووخانی بووم، زیاتر لە بۆکان بۆ شوێنایەتی بەرزە موناسیب دەزانم. بەڵام مەسەلەی ڕێگاوبان و دوو لقی باکوور و ڕۆژئاوا، منیش وەک هەموو خوێنەرێکی ناسیاوی ناوچەکە، لەمەڕ بۆچوونی مینورسکی دەخاتە دوودڵییەوە. وەرگێڕ].

١٦٣. هەروەها، بڕوانە خوارەوەتر، باسی «کەزنا» و «جەزنەق» لە لایەن یاقووتەوە.

[لە پەیوەندی ئەم ناوەدا، بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە واتای فارسی وشەی «خرە» بکەم، کە فەرهەنگی معین، بە ئوستان (موحافەزە) ی واتا کردۆتەوە. هەروەها پەیوەندی ئیحتیمالی نێوان گەزنا، گەنزەک و ناوی ئاوایی «کەس نەزان» لەسەر هۆیەتوو دەخەمە بەرچاوی خوێنەر. وەرگێڕ].

164. Colonel Monteith

١٦٥. گۆڤاری ئەنجوومەنی جوغرافیایی پادشاهی (J.R.G.S)، ١٨٣٢، لل٥ ـ ٦.

١٦٦. Burandizi [من نەمتوانی بزانم ئەو شوێنە کوێیە؟ چۆمی «باراندووز» ی ورمێ نیە؟ بڵێی «بورهان» ی سەر ڕێگەی بۆکان – مەهاباد نەبێت؟].

167. Gaza

168. G. Cedrenus

169. Gazacon شاری

١٧٠. "سێدرینووس" کاتێ دەیەوێ باسی ئاورگەکە و گەنجی کراسووس و «فیلی زوخاڵ» بکات وشەگەلی وا بەکار دەهێنێ کە وەک وشەکانی تیۆفان دەچن. بەڵام شەرحێکی بە وردە ریشاڵ و سەرنج راکێش لەمەڕ پەیکەری خوسرەو زیاد دەکات (بەراوردی بکە، لەگەڵ مەسعوودی، ٤، ٧٤ دا)، کە دوورنیە لە هەندێ سەرچاوەی دیکە دا چاوی پێیان کەوتبێت. لە هەر حاڵەتێکدا ئەو راستیەی وا ناوبراو شوێنی ئاورگەکە بە گەنزەک دەزانێ، گرنگایەتیەکی زۆری نیە.

١٧١. Mis'ar b. Muhalhil مسعر، لە ڕێگەی بۆچوونەکانی «المعجم البلدان» ی یاقووت و [کتێبی] زەکەریای قەزوینیەوە، ناسراوە. «مارکوارت» ئەوەندە نەژیا بتوانێ وەفا بە شەرت و بەینەتی خۆی لەمەڕ توێژینەوە لەو بابەتەدا بکات وا پەیوەندیان بە دروست بوونی ناوی «مسعر» ەوە هەیە (Festchrift Sachau, p 202). لەعەینی کاتدا، دوو نامیلکەی سەفەرنامەکانی «مسعر» لەناو «دەستنووسەکانی مەشهەد» دا دۆزراونەتەوە کە هەروەها بەشێک لە [کتێبی] «ابن فقیە» و نوسخەیەکی گرنگ بەڵام ناتەواوی [کتێبی] «ابن فضلان» یان تێدایە.

172. SIC (SICKAN).

١٧٣. [نیاز لە «فارسی نێونجی»، زمانی «پەهلەوی ئەشکانی» واتە ئەو زمانە فارسیەیە وا لە سەردەمی پارثیەکاندا قسەی پێ کراوە].

١٧٤. بڕوانە بۆچوونی ناو کاتالۆگی مارکوارت لل ٩-١٠٨ بەڵام هـ. و. بەیلی H.W.Bailey [ لەکتێبی] Zoroastrian Problems، ل ٢٣٠دا، شێوەی *«گەنجی شەسەپیکان» -Genj-i Sasapi





kan بۆ خوێندنەوەی [عیبارەتەکە] پێشنیار دەکات.

175. (Fiscanzaga) Phisganzaga

١٧٦. مێژووی نەتەوایەتی (National History)، ٦، ٤٣. هەر ئەو، لە شوێنێکی دیکەدا، ٦، ٤٢، باسی پێتەختی ئاترۆپەتان دەکات:

"Oppidum ejus Gazae (var. gaze, Gazzea) ab Artaxatis CCCCL passuum, totidem ab Ecbatanis Medorum, quorum pars, sunt Atropateni. ed. Detlefsen, 1904, p. 136

ئەو ئاماژەیە «لەیلان» دەگرێتەوە، بەڵام تەختی سولەیمان نا.

177. * Fis (for Sic)- Canzaga

178. Ganj-i Sicikan

179. Cecast

180. Oppidum

181. Vitharmais, Thivarmais etc.

١٨٢. ئەوپەڕی ئیحتیمال ئەوەیە بتوانین شوێنی «شیز» لە دوابەشی وشەی «دەر ـ ئار ـ تا ـ سیس» دا هەڵبگرین (Dar-arta-sis)، بەڵام گریمانێکی ئەوتۆ، موشکیلەی بەشی سەرەتای ناوەکەمان بۆ چارەسەر ناکات.

183. Arshakids

184. Georgius Pisides

185. Darartaais

١٨٦. وەک «کوێرسیوس» ی نووسەریش (Quercius) وای بۆ چوە (چاپی میگنە، ل ١٣٢٩).

187. Arthathir

188. Dar-Artathir

١٨٩. تومان، زاراوەیەکی عەسکەریە لە سەردەمی مغولەکاندا هاتۆتە زمانی ئیداری فارسیەوە و بە واتای دەهەزار سەربازە. هەروەها بە ناوچەیەک دەگوترێ کە ئەو دە هەزار سەربازەی لێ کۆدەبێتەوە. ناوچە جوغرافیەکانی ئێرانیش کاتێ توانیبێتیان ئەو ژمارە عەسکەرە کۆبکەنەوە، بوون بە «تومان» یێک.

١٩٠. راولینسن، ل٨١، ئاماژەی بە کتێبی «تەبەکتەگین» (Tabaktagin) دەکات کە مەسعوودی

زانیارییەکانی خۆی لەمەڕ ئێران لەو وەرگرتوە. لە دەقی چاپی مروج [الذهب] دا، بەرگی ٢، ١١٨ و ١٢٠، ئاوەکە، لە بیچمی «ئەل ـ س. کیسەران» (Al-S.Kisaran) دا هاتوە، (کە بە گوێرەی «کریس تن سن»، لە [کتێبی] «کەیانییەکان»، ل ٤٣دا، واتای سەرۆکی «سەکەکان»ی هەیە).

لە [مێژووی] طەبەری، ٩٦دا، باسی کتێبێکی جیاواز (؟) کراوە و ئەویش «بەیکار» ە (Baykar) (کە بە ڕواڵەت، هەمان «البنکس» Al-Bnks ی مروج [الذهب] بە، ٢، ٤٤)، مارکوارت، لە Strei-fizüge، ١٦٦ دا، ناوەکەی وەک «پەیکار» (بە واتای کتێبی «شەڕ») ساغ کردۆتەوە. مخابن بۆچوونەکانی مەسعوودی، هیچیان لەمەڕ ئاورگەکە تێدا نیە.

191. Aparviz

192. Adhar - gushnas

193. Azar. khsh

194. Adhar - jushnas

195. Al-shir

196. Balkhi tradition

197. Saturiq

198. Le Strange

١٩٩ تا ٢٠٢. لە دەقی وتارەکەی مینۆرسکیدا، ئەم سێ وشەیە بە پیتی عەرەبی نوسراون.

203. Abaqa

٢٠٤. بڕوانە:

D.N. Wilber in Bull. AM. Inst. Pers. Art. V/2, P. 102

205. "Sujas and S. yur luq (*Soqurluq).

٢٠٦. «سوقوور» ی مغولی بەواتای کوێر و پیاوی کوێر و پاشگری تورکی «لوق» وا هەیە واتای «کوێرەڕێ و لاڕێ بداتەوە (؟).

207. Artavazd

208. Phraates

209. Gaius Julius Artavazd

211. Rome



212. Cadusii

213. Amardi

214. Tapyri

215. Cyrtii

216. Quintus Dellius

217. Cnaeus Pompeius Theophanes of Mytilene

٢١٨. و. فابریکیوس (W. Fabricius)، لە تێزەکانی خۆی لەمەڕ تیئۆفانی میتی لینەدا، ستراسبۆرگ، ١٨٨٨، چەند بەشێک لە [نووسراوەکانی] «دیللیۆس» دەخاتە بەر لێکۆڵینەوە.

219. Artaxata

220. Avos

221. Nivaros

222. Taurus

223. Baris

224. Pata ton tis Baridos neon

225. Ecbatana

٢٢٦. من مەسەلەی رووگەی «باریس» ـ کە وا هەیە سەری زۆری لێ بیێتەوە، بەجێ دەهێڵم. بڕوانە: هـ. ستێفانوس.

H. Stephanus, Thesaurus, Eng. ed., 1816 - 18, II, 172 - 5: L.C. Valckenaer, Dissertatio de vocabulo Bapis.

هەروەها بڕوانە:

Pauly - Wissowa "sub verbo". J. Schrader's restorantion

بە ئەرمەنی: ئاراراتی پێ دەگوترێ Maais* (لەبەر ئەوەی Baris هێشتا سەرنج ڕاکێش ماوەتەوە ئەویش بە حیسابی قسەکانی نیکۆلاسی دیمەشقی (Nicolaus Damascenus) لە: Josephus, Ant. Jud., I, IVدا کە سەبارەت بە چیای «باریس» دواوە و دەڵێ کە کەوتۆتە لای ئەرمەنستان و خەڵکێکی زۆر لە ماوەی سێلاوەکە [ی نۆح] دا، پەنایان بردە ئەو شوێنە.

227. Ava-Jiq





٢٢٨. Niphates ئێستا «ئالاداغ» و دیواری باکووری ڕۆژهەڵاتی حەوزەی «وان» پێک دێنێ.

229. Nibaros

٢٣٠. ئەم بیچمی "فرئاتە» یە ، لە کتێبێک بەناوی
«پارثیکا» Parthica دا دوویات بۆتەوە و بە هەڵە بۆ
«ئاپیەن» Appian نووسراوە (چاپی Schweighauser، (١٧٨٥، ل ٧٧). شێوەکانی دیکەی بریتین
لە: Fararta و Faraortou

بڕوانە: پلوتارخ ٧/١ (Teubner، ١٩١٥) ل، ١١٣.

231. Praaspa

232. Dellius

233. Vera (Ouera)

234. Groskurd

٢٣٥. لەم مەسەلەیەدا، سترابۆن، [قسەی] تیئوفیلاکت (هەمان، لل ٢٤٥، ٢٥٤)، دەسەلمێنێ.

٢٣٦. بڕوانە:

Fabricius, 227; Gazaca - "die Unterstadt", Vera, "wie schon der Name andeutet", (er soll von pers. var - saepes arx Kommen Kramer) die Burg bezeichnete"

237. Vara

238. Vararat

239. Varismanas

240. Varsma-Pana

241. Varzana - päna

242. Procopius, Bell. Pers., I, 13 - 14

243. Varesmanas

244. Pitiaksis

٢٤٥. [ڕستەکە بە یۆنانی نووسراوە و بەمەزندە دەکاتە ئەو تەرجەمەیەی ئێمە]

٢٤٦. [ئەم ڕستەیەش هەر بە یۆنانی نووسراوە. وەرگێڕ]

٢٤٧. ڕاولینسن، ١٢٠، بە هەڵە بەراوردی گەزەکە لە گەڵ زەزەکە دا دەکات (Gazaca, Zazaca)





بەڵام لە گەڵ «ئەزەگە» (Azaga) دا، کە دەبێ کەوتبێتە ناوچەی ماکۆ، ئەم بەراوردە بەرێوە نابات.

٢٤٨. ڕاولینسن، هەمان سەرچاوە، ١٢١، دەڵێ: "لەبەر چەند هۆیەک، بەتلەمیوس لە کاری ئەندازەگرتنی پانایی جوغرافیایی ڕۆژئاوای ئێران دا زیاد لە هەموو وڵاتێکی تر مەیلی بەوەیە لەرادەی ئاسایی بەزیاتریان نیشان بدات.

249. Andreas, in Pauly - Wissowa

٢٥٠. ل ٢٦٢، ژمارە ١ی دەقی ئینگلیزی.

٢٥١. کە ئێدیتۆری کتێبەکە تێیدا بەهەڵە، خاڵێکی زیادیی بۆ داناوە و کردوویەتە «اقراهرود». بڕوانە: مینۆرسکی، مەراغە، ئیسنکلۆپیدیای ئیسلام ـ کە تێیدا بۆ یەکەم جار پێشنیاری بەیەک زانینی «فرەئەثا» Phraata و مەراغە خراوەتە بەرچاو.

لەسەر ناوی هاوچەشنی چۆمێک لە سیستان [ڕۆژهەڵاتی ئێران] ـ کە «ئاڤێستان فرەدەثا» Avestan Phradatha بێت و ئێستاش «فەرەهرود» ی پێ دەگوترێ، بڕوانە مارکوارت، Wehrot، ١٩٣٨، ل ٢٢. مارکوارت چاو لە بیچمی «فرەئەتە» دەپۆشێ و «فرەئەسپە» وەک «*فراذەهـ ئەسپە» بەواتای «جوانوە ئەسپ» وەردەگرێ. ئیرانشەهر، ١٠٨، کاتالۆگ، ١٠٩.

٢٥٢. [مینۆرسکی ئەو ناوەی بە پیتی عەرەبی نووسیوە: افرزهرود].

٢٥٣. بەراوردی بکە لەگەڵ «مەکوینیم» لە «ساڵنامە جوغرافیاییەکان» دا:

Macquenem in Annales de Geographie, 1908, 128 - 144.

254. Yay - Shahar

255. Guarding Place

٢٥٦. لە ناوچەکەدا، شوێنێکی گرینگی کۆنی دیکە هەیە کە بریتیە لەو کاخەی وا بە ناوی «قەڵای زەحاک» ـەوە دەناسرێ و کەوتۆتە سەر «قەرەنغوو». بڕوانە ,Monleith, هەمان، ٤. «قەڵای زەحاک» کەوتۆتە نزیکەی ٥٢ مایلی ڕۆژهەڵاتی مەراغە و بەکردەوە دەتوانرێ بە «فەنەئەسپە» ی بەتلەمیوس دابنرێ (؟). فاسیلەی شوێنەکە لەگەڵ زەنجاندا، نزیکەی ١٠٠ مایلە و بەم پێیە، کەوتۆتە سێ یەکی ڕێگەی نێوان مەراغە ـ زەنجان و کشانی جادەکە (لە لای باشوورەوە بۆ ڕۆژهەڵات) تایبەتمەندییەکانی بەتلەمیوس دەگرێتەوە.

٢٥٧. Stades ستادێک بەرانبەر بە ١٩٤ یاردە.

٢٥٨. پلۆتارخ ـ بۆ نموونە لە لاپەڕە ١٤١دا، دەڵێ:"ئانتۆنیۆس نیازی وابوو خۆی لە هەمان ڕێگاوە

بکشێنێتەوە دواوە و ڕێگاکەش بە وڵاتێکی دەشتایی بێ دار و درەختدا تێپەڕ دەبوو." بەڵام «مەردیی» یێکی ڕێنوێنیکەر پێی گوت بە چیاکانی لای ڕاستی خۆیدا بڕوات و «بەرێگایەکی کورت» ی ئەوتۆدا بردی کە گوندی ئاوەدانی لە سەرە ڕێ بوو. ڕێگاکە، واهەیە ڕێگەی «صۆفیان» ی لای ڕۆژئاوای تەوریز و لێواری بەری ڕۆژهەڵاتی گۆلی ورمێ یا خود ڕێگەی صۆفیان بۆ تەوریز و دەوری باکووری ڕۆژهەڵاتی [چیای] سەهەند بووبێ. پاشەکشێ، دەبوایە لە ڕێگایەکی کورتتری ڕۆژهەڵاتی سەهەند و زیاتر بەرەو باکووری ڕۆژهەڵاتی ڕێگای پێشووەوە بکرایە (بۆ نمونە، بەرزاییەکانی «قەراچەداغ» لە ڕۆژئاوا، کە بەسەر دەشتی تەوریز دا دەڕوانێ).

259. Ujan

٢٦٠. ئەم ڕوانگەیە، لەگەڵ هێرشی یەک ڕۆژە و گەڕان بە دوای ئاڵف و تفاقدا ـ کە «ئانتۆنیوس» لە «فەرائەتە» وە بۆی کەوتە ڕێ (پلۆتارخ، فەسڵی ٤٠ ـ ٣٩)، دژایەتی نییە.

261. Binab

٢٦٢. [سەبارەت بەوەی مینۆرسکی دەڵێ میتولۆژی ئێران بەگشتی ڕووی لە بەشی ڕۆژهەڵاتی ئێران بوە، ئەم ڕوون کردنەوانە پێویستە: بەگوێرەی نەریتی ئێرانییەکان، دەگوترێ زەردەشت لە باشووری گۆلی چیچەستەوە چوە بۆ «باخی» و ئەم «باخی» یە بە باکتریا و «بەلخ» لە ڕۆژهەڵاتی ئێران دادەنێن. زانای کرماشانی «عمادالدین دەولەتشاهی» بەرپەرچی ئەم بۆچوونانە دەداتەوە و «باخی» بە شوێنی ژیانی هۆزی گەلباخی لە کوردستان دەزانێ و دەڵێ زەردەشت لە باشووری گۆلی چیچەستەوە نەچوە بۆ ڕۆژهەڵاتی ئێران و چوە بۆ کوردستان. ئەم زانایە، لەمەڕ پاڵەوانانی داستانی «شاهنامە» (ڕۆستەم، زاڵ، پیرانی ویسە، ...) یش دەڵێ لە ڕۆژئاوای ئێران ژیاون نەک لە ڕۆژهەڵات. بۆ ئەو ڕوانگە شۆڕشگێڕانە تازەیە، بڕوانە: عمادالدین دولتشاهی، «جغرافیای غرب ایران یا کوههای ناشناخته اوستا» تهران (؟)، ١٣٦٣ [١٩٩٤] بە زمانی فارسی. وەرگێڕ].

263. Var-i Cecasta (Avestan Caecasta)

٢٦٤. من گومانم لە قسەکانی «هیرزفیلد» Herzfeld داهەیە، کە دەڵێ سەردەمی کەیخوسرەو «Wirkliche Geographic بوە بڕوانە:

Arch. Mitt., 2/2. P. 72.

265. Franrasian

266. Kahnjast



267. Barda'(Partav)

٢٦٨. «نەسەوی»، ژیننامە نووسی «جلال الدین خوارەزمشاه» (ل ٢٢٥)، باسی شوێنی ڕووداوەکە بە شێوەیەکی بەرچاو دەکات و بە بەرزاییەکانی «بەردەع» ی دادەنێ [لە «بۆندهیش» دا، ١٢، ٨، «گۆلی خوسرەو» لە ٥٠ فرسەخی چیچەست دانراوە. تەنانەت بە مەزەندە دانانی ١ فرسەخ = ٣ مایل، فاسیلەکە دەمانگەیێنێتە ئەوپەڕی زەنجانیش. ئ.و. وێست. E.W. West گۆلی خوسرەو بە «وان» یا «سوان» (گوێکچە Gökche) دادەنێ کە ئەوی دواتریان زیاتر جێگەی پەسندە لەبەر ئەوەی «وان» هیچ پێوەندیەکی بە خوسرەوەوە نیە.

[من ئیحتیمالی «زرێبار» یش دوور نازانم. واهەیە ئیمە لە باشووری گۆلی ورمێ وە بە ڕێگای مەهاباد و سەقز دا، ئەگەر بەرەو مەریوان بڕۆین زیاتر لە ٥٠ فرسەخ ڕێگا نەبێت. وەرگێڕ].

٢٦٩. لە لاپەڕە ٢٤٧ی ئینگلیزیدا

٢٧٠. بڕوانە: The Eclipse, II, 64

٢٧١. دوو «شیز» ی دیکەش ـ بە بێ حەرفی تەعریف، ناسراون (شوارز Shwarz، هەمان، ٧٠٣، ٧١٩)، بەڵام ناوەکەیان جێگەی گومانە. یەک لەو دوانە (واهەیە «* بیر Bir بێت) لە شارەزوور و ئەوی دیکەیان (بیچمی جیاوازی «سیر» Sir ـە) کە کەوتۆتە چوار فرسەخی باکووری دینەوەرەوە. بڕوانە سەرەوەتر.

٢٧٢. دیارە ئەو کەڵکەڵەیەش دەکەوێتە مێشکەوە، کە «چێچەست» وەک «چێچ ئەست» وەربگرین بە واتای: چێچە [مینۆرسکی عیبارەتی «چیچ است» ی فارسی واتا کردۆتەوە. وەرگێڕ].

٢٧٣. [لە دەقی ئینگلیزیدا، ئەم ناوە بە پیتی عەرەبی نووسراوە].

274. Bar-Jast

275. Wer/Ber

٢٧٦ تا ٢٧٨. [هەموو ئەو پێنج وشەیە لە دەقی ئەسڵیدا بە شێوەی عەرەبی نووسراون و وشەی یەکەم واتە «سار» خاڵی بۆ دانەنراوە. وەرگێڕ]

٢٧٩. [ئەم وشەیەش هەر بە پیتی عەرەبی نووسراوە. وەرگێڕ]

280. Bi'ral-cest

٢٨١. ساغ کردنەوەی ئەم ناوە بە شێوەی « ـ خوست» بە واتای «بەند» یا «ڕێگەی سەر بەرەوخوار» زۆر وێچوو نییە. لەمەڕ «خوست» بڕوانە هێرزفیلد،





Herzfeld, Arch, Mitt., 2/2, 80-83.

282. Cece

283. Shiz (*Shez)

284. The ghadir of *cest

285. Säbur - khast

286. Kanza

287. Jaznag

288. D.N. Wilber

٢٨٩. بڕوانە

Wüstenfeld, Jácut's Reisen, in ZDMG, XVIII, 1864, P. 441.

یاقووت بە لێبراوییەوە دەڵێ چاوی بە «بەسوێ» Baswé کەوتوە، کە کەوتۆتە باشووری ڕۆژئاوای گۆلی ورمی. بەڵام لە ڕێگای چوونیدا بۆ مەراغە، دەبێ گەنزەکی گەلێک بەلای باشووری ڕۆژهەڵاتدا بەجێ هێشتبێ.

٢٩٠. لە «بوندەهیشن»، بەشی ٢٢، ل ٤ دا [پێویستە بگوترێ کە شوێنی ئەم پەڕاوێزە لە دەقی وتارەکەدا دیاری نەکراوە و من بە مەزندە لەم شوێنەم دانا. وەرگێڕ].

291. E.H. Minns

292. F.B.A.

# گۆران

ئالۆزی و گێژوگومی لە بەکارهێنانی مەفهوومی «کورد» دا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمە کۆنەکان. بە گوێرەی  قسەی «حەمزەی ئیسفەهانی» ( دەوروبەری ٩٦١/٣٥٠ ز)، چاپی بەرلین، ل ١٥١، «ئێرانییەکان، دەیلەمییەکانیان[١] بە «کوردی تەبەرستان»[٢] ناو دەبرد ـ وەک چۆن بە عەرەبیشیان دەگوت «کوردی سوورستان»[٣] واتە خەڵکی عێراق.

نووسەرانی دیکەی دیکەی عەرەب و ئێرانی سەدەی دەهەمی زایینی، کاتێ دەیانگوت «کورد» نیازیان هەموو کۆچەرێکی ئێرانی لە رۆژئاوای ئێران، بۆ نموونە، دەوارنشینەکانی [ئوستانی] فارس بوو.

مێژوو نووسی ناوداری گەلی کورد ـ شەرەفخان، لە مێژوەکەی خۆیدا (لاپەڕە ١٣) دەنووسێ: «کورد چوار لقن: کرمانج، لوڕ، کەلهوڕ و گۆران». ئەم ژمارە کردنە، دەراوێک لەمەڕ تاقمە سەرەکییەکانی چیانشینە ئێرانییەکان روون دەکاتەوە، بەڵام تەنیا کرمانج و واهەیە کەلهوڕیش[٤] لە ژێر سەردێری «کورد»دا بگونجێن، لە کاتێکدا، لوڕو  گۆران بە هۆی زمان و بنەچەکی مرۆڤ ناسانەوە، لەوان جیاواز دەوەستن[٥].

زانیاری ئێمە لەمەڕ «مرۆڤ ناسی» ئێرانی، هێشتا ناتەواوە، بەڵام ئەوەی لە مێژووی کۆنی بەشی رۆژئاوا و باکوور و باشووری رۆژئاوا [ی ئێران] دەیزانین، جیاوازییەکی زۆرمان لە پێشینەی رەگەزناسانەی ناوچەکە بۆ دەردەخات. لە عەینی کاتدا لە لایەنی زمانەوانییەوە باش دەزانین زاراوەی لوڕی پەیوەندیەکی نزیکی لە گەڵ دانیشتوانی [ئوستانی] فارسدا هەیە و لە تاقمی ئەسڵیی کوردەکان ـ بە «لەکی»یەوە، کە بریتی بێت لە کوردیی ئەو هۆزانەی وا لە نێو دانیشتوانی باکووری لوڕستاندا بڵاو بوونەتەوە، گەلێک جیاوازە.

ئێمە لە [باسی] ئەو کۆمەڵەدا کە «کورد»یان پێ دەگوترێ، لەو سەرەتایەوە دەست پێ دەکەین، کە توێژینەوەی زیاترمان ئەو دانیشتوانەی وا بۆیان هەیە ماوەیەکی زۆر لەژێر حوکمی رێبەرەکوردەکاندا ژیابێتن و لە عەینی پەیوەندی نزیکیان لە گەڵ کورددا، سەر بە چینی جیاواز و شەپۆلی کۆچەرەکان بووبن، [لە کورد] جیاواز دادەنێیت.





پرۆسەی پێکهاتنی هۆزە کوردەکان، گەلێک ئالۆزە. پێشتر «ریچ»[٦] لە باسی خەڵکی شارەزوو دا ئاماژەی بە جیاوازیی نێوان «دلێران» و «وەرزێران»[٧] کردوە (بڕوانە خوارەوەتر، لاپەڕە ٨٤ [ی دەقی ئینگلیزی]. ئێمە دەزانین رێبەرانی هۆزە کوردەکان، لە رەگەزی جوربەجۆرن[٨] و گەلێک شتێکی گونجاوە کە هەندێ لە دانیشتوانی ژێر دەست، لە سەردەمێکی دواتردا، بووبن بە کورد.

لە دەرەوەی بازنەی هەندێ پسپۆری حیرفەییدا، ئەو راستییە کەمتر زانراوە کە ناوچەیەکی بەرین لە لێواری باشوور و باشووری رۆژهەڵاتی خاکی کوردان هەیە کە خەڵکانێکی وای تێدا نیشتەجێن بنەچەکێکی جیاوازیان هەیە و قسەکردنیان، ئێرانیە واتە کوردی نییە. بۆ ئەوەی [باسەکەمان] هاسانتر بکەینەوە، دەکرێ ئەو دانیشتوانە هەر هەموویان بە «گۆران» ناو بەرین.

بە لێبڕاوییەوە دەبێ بڵێین «گۆران» ناوی هۆزێکی سەرەکییە، کە چیاکانی باکووری نێوان بەغدا و کرماشانی لە نزیک چۆمی سیروان (دیالە)[٩] لە باکوور، کردۆتە شوێنی خۆی. ئەم ناوچە «ناکوردی»یە بە هۆی بەرزاییەکانی هەورامانەوە:  هەورامانی لهۆن[١٠]، بەرەو رۆژئاوای زنجیرە بەرزەکە [ی زاگرۆس] و هەروەها هەورامانی تەخت[١١]، بەرەو رۆژهەڵاتی [ئەو ناوچەیە]، درێژە پەیدا دەکات.

جیا لەو دوو تاقمە سەرەکییە، لە دوو ناوچەی دابڕاوی دیکەشدا، بە «گۆرانی» قسە دەکرێ: پاوە ـ لە یەکێ لە دۆڵەکانی لقێکی بچووکی باشووری چۆمی سیروان و کەندۆلە[١٢]ـ لە سەرچاوەکانی رووباری «بانیان»[١٣] و رووبەرووی وێرانەکانی شاری کەونارای «دینەوەر»، ئەو شوێنەی وا لەگەڵ «گاماسیاب»[١٤] دا یەک دەگرنەوە.

لە باجەڵانیش، کە کەوتۆتە باکووری مووسڵ و حەوضەی[١٥] [رووباری] «خوسەر»[١٦] بە شێوە زمانێکی نزیک قسە دەکرێ[١٧]. هەمان هۆز لە زەهاب[١٨] و لوڕستانی باکووریدا دەبینرێ. دوورتر لەوانە و بەرەو رۆژئاوا، ئەوانەش وا پێیان دەگوترێ «زازا» (و لە شێوەی راستەقینەی خۆیدا «دیملی»یە[١٩])، ناوچەیەکی گەلێک بەرفراوانیان داگرتوە کە کەوتۆتە نێوان دیجلە و شوێنی بادانەوەی فورات بەرەو باشووری رۆژئاوا و هەروەها مەڵبەندی نێوان مووش و ئەرزەنجان بە هەموو [ناوچەی] دەرسیمەوە.

ئەوە، شێوەی دابەش بوونی ئێستای دانیشتوانێکی هاوڕەگەزە[٢٠]، بەڵام هیچ

گومانێک لەوەدانییە ئەوان ناوچەیەکی گەلێک بەرینتر دەگرنە بەر، هۆش و بیری سروشتیان ـ بە لای کەمەوە ئێستا، کشت و کاڵییە [نەک خێڵەکی].

لە بەرزاییەکانی هەورامان (نزیک تەوێڵەو بیارە)، کەس ناتوانێ لە پسپۆڕایەتی بێ سنووری گوند نشینان بۆ کەڵک وەرگرتن لە تەختاییە بچووکەکانی زەوی و بۆ ئامانجی باخەوانی و بەرهەم هێنانی گشتی، سەری سوور نەمێنێ. وەک ئەزموونکارییەکی [خەڵکەکە]، دەتوانم باسی کوێخای [گوندی] «زەردە»[21] لە نزیک «بابا یادگار» بکەم، کە هەرگیز چاوی بە خەریطە نەکەوتبوو، بەڵام هەر ئەوەندەی شوێنی گوندەکەی خۆی پێ نیشان درا، دەست بەجێ واتای هەموو ئەو نیشانانەی لە دراوسێیەتی ئەو دانرابوون تێگەیشت. من هیواداارم لە نووسراوەی پێشووی خۆمدا (ئەهلی هەق)[22]، توانیبێتم پەسەندی ئەوە بکەم کە ئاییینەکە، لە دوایین شێوازی خۆیدا، لە ناوچەی «گۆران» ـ هەورامان لە دایک بوە.

دەستکەوتی گۆرانەکان لە گۆڕەپانی ئەدەبیاتیشدا، لەوە کەمتر نییە. ئەویش بە هۆی پێک هێنانی زاراوەیەکی سەرکەییە[23] وە، کە کەرەسەیە بۆ دەربڕینی شیعریی و تەنانەت دراوسێکانی گۆرانیش برەویان پێداوە. ئەم زاراوە سەرەکییە لە دیوەخانی والیانی ئەردەڵاندا، گوڵی کردو لەم دواییەشدا، بۆ پڕۆپاگەندەی مەسیحیەت کەڵکی لێ وەرگیراوە[24].

وەک کلیلێک بۆ کردنەوەی ڕەمز و ڕازەکانی ئاییینی ئەهلی هەق، هەر لە سەرەتای لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتیەکانی خۆمەوە، بیرم لە زاراوەی گۆران کردۆتەوە و بۆ ساڵانێکی زۆر پەیوەندییەکی پڕ لە خۆشەویستیم لەگەڵ لایەنگرانی ئاییینەکەدا هەبوە و ئەو خەڵکە متمانە و میهرەبانییەکی زۆریان پێ کردووم.

لە ساڵی ١٩١٤دا، چاوم بە مەڵبەندی رازاوەی گۆرانەکان کەوت کە زیارەتگەی ئەهلی حەق لە نێو چیای پڕ دارو دەرەخت و ئەو ڕووبارە بەهاژە و گفانەدا شاراوەتەوە وا بەم باڵە و باڵی زاگرۆسی ناوەندیدا دێنە خوارەوە.

من، نووسراوەیەکی سەرەتاییم سەبارەت بە گۆرانەکان لە کۆبوونەوەی سەدەمین ساڵرۆژی ئەنجوومەنی ئاسیایی ساڵی ١٩٢٢دا[25]، خوێندەوە و لە ساڵی ١٩٢٧دا، پوختەیەک لە ماتریالەکانی بەردەستی خۆمم کردە وتارێکی دوور و درێژ ـ کە تا ئێستا چاپ نەکراوە، ئەویش بە هۆی ئەو ڕاستیەوە کە «مارکوارت»[26] هەندێ مەسەلەی



پەیوەندی دار بە «زازا»ی چارەسەر کرد و دکتۆر «هەدەنک» لە ساڵی ١٩٣٠دا، ژمارەیەک دەقی [گۆرانی] بڵاو کردەوە، کە هی دۆستەکەی خۆم ـ «ئوسکارمان» بوو، سەرەتایەکیشی لێ زیاد کردن، و تێیدا ئەو فاکتەرانەی وا لە زۆر نووسەری دیکەی زۆری وەکۆ کردبوون، خستە دەم یەک.

لە ئاکامی ئەو ڕووداوانەدا، ئەرکی سەرشانی من گەلێک هاسانتر بۆتەوە و لێرە بەدواوە، هەوڵ دەدەم تەنیا چەند خاڵی تازە بخەمە بەر تویژینەوە:

١- ناوی گۆران،

٢- بنەچەکیان،

٣- ئەدەبیاتی نووسراو بە زاراوەی سەرەکی گۆرانی - بۆ نموونە ئەو نەقل و حیکایەتە خەڵک خوازانەیەی[27] وا لە گردوکۆکانی «م.ئـ. بێنی دیکت سین»[28] و ئۆسکارمان دا دەردەکەون،

٤- وەک پاشکۆش، دەقی ئەسڵی و تەرجەمەی [ئینگلیزی] «شینگێڕی»یە کەی ئەحمەد بەگی کۆماسی[29] دەهێنمەوە، کە لە نێوا کورداندا لایەنگرێکی زۆری هەیە.

### ١. شێوەگەلی جۆربەجۆری مەفهوومی گۆران/ گووران

گۆرانەکان، لە دەوروبەری ١٠٠٠ ساڵ پێش ئێستا، لە شانۆی مێژوودا دەرکەوتوون. بۆ شوێن هەڵگرتنی یەکەمجاری ناوی «*گۆران» هەزار ساڵی دیکەش دەبێ بگەڕێینەوە دواوە. لە بەر ئەوەی کاتێ بۆ مەزەنده کردنی ناوێکی «قەومیی»[30] ئەوتۆ، تووشی ئالۆزیی زۆر دەبین باشتروایە پێش چوونەسەر هەڵسەنگاندنی مێژوویی سەرچاوەکان، بچینە سەر باسی وشەکە ـ خۆی.

ئـ - خاڵی گرنگ و سەرنج ڕاکێش، بەدەستەوەدانی حونجەی ئەمڕۆیی [وشەکە]یە: گۆران یان گووران[31]؟ ئەو خەڵکە عەشیرەتەی وا فیدراسیۆنێک لە چەند تیرەی ناوچەی کرند ـ زەهاب پێک دێنن بە خۆیان دەڵێن «گووران»، بەڵام فەوتانی /ۆ/ی کۆن لە [شێوازی] گۆرانیدا[32]، دەتوانێ دیاردەیەک بێت کە دواتر خوڵقاوە ـ وەک لە فارسیشدا هەر وایە. تەنانەت لە کوردیدا ـ کە گەلێک موحافەزەکارترە، زیاتر چاومان بە «گووران» دەکەویت[33]، بەڵام بۆ نموونە بیچمی «گۆران»یش هەر هەیە[34].

ئوسکارمان، داستانێکی سەمەرە لە وەرزێرانی ناوچەی مەراغە دەگێڕێتەوە کە دژ بە سەرۆکە کوردەکانیان ـ وا دەستدرێژی ژنانیان دەکردن، ڕاپەڕین ـ ڕاپەڕینەکە «حەیدەری گۆران» ڕێبەرایەتی دەکرد. «مان» دەڵێ، لێرەدا گۆران (کە کوردی موکریان بە «چەتە» دەڵێن)، ناوی بنەماڵەیی ئەو کەسە [واتە حەیدەر] بوە، بەڵام بۆ چوونەکەی لە جێگەی خۆیدا نییە[٣٥]. ئەم داستانە بێگومان دەگەڕێتەوە بۆ گیروگرفتێکی کۆمەڵایەتی و «گۆران»یش بەرواڵەت، واتای «وەرزێر یا کەسێک دەبەخشێ کە بنەڕەتی ناخێلەکی» هەیە[٣٦].

تێکستێکی زاخۆیی کە «سۆسین» چاپی کردوە، دەڵێ:

نەجووم ونە موسڵمان

نەمەسێحی[٣٧] و نە گۆران[٣٨]

ئەم وشەی دوایی [گۆران]، بە بێ گومان ئاماژە بە ئاگرپەرستی و وەرگیرانی تایبەتی [وشەی] «گۆران» لە «گەبران» دەکات[٣٩]. لە شوێنێکی دیکەدا (تێکست، ل ٢٦٥، تەرجەمە، ل ٢٦٥) دا، ناوی گۆران لە گەڵ سەربازەکانی محمدعەلی پاشای بەغدا دا هاتوە وا لە «سنجار» عەمەلیاتی عەسکەرییان دەکرد و دەتوانێ ئاماژەیەک بێت بە هۆزی زەهاب[٤٠]. لەم دوو نموونەیەدا، ئێمەرووبەرووی سەر لێ شێواوییەک لە واتا و «اشتقاق»[ی وشەکە] دەبینەوە.

ب - شتێکی گەلێک گونجاوە کە سەر لێشێواوی لە مەسەلەی بیچمی /ۆ/ و /وو/[٤١] دا، بە هۆی بوونی دووپیتی جیاواز بەڵام وێچووە، روون بکرێتەوە:

گەبران بە واتای خەڵکانی زەردەشتی > گەوران > گۆران، هەروەها ناوی هۆزایەتی *گاوبارەکان > گاوەرەکان > گورەکان > گۆران > گووران‌ە. لە هەردوو قۆناغی ئاڵ و گۆڕدا، دەبێ ئەم دوو وشەیە، حونجەی «گۆران»یان بوو بێت (بەڵام لە کۆتاییدا، دەبن یا خود مەیلی ئەوەیان هەیە ببن بە گووران).

ئەوەی کە ناوی هۆزایەتی «گووران» دەبێ بە قۆناغی «گۆران» دا تێپەڕ بووبێت، بە هۆی حونجە تورکییەکەیەوە (گوێران)[٤٢]، دەسەلمێت[٤٣] (وەک لە ئایینی ئەهلێ حەقیشدا، کە گۆرانەکان باوەڕیان پێیەتی، وەهایە). زمانی تورکی لە دەرخستنی /ۆ/ ی کۆندا[٤٤]، گەلێک موحافەزەکارە[٤٥].

پ - بەکار هاتنی بەربڵاوی وشەی «گۆران» بۆ گەیاندنی مەقوولەی کۆمەڵناسانەی



«وەرزێر» شتێکی زۆر روونە. پێشتر لە «کلۆدیوس ریچ» مان بیستوە گوتوویەتی بۆڵباسی (واتە هۆزی بڵباس)، خەڵکێکیان لە ناودا دەژی کە سەربەخۆ نین واتە وەرزێرن، هیچ مافێکیان بۆ [هەڵسووراندنی] کاروباری خۆیان نییە و وەک «کاست»[٤٦] ێکی ژێر دەست سەیر دەکرێن. ئەم خەڵکە، لێرەو لەوێ لە هەموو کوردستاندا دەبینرێن، سەر بە هیچ هۆز و تیرەیەک نین و عەشیرەتەکان، پێیان دەڵێن «کلاوسپی»[٤٧] و «گۆران». ئەم نازناوەی دوایی، کە ناوێکی موناسیب بۆ خەڵکی سنەیە، بەتایبەت بۆ کەسانی ترسەنۆک بەکار دەهێنرێ. ئایا ئەوانە دانیشتوانی ئەسڵی ئەم ناوچانە بوون و هۆزە چیا نشینە وەحشییەکان دەستیان بەسەردا گرتوون؟ ئەوانە[ی دوایی]، بریتین لە هەندێ هۆزی کۆچەر،کەلە ژێر حوکمی حکوومەتی سنەدا دەژین بەڵام هەموو خەڵکە نیشتەجێ (ناکۆچەر) ـەکان، «گۆرانن»[٤٨].

سێر هێنری راولینسۆن، لە بیرەوەریەکانی ساڵی ١٨٤٤ی خۆیدا، پەسندی ئەوە دەکات کە کەڵهوڕ، «دەرنە» و «دەرتەنگ»[٤٩] یان بەجێ هێشتوە و ناوی «گۆران»[٥٠] یان بە خۆیانەوە بەستووە کە پێشتر بە وەرزێرانی کورد دەگوترا بۆ ئەوەی لە عەشیرەتەکانیان جیا کەنەوە. بەکار هێنانی ناوێکی قەومیی بۆ گەیاندنی مەقوولەیەکی کۆمەڵناسانە شتێکی گونجاوە، وەک پێچەوانەکەشی[٥١]، هەر دەگونجێت. بەڵام گۆرانەکانی سەدەی دەهەم، بە هۆزێکی شەڕانی ناسراون و گەلێک جێگەی گومانە ئەو خەڵکە وەرزێرانەی کوردستان، کە ناوی گۆران /گووران یان لە سەرە، هەموویان پەیوەندیی راستەو خۆیان لە گەڵ هۆزی گۆراندا هەبێت.

بۆی هەیە مێژووی ئەم ناوانە (لە بیچمی «گۆران»[٥٢] دا)، بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی فتووحاتی ئیسلام، کە رەگەزە ژێردەستەکان «گەبران»ی زەردەشتی گۆران بووبێتن[٥٣].

## ٢. ئاماژە کردنی مێژوویی بۆ «گۆران»

ئێستا پێویستە بە تەرتیبێکی مێژوویی هەموو ئەو سەرچاوانە هەڵسەنگێنین، کە باسی گۆرانیان وەک «هۆز» کردوە و بە شوێن ئەوەدا، بگەینە ئاکامێک کە لە سەر ئەساسی ئەو دەقانە دامەزرابێت.

لە سەردەمی کلاسیکدا، نووسراوەیەکی سەرنج راکێشی «سترابۆن»[٥٤] هەیە کە تێیدا





نووسەر، تیئۆرییەک لە سەر بنەمای [بۆچوونی] ئەرمەنییەکان دادەمەزرێنێ و بە هەڵکەوتیش ئاماژە بە «سەرەپەرئە»ی «تێراسی»[٥٥] دەکات و دەڵێ: «خەڵکێکی سەربڕن»، «نیشتەجێی [ناوچەی] پشت ئەرمەنستان و نزیک «گۆرانی»[٥٦] و مێدییەکانن[٥٧]. جا لە بەر ئەوەی ئەو «سەربڕانە»[٥٨] ناتوانن هۆزێکی گرنگ بن، ئیتر بەرواڵەت گۆرانی و مێدییەکان، لە دراوسێیەتی نزیکی یەکتردا دەژین.

پێشتر «ک، موللێر»[٥٩] راست کردنەوەیەکی گرنگی لە «ژاکۆن» ەوە بۆ «سێراکۆن»[٦٠] داوە بەدەستەوە. ئەم راست کردنەوەیە، ئاسۆیەکی تازەمان بۆ دەکاتەوە چونکوو «سیرەکی (* سیرەک، شیرەک)»[٦١]، خەڵکێکی ناسراوی «سەکایی»[٦٢] بوون[٦٣] و وڵاتی ئەسڵیان کەوتۆتە دراوسێیەتی «مەئوتیس»[٦٤]ەوە و ئەو خەڵکە [سیرەکییە]، زیاتر لەگەڵ «ئاورسی»[٦٥] دا ناویان هاتوە[٦٦]. کۆلۆنییەکانی * شیرناک[٦٧] لە زۆر شوێندا ناسراون:

ئـ – خاکی سیرەکی نی[٦٨]، کە کەوتۆتە «هیرکانیە»[٦٩] لە سەر [رووباری] «ئوچوس» (تەجەن)[٧٠] و «کرێتشمێر»[٧١] بە ناوی ئێستای [شاری] «سەرەخس» [ لەباکووری رۆژهەڵاتی ئێران] ـەوەی پەیوەندی دەدات (؟).

ب – بەتلەمیووس، باسی «سیرەکی نی»یەکی دیکەی کردوە (٥، ١٢، ٤) کە هاوجووتی «سەکەثی نی»یە و گوتوویەتی بە درێژایی [زنجیرەکێوی] پەریەدرێس[٧٢] {پۆنتیک، ئالپ؟}[٧٣] لە نێوان چۆمی «کیروس» (کوڕ)[٧٤] و ئاراز[٧٥]، کێشراوە. ئەم نووسینە وا دیارە لە جێی خۆیدا نەبێت. بە هۆی ئەو راستییەوە، کە «سەکەسێنێ» («شەکەشێن»ی عەرەبی و ئەرمەنی)[٧٦]، کەوتۆتە ناوچەی «گەنجە»[٧٧] ی ئەمڕۆوە، «سیرەکێنێ»[٧٨] ش دەبێ لە هەمان شوێندا چاوی بۆ بگێڕرێ[٧٩]. لە راستیدا تەنانەت ئێستاش «شیرەک ستێپ»[٨٠] لە خەریتەکانی رووسیادا، لە باکووری «گەنجە» (رۆژهەڵاتی «کەخێتیە»[٨١] و باشووری «ئەلەزەنە»[٨٢]) دەست نیشان دەکرێت.

پ – بەتلەمیوس، «* سیرەکێنێ»یەکی دیکەی لەگەڵ «سیرەکێنێ»ی ژمارە /ب / لێ شێواوە کە ئاماژە بە ناوچەی ئەرمەنی «شیراک»[٨٣] (بلاذری، ١٩٣: طیرسراج»[٨٤]) لە سەر [رووباری] «ئاخوریان»[٨٥] دەکات. ئێستا «ئارپاچای»[٨٦] ی پێ دەگوترێ. دۆخی ئەم خاکە گرنگە بە پێتەختەکەیەوە «ئانی»[٨٧] لە گەڵ ئاماژەی بەتلەمیووس بۆ رووباری کۆر و ئاراز دا، یەک دەگرێتەوە.



ت – بەشی باشووری پادشاهیەتی ئەرمەنستان، «نور-شیرەکان»[٨٨]ی پێ دەگوترا بەواتای «شیرەکان»ی نوێ (بڕوانە «هوبزمان» هەمان شوێن، ل ٣١٩). هەندێ شوێنی ناوچەی «ئاربیلا»[٨٩] (هەولێر)، لە ژێر حوکمی حاکمی ئەوێ (واتە «بدێ ئاشخ»[٩٠]) دابوو و مارکوارت لە کتێبێکدا کە دوای مردنی خۆی بڵاوکرایەوە[٩١]، بە لێبڕاوییەوە، «نور-شیرەکان» لەگەڵ «ئەدیەبێنێ»[٩٢] ـ واتە دەشتاییەکانی ئاشوور (نەینەوا، هەولێر) بەیەک دادەنێ.

ناوی «ئەدیەبێنێ» لە سەرچاوە ئەرمەنیەکانی زوو ـ واتە سەدەی چوارەمی زایینیدا هاتوە و وشەی «نوێ» پێویست ناکات نیشاندەری ئەوە بێت شارەکە بە ماوەیەکی کەم پێش ئەو مێژوە دروست کرابێت[٩٣].

«نۆرشیرەکان» کە کەوتۆتە راستە خاکی ئێستای گۆرانەوە، زیاتر لە هەموان دەکرێ لەگەڵ ئەو شوێنەدا یەک بگرێتەوە کە لە نووسراوە راستکراوەکەی بەتلەمیووسدا هاتوە و گوتراوە: شیراک کەوتۆتە نزیک گۆرانی مێدییەکانەوە.

وا دەردەکەوێ کە دوو ناوی دیکەش، پەیوەندیان بە «گۆرانیی» کۆنەوە هەبێت: یەکێ لە کوڕانی خوسرەوی دووهەم – کە «شێرۆیە»ی برای لە ساڵی ٦٢٨ی زایینیدا کوژرا، ناوی «کووران (*گووران) شاه» بووە[٩٤]. ئەم ناوە، لەسەر هەمان شێواز دانراوە، کە حاکمان بە گوێرەی ناوی خاکی ژێرحوکمیان ناو دەنرێن. وەک: سەکان شاه (بەهرامی سێهەم، هورموزدی سێهەم؛ کرمانشاه (بەهرامی چوارەم) و... هتد. هەمان عونسوری قەومی، لە ناوی ژنانەی «گۆران دوخت»[٩٥] دا دابینرێ (بەراوردی بکە لە گەڵ «تووران دوخت») کە تەنیا لە گورجستان (دوای سەدەی هەژدەهەم)، شاهیدی بۆ دەبینرێتەوە[٩٦].

ڤاوێلی یەکەم لە «گوورانیە»[٩٧] و «گۆران دوخت» دا، بە رواڵەت /و/ (واتە /U/) ـە، گەرچی بەرانبەری یۆنانی بۆ دەنگی ئێرانی /ۆ/ (/o/) و /وو/ (/U/)، پڕ بە پێست نییە[٩٨]. {بڕوانە پاشکۆ، لاپەڕە ١٠٣ [ی دەقی ئینگلیزی]}.

بە پێچەوانەی ئەو فاکتەرە نوێیانە، هێشتا هەندێ تەنگ و چەڵەمە لەمەڕ پرد هەڵبەستن و پەیوەندیدانی نێوان Guranii کۆن و Gûran ی تازە (<*گابەرەکان)دا هەیە.

لە سەردەمی ئیسلامدا، هەل و مەرج گەلێک روونتر دەبێتەوە. قەدیمترین جوغرافیانووسی عەرەب (کۆتایی سەدەی نۆهەم)، «ابن خوردادبیه»، ل١٤، لیستەیەکی لە

«سەواد» واتە ناوچەکانی میزۆپۆتامیا داوە بە دەستەوە، کە بێ هیچ گومانێک دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ساسانییان. ناوچەی «کوورا»[٩٩]. ئوستانی «شادفەیروز»[١٠٠]، کە «حەلوان»[١٠١]ی ئێستایە: داهاتی [ساڵانەی] حەلوان لەگەڵ «جابارقە»[١٠٢] و کوردان پێکەوە دەگاتە ٤,٨٠٠,٠٠٠ درهەم. شاری کۆنی حەلوان، کەوتۆتە نزیک شاری ئێستای «سەرپولی زەهاو» و ڕووباری حەلوان هەمان «ئەلوەند»[١٠٣] ە کە لە «دەرتەنگ»ەوە دێت و ناوچەی گۆرانەکان ئاودێری دەکات، ئینجا لە نزیک خانەقین تێکەڵ بە «دیالە» دەبێت[١٠٤].

ئیبنی خوردادبیەه، لە شوێنێکی دیکەدا (ل ٤) لە «کورا»ی جێی باسی ئێمە دەدوێ و دەڵێ لە پێنج لقی بچووکتر (تەسووج[١٠٥]) پێک هاتوە: فەیروز قوباذ[١٠٦]، الجبل،[١٠٧] تامەڕڕا[١٠٨]، هەولێر[١٠٩] و خانەقین، ئەوی دواتریان شوێنێکی ناسراوە لەسەر ڕێگەی سەرەکی بەغدا کرماشان. هەولێر بێگومان هەڵەیە چون «ئەربێلە»[١١٠] ی کۆن گەلێک لە حەلوان دوورە و کەوتۆتە دەرەوەی «سەواد»[١١١] ە کەوە[١١٢].

لە نووسراوەیەکی «قودامە»[١١٣] دا، ل ٢٣٥، ئەم ناوە وەک «ارنک»[١١٤] نوسراوە کە دەبێ بە «دەرتەنک»[١١٥] ی بخوێنینەوە یا خوەد وەک «* دەرنەک»[١١٦] ساغی بکەینەوە کە بتوانێ لە گەڵ ناوی ئێستای دەرنەدا یەک بگرێتەوە. دەرنە، کەوتۆتە بەری ڕۆژهەڵاتی [چیای] «داڵەهۆ»[١١٧] و بەشێکی سەرەکی زەهاو پێک دێنێ.

«تامەڕڕا» ناوی کۆنی «دیالە»یە و «تەسووج» واهەیە تەنیا لێواری ڕۆژهەلاتی چۆمەکە بگرێتەوە چون ناوچەی نێوان دیجلە و تامەڕڕا دەکەوێتە ئوستانەکانی دیکەوە. ناوی سێهەم لە تێکستەکەدا، وەک «الجبل» نووسراوە بەڵام بیچمی «البل» [واتە /ب/ ی بێ خاڵ] یشی هەیە. من دڵنیام دەتوانین لە شێوەی «الجبل»[١١٨] دا بیخوێنینەوە، کە ئاماژە بە ناوچەی گێلان [ی غەرب] لە دۆڵی یەکێک لە سەرچاوەکانی ئەلوەند دەکات[١١٩]. «فەیروز قوباذ» زۆر وا هەیە بەشی سەرەوەی ڕۆژهەڵاتی حەلوان لە نزیک «سەرپولی زەهاو» بێت. ئەگەر لێی ورد بینەوە ئوستانی حەلوان ئەو بەشەی زەهاویش دەگرێتەر بەر کە دواتر باسی لێوە کرا.

لە دوو چینی تایبەتی دانیشتوانی ناوچەکە ـ واتە کورد و جابارقە دا (کە بیچمی «کابارکا» و «گابارکا»[١٢٠] شی هەیە)، من زیاتر پێم وایە دەبێ ئەوەی دواییان [واتە جابارقە] بە باپیرانی گۆرانەکان بزانین.



هەمان ناو لە کتێبی «ابن فقیه» لاپەرە ٢٤٥یشدا دەردەکەوێ کە لە ناو شتی سەیر و سەمەرەی هەمەدان دا باسی گۆلی خوێ (مەملەحییە) ی «فەراهان» دەکات، کە ئێستاش لە باکووری «سوڵتان ئاباد» [عێراقی عەجەم یا «ئەراک»ی ئێستا] ماوە. هەروەها، لێی زیاد دەکات و دەڵێ: «کورد» و «جابارەق»[١٢١] لەوێوە خوێ دەبەن بۆ هەموو شوێنێکی «مێدیا» (الی جمیع البلدان الجبال). ئەو ئاماژەیە وا دەگەیێنێ کە لە ئێرانی ناوەندی و لە فاسیلەیەکی دوورتری ناوچەی زاگرۆس دا، کۆمەڵگای هاوشانی [کورد و جابارەق] هەبوە.

«دێگۆیجێ»[١٢٢] ئەم وشەیەی بە ڕۆشنی لە پەیوەندی «کاو بارە» > «کابارە»[١٢٣] ی فارسیدا بینیوە و بە «گاران»[١٢٤] ی واتا کۆکردۆتەوە، واتە بە شێوەیەکی ئازاد واتای شوان و چۆداری پێداوە، لە کاتێکدا تەرجەمەی راستەقینەی «گاوبارە»[١٢٥] دەبێ «گاسوار»یا «کەڵ سوار» بێت.

بمانەوێ ئەم ناوە واتای وشەیی بکەینەوە چ بەناوی کەسایەتییەکەوە پەیوەندی بدەین، دەبێ ئەوە بزانین کە پەیوەندییەکانی لەگەڵ لێواری باشووری زەریای خەزەر [قەزوێن] گەلێک گونجاوە.

ناوەکە ، هەروەها لە لیستەی مەسعوودی لەمەڕ هۆزە کوردەکانی «مێدیا» (الجبال) دا دەردەکەوێ مروج [الذهب]، ٣، ٥٣:

١. شادەنجان[١٢٦]
٢. لەزبە (لوری؟)[١٢٧]
٣. مەدەنجان[١٢٨]
٤. مەزدەنەکان[١٢٩]
٥. باریسان[١٣٠]
٦. خاڵی (* جەلالی < گەلاڵی)[١٣١]
٧. جابارقی[١٣٢]
٨. جاوانی[١٣٣]
٩. مەستەکان[١٣٤]

ئەم لیستەیە لە «تەنبیە»ی مەسعوودیدا (ل ٩١ ـ ٨٨) هەندێک تەواوتر نووسراوە:

١. بازنجان[١٣٥]

٢. شووهجان[١٣٦]
٣. شادنجان[١٣٧]
٤. نساوره[١٣٨]
٥. بووذیکان (* بەرزیکان؟)[١٣٩]
٦. لوڕی
٧. جورقان[١٤٠]
٨. جاوانی
٩. باریسی[١٤١]
١٠. جەلالی
١١. مەشتەکان[١٤٢]
١٢. جابارقە
١٣. جورووغان[١٤٣]
١٤. کیکان[١٤٤]
١٥. مەجوردان[١٤٥]
١٦. هەذبانی[١٤٦] ... هتد.

بەروونی دیارە بە دوای هەردوو ناوی «جابارقی» (لیستەی یەکەم) و «جورقان» (لیستەی دووهەم) دا «جاوانی» هاتوە کە هەر دوو ئاماژە بە یەک هۆز دەکەن. تەنیا جیاوازییەک کە «جورقان» لە گەڵ «جەوەرەقان»ی هەبێت، کورت بوونەوەی درێژایی [ڤاوێلەکان] و حونجەی تیپی بزوێنی /ب/یە . مەستەکان و مەشتەکان لە کۆتایی لیستەی سەرەکی [یەکەم] دا هاتوون و زۆر واهەیە جابارقەی «تەنبیە» تەنیا شەرحێکی روون کەرەوە بێت کە دەقی تازەتر [واتە لیستەی دووهەم] تۆماری کردوە. هەمان شت وا هەیە لە مەڕ «جورووقان» (بۆ * جوورەغان، * جەوەرەغان) یش راست بێت. شایانی باسە ئەم ناوەی کە جێگەی باسی ئێمەیە، ئاواڵ جووتی «جاوانی»یە و بە رواڵەت ئاماژە بە «جاف» دەکات کە تەنانەت ئێستاش لە پێوەندی نزیکی گۆران دایە. بیچمی سەرەتایی ناوەکانیان لە ناوی ناوچەی ژیانیان واتە «جەوانروود» (>جاوان ـ رود) وەرگیراوە کە شوێنی وشەی «جەوان»ی فارسی بە واتای «لاو»ی لە سەرە) [جوانڕۆ]. هەروەها



*جەلالی دەگەڕێتەوە بۆ هۆزی گەلاڵی کە ئێستاش لەو دراوسێیەتیەدا، دەژین[١٤٧].
بەم پێیە، گریمانی سەرەتای باسەکەی ئێمە لە مەڕ بیچمی کۆنتری ناوی گۆران لەبەر رووناکایی نووسراوەکەی مەسعوودی دا سەلماوتر دەبێت.

ناوەڕاستی سەدەی دەهەم، سەردەمی رێنسانسی ئێرانە. لە ژێر سێبەری زنجیرەی ئێرانی (دەیلەمی) «ئالی بوویە»[١٤٨] دا، حاکمانی بچووکی ئێرانی لە ئازەربایجان و کوردستان و هتد، سەریان هەڵدا. لە ساڵانی ٣٤٨/٩٥٩دا، «حەسەنۆیە»[١٤٩] ی کوڕی حەسەن سەرۆکی کوردانی بەزیکان «پاشایەتی»یەکی گرنگی لە ناوچەی زاگرۆس دامەزراند. لەوەش سەرنج راکێشتر، حکوومەتی درێژخایەنی کوڕ و جێگیرەکەی، واتە «بەدر» ە (٤٠٥-٣٦٠/ ١٠١٤-٩٧٩ز)، کە مێژوونووسان گەلێک بە باشی ناویان بردوە.[١٥٠]

ناوبراو هۆزەکەی خۆی رێبەرایەتی دەکرد، پشتی وەرزێرانی دەگرت، باجی لە رووی ئینسافەوە دادەنا و ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەو لە باکووری لوڕستان (سابوور ـ خواست) و تەنانەت لە نزیک «خوزستان»[١٥١] ـەوە هەتا «شارەزوور»[١٥٢] ی دەگرتە بەر. گەلێک جار [لە سەرچاوەکاندا] باسی جورقان (* جەورەقان) ی ژێر دەسەڵاتی بەدر کراوە.

لە ساڵی ٤٠٥ (١٠١٤) دا، «بەدر» لەشکری هێنایە سەر مەزنی هۆزێکی کورد ـ حوسەینی کوری مەسعوود و قەڵای «کوسحد»[١٥٣] ی لێ گرت. بەڵام ئەستەم بوونی کاری لەشکرکێشان لە زستاندا، بوە هۆی نارەزایی لە شکرەکە و بەدر بە دەستی یەکێ لە ئەندامانی لەشکر بە ناوی «جوورەقان» کوژرا. حوسەین، جەنازەکەی نارد بۆ «مەشهەدی عەلی» (کوفە) تا لەوێ بینێژن. ئەوەش نیشاندەری هەندی مەیلی شیعایەتی لە لایەن بەدرەوەیە. «جوورەقان» هەڵات و چوو بۆ لای «شمس الدولە»ی دیلەمی، بەڵام واهەیە [بەم ناوە] تەنیا باسی تاقمێکی تاوانبار لە هۆزەکە کرابێت.

لە ساڵی ٤١٧ (١٠٢٦) دا «علاءالدولە کاکویە»[١٥٤] ئامۆزایەکی خۆی کردە حاکمی «سابورخواست» و «جوورەقان»یشی خستە سەری. لەوەش زیاتر ئەوی دیکە [واتە جوورەقان] خرایە ژێر حوکمی سەرەک هوزێک بە ناوی «عبدالفرج بابوونی» کە ئەویش خزمی [کاکویە] بوو و ئەم کارە بوە هۆی ئالۆزی و پێکدادانی زیاتر[١٥٥]. سابوور خواست (واتە شوێنی ئێستای خورڕەم ئاباد)، ئەوەندە لە زنجیرەی زاگرۆسەوە دوورە کە دەبێ وای دابنێین جوورەقانی «بابوونی»[١٥٦] لە شوێنێکی نزیک لوڕستان بوە.





له راستیدا ابن الاطهر (٩، ٢٥١) ئاماژه به هاوکارییه‌کی نێوان علاءالدوله کاکویه و به‌شێک له جوره‌قان له شه‌ڕێکدا ده‌کات که له ساڵی ٤١٨ (١٠٢٧) له نزیک «نه‌هاوه‌ند» رووی داو له باسی ساڵی ٤٢٣ (١٠٣٢) دا (هه‌مان، ٩، ٢٨٩)، له ئاماده‌یی جوورقان له نزیک سابوور خواست ده‌دوێ.

کاتێ له ساڵی ٤٣٧ (١٠٤٦)دا ئیبراهیم یێنال[١٥٧] له لایه‌ن «طغرل»ه‌وه نێررایه هه‌مه‌دان بۆ ئه‌وه‌ی شاره سه‌ره‌کییه‌که‌ی ئه‌وێ بگرێ، علاءالدوله هه‌ڵاته جوورقان و «یێنال» به‌ره‌و «السیره» چوو ـ که که‌وتبوه باکووری رۆژئاوای لوڕستان و به‌شی سه‌رووی «که‌رخه»وه و له‌وێ هێرشی کرده سه‌ر ئه‌و کوردانه‌ی وا له دراوسێیه‌تی شوێنه‌که دامه‌زرابوون و سه‌ر به جورقان (من جورقان) بوون. علاءالدوله ئه‌مجار هه‌ڵاته لای «شهاب الدوله عبدالفوارس منصور» کوڕی حه‌سه‌ن ـ که به‌روالەت حاکمی «*حه‌لوان» بوو له خوزستان (نه‌ک «ئه‌لجه‌زیره»)[١٥٨]. شه‌ڕه‌که ده‌بێ له خوار دۆڵی که‌رخه‌دا رووی دابێت.

هه‌موو ئه‌و ئیشاراته، راده‌گه‌یێنن که له نیوه‌ی یه‌که‌می سه‌ده‌ی یازده‌هه‌مدا، لای که‌م به‌شێکی جووره‌قان که‌وتبوه ده‌روازه‌ی باکووریی لوڕستانه‌وه، ئه‌ویش وا هه‌یه په‌یوه‌ندیی له گه‌ڵ ئه‌و «جاباره‌ق»ـه‌دا هه‌بێت وا (پێشتر) «ابن فقیه» باسی لێوه کردوه یا خود بۆی هه‌یه په‌یوه‌ندی به به‌شێکی ئه‌و هۆزه‌وه بێت که تاوانی کوشتنی «به‌در» له سه‌ر شانی ئه‌وان بوو (پێشتر).

ئه‌و رووداوانه‌ی له «الطاهر» دا تۆمار کراون و له «المجمل التواریخ»یشدا ٥٢٠ (١١٢٦) باسیان لێوه کراوه که نووسه‌ره نه‌ناسراوه‌که‌ی، خه‌ڵکی «ئه‌سه‌دئاباد» (ی رۆژئاوای هه‌مه‌دان) بوه و ناوچه‌ی جێ باسی ئێمه‌ی به باشی ناسیوه[١٥٩]. نووسه‌ری «مجمل» که‌ڵک له هه‌مان سه‌رچاوه‌ی «ابن الطاهر»[١٦٠] وه‌رده‌گرێ به‌ڵام هه‌ندێ به‌رانبه‌ری سه‌رنج راکێش [بۆ ناوه‌کان] داده‌نێت:

ناوبراو بۆ «جورقان»[١٦١] (*جه‌وره‌قان[١٦٢]) ی «ابن الطاهر» جێگرێکی وه‌ک «گوورانان»[١٦٣] (گوورانان) ی داناوه و به‌م شێوه‌یه، گریمانی سه‌ره‌تایی ئێمه [له مه‌ڕ یه‌کبوونی جورقان و گۆران] ده‌سه‌لمێنێ.

خالی دووهه‌م ئه‌وه‌یه «مجمل»، هه‌ندێ شه‌رح و بۆچوونی وای پاراستوه که ئێمه له



«ابن الطاهر»دا نابینین بۆ نموونه: له مه‌سه‌له‌ی شه‌ڕ کردنی به‌در و کوڕه‌که‌ی واته هیلێل (هیلال) دا، باسی شه‌ڕی به‌در له‌گه‌ڵ هۆزه‌که‌ی خۆی به‌رزیکانیان (به‌رزیکان) ده‌کات [و ده‌ڵێ:] ئینجا به‌در گۆرانه‌کانی به‌رز کرده‌وه، به‌شێوه‌یه‌ک که هیچکه‌س له‌وان به به‌دره‌وه نزیکتر نه‌بوو. هه‌ر چۆنێک بێت، ئه‌وان [واته گۆرانه‌کان]، له کاتێکدا به‌در ده‌ستی کرد بوو به ئابڵوقه‌دانی «خووشین» (کذا) ی کوڕی مه‌سعود له قه‌ڵای «کوش خد»[١٦٤]، له لێواری چۆمی «سفید روود»، خه‌یانه‌تیان پێ کردو کوشتیان (ساڵی ٤٠٥ (١٠١٤)).

زۆر نه‌گونجاو دێته پێش چاو «به‌در» بیتوانیایه عه‌مه‌لیاته‌که‌ی به‌ره‌و حه‌وضه‌ی «سفید روود» (ده‌رژێته زه‌ریای قه‌زوینه‌وه)، په‌ره پێ بدایه. هه‌روه‌ها گومانی به هێزم هه‌یه ئه‌و ناوه هه‌مان «سیروان»ی «مجمل [التواریخ]» (به هه‌ڵه خوێندراوه‌که‌ی، سپید روود»)[١٦٥]بێت که ناوه‌ڕاستی دیاله‌یه و «زه‌هاب» (ی باشووری) له هه‌ورامان (ی باکوور) جیا ده‌کاته‌وه.

شوێنی «کوش خد» («کوسحد»[١٦٦] ی ابن الطاهر و «کوسجد»[١٦٧] ی شه‌ره‌فنامه) ناناسرێته‌وه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر سفید روود هه‌مان سیروان بێت، وا هه‌یه قه‌ڵای به‌ر باسی ئێمه «* کوسج»[١٦٨] بێت و له شوێنی ئه‌مڕۆی «کۆسه‌ی هه‌جیج»[١٦٩] وه‌ستابێت. له‌م حاڵه‌ته‌دا، ئه‌و گۆڕانانه‌ی وا هاورێی به‌در بوون، له‌و به‌ری چۆمه‌که‌و له دراوسێیه‌تییه‌کی گه‌لێک نزیکی خاکی ئێستایاندا، جم و جۆڵیان هه‌بوه.

روون کردنه‌وه‌یه‌کی «مجمل» سه‌رنجی ئێمه به‌ره‌و خۆی راده‌کێشێ. گوتراوه گۆرانه‌کان «به‌در»یان به نێزه (زووپین)[١٧٠] کوشتبێت. ئه‌م چه‌که په‌یوه‌ندێکی تایبه‌تی له‌گه‌ڵ ناوچه‌ی «خه‌زه‌رییه‌کان»ی ده‌یله‌می دا هه‌یه.

له قامووسی جوغرافیایی «یاقووت» دا (٦٢٣/١٢٢٥)، بێ گومان جه‌وره‌قانییه‌کان (که زۆر جار له کتێبی «ابن الطاهر» دا به هه‌ڵه جووزه‌قان Jûzaqân نووسراون)، به «حه‌لوان»ه‌وه په‌یوه‌ندی ده‌درێن (٢، ١٥٢).

«حمدالله [مستوفی] قه‌زوێنی» له «نزهةالقلوب» (٧٤٠/١٣٤٠)، ل ١٦٥دا باسی رێگای سه‌ره‌کی کرماشان بۆ حه‌لوان (به رێگه‌ی کرند و که‌لی به ناوبانگی «طاقی گیرڕا»[١٧١] دا) ده‌کات و ده‌ڵێ: "گه‌رچی ئه‌م رێگایه، به « * گێل و گێلان»[١٧٢] دا، یه‌ک فرسه‌خ دوورتره، به‌ڵام له‌وی دیکه‌یان باشتره". له شوێنێکی دیکه‌دا، ل ٢٢٠، باسی

چۆمی «نەهرەوان» دەکات کە هەمان «دیالە» بێت و دەڵێ: "لە دوو لق پێک هاتوە. یەکیان (واتە سیروان یا دیالەی ئەسڵی)، «لە شانی سیروانەوە» دێت، لە کاتێکدا ئەوی دیکەیان (واتە حەلوان، ئەلوەند) لە ناوچەی (حدودی) گیل و گیلانەوە هەڵدەکشێ و بە «طاقی گیرڕا»دا تێپەڕ دەبێ. ئەو [رووبارە]، لە کانیاوێکی گەورەوە دەست پێ دەکات کە دەئاشی ئاوی پێ دەگەڕێ. ئینجا بە حەلوان و قەسری شیرین و خانەقیندا تێپەڕ دەبێت».

گومانێک نییە کە نیازی قەزوینی لەوەی گوتوویە، هەمان ئەو چۆمە بێت کە لە دۆڵی سەرووی «رێژاو» ەوە[173] دێت (واتە دەرەتەنگ). لە راستیشدا رێگە سەرەکییە ناسراوەکەش هەر بەوێدا تێ دەپەڕێت[174].

بەم پێیە، ناوی کاراکتەریستیکی «* گیل و گیلان» لە دەقی «حمدالله» دا، ئاماژە بە ناو جەرگی خاکی کوردان دەکات نەک بە دۆڵی «گیلان» کە لە شوێنێکی زۆر خوارەوەتردا، دەرژێتە ئەلوەندەوە. کاتێ ئەم خاڵە دەگرینە پێش چاو، وشەیەک کە قەزوینی هێناویەتی [واتە «گیل و گیلان»]، نرخی زۆر پەیدا دەکات.

لە دەورووبەری ساڵی ٧٤٤ (١٣٤٣)، زانای میسری «شهاب الدین العمری»[175] خشتەیەکی بە نرخی هۆزەکوردەکانی ـ بە گوێرەی سەرچاوەکان پێک هێنا. ناوبراو شەرحەکەی خۆی بە «گۆران» دەست پێ دەکات و دەڵێ:

"لەکێوەکانی هەمەدان و شارەزوور، نەتەوەیەکی کورد کۆبۆتەوە کە بە کوورانی (الكورانيه) ئاماژەیان بۆ دەکرێت، خەڵکێکی دلێر و جەنگاوەرن و لە سەرباز و وەرزێر پێک هاتوون (جند و رعیە)، لە شوێنێک دەژین کە ناوی «راوست الامیر محمد» ە و شوێنێکی دیکەش بەناوی «دەرەتەنگ». سەرۆکێکیان هەیە ناوی ئەمیر محمدە، پێنج هەزار کەسن و لەناویاندا کێشە و جیاوازیی نییە[176].

«دەرتەنگ»[177] بەشی یەکگرتووی زەهاوەو لە پەیمانی ساڵی **١٦٣٩**ی ئێران و عوسمانیشدا، بە هەمان شێوە باسی کراوە. بەم پێیە ئێمە پەسندێک لەمەڕ بوونی گۆرانەکان لە خاکی ئێستایاندا لە ناوەڕاستی سەدەی چاردەهەم [ی زایینی] وەدەست دێنین. بەڵام بە دڵنیاییەوە دەبێ بە چەندین سەدە پێش ئەو تاریخەش، هەر لەوێدا ژیابن.

ناوەندێکی دیکەی گۆران ـ کە بە شێوەی ئاسایی دوانەی دەرەتەنگە، بریتییە لە



«دەرنە» (* دەرنەک)[178]، کە کەوتۆتە لای رۆژهەلاتی «دالەهوو»[179] لە دۆڵی «زیمکان»[180]. ناتوانرێ شوێنی ئەم ناوە، لە «راوست»[181] دا هەڵبگیرێ و راست وەک پرسیارێکی بێ وەڵام دەمێنێتەوە بەڵام دوور نیە ئاماژەیەک بێت بە دانیشتوانی لقی رۆژهەلاتی تری گۆران[182].

بە گوێرەی «شهاب الدین [العمری]»، گۆرانەکان لە [خەلکی] دلێر و وەرزێر پێکهاتوون. هۆی ئاسایی ئەم دابەش کردنە، ئەو راستییەیە کە ژمارەیەک لە هۆزەکان، هۆزی دیکەی خۆیانیان کردۆتە ژێر دەستەو ئەگەر ئەم گریمانە راست بێت، دەبێ گۆرانەکان لە ناوچەکەدا رووبەرووی هەندێ هۆزی کۆن بوو بێتنەوە، گەرچی دەتوانین بیر لە هەندێ «چین بەندیی» کۆمەلایەتیش بکەینەوە.

لە سەدەی سێزدەهەمدا، ئاڵ و گۆڕێکی گرنگ بە سەر کوردستاندا هات: هێرشکارە مغولەکان، ئێرانییە شاخاوییەکانیان بێ بەزەیانە لە ناو برد. بە گوێرەی «شهاب الدین [العمری]»، دوای تالان کردنی بەغدا (١٢٥٨ز)، تیپی شارەزوور، کە سەر بە هۆزی «اللوسه» (*کۆسە)[183] و «الناسریه (؟)»[184] بوون، کۆچیان کرد و چوون بۆ سووریا و میسر ئینجا شوێنی ئەوان نەتەوەی «حوسه»[185] گرتیەوە کە ئەندامانی ئەو نەتەوەیە، کوردی راستەقینە نەبوون.

کاترێمیر، ئەم ناوەی دوایی [واتە »حوسە»] ی وەک «حسنویه»[186] ـەوە ساغ کردۆتەوە و بەم شێوەیە دەیەوێ پەیوەندی بە ناوی زنجیرەی «حەسەنویە»[187] بدات. بەهۆی ئەو راستیەوە کە گۆرانەکان لە نێو لایەنگرانی «بەدر»دا بوون، دەگونجێ بیر لەوە بکەینەوە کە ئەوان دوای دامەزرێنەری زنجیرەکە، لەو شوێنە نیشتەجێ بوون[188].

هەرچۆنێک بێت ، باس و خواسی بلاوبوونەوەی دانیشتوانی غەیرە کورد لەوە وردترە کە ساختەیی بێت و جیاواز لە تاقمی هۆزەکانی گۆران، ئێمە ناتوانین هیچ جێگرێک کە ناوچەکەدا ببینین.

سەرەڕای گرنگایەتییەک کە شەرەفخان لە سەرەتای «مێژووی کوردان» [شەرەفنامە] دا (١٠٠٥ (١٥٩٦)) بە «گۆران»ی دەدات، لە دەقی کتێبەکەدا جارو بار نەبێت ئاماژەیان پێ ناکات ئەویش بە گێژ و گومییەوە. لە سەردەمی ئەودا، زۆربەی گۆرانەکان لە ژێر رێبەرایەتی کەلهور و ئەردەلانیەکاندا دەژیان و ئەوە خۆی رووبەرووی مەسەلەی

بوومەلێلی «زنجیرە» و هۆزەکانمان دەکاتەوە: نیازی شەرەفخان بە روالەت ئەوە بوە هەموو کوردە (غەیرە کرمانجییەکان) ی کرماشان (و بۆی هەیە «سنە»یش) لەژێر ناوی کەلهوڕدا بگونجێنێ[189]. بەلام لە لاپەڕە ٣١٧ دا دەلێ: «عەشیرەتی کەلهوڕ، وا گۆرانیان پێ دەگوترێ» و لە لاپەڕە ٨٣ دا دەیسەلمێنێ کە باپیرەگەورەی ئەردەلانیەکان ـ پێش کۆتایی هاتن بە حکوومەتی چەنگیزییەکان لە ئێران، بوو بە حاکمی شارەزوور و هەر ئەویش بۆ ماوەیەکی زۆر لەنێو گۆرانەکاندا ژیابوو. لە لاپەڕە ٢٩٦دا پەسەندی ئەوە دەکات حاکمانی برادۆست لە هۆزی گۆران بوون و دوور نیە لە کوڕانی «هیلال»ی کوڕی بەدر بوویێتن.

شەرەفخان، لە باسی کوردانی ئێراندا (سیاە مەنسوور، چگینی و زەنگەنە) وای دادەنێ کە خۆیان (یا خود سەرەک هۆزەکانیان) لە لوڕستانەوە هاتبن، بەلام لێی زیاد دەکات و دەلێ: "هەوالێکیش هەیە کە لە گۆران و ئەردەلانەوە هاتبن". هەروەها دەکرێ هەوالێکی پرسوود لەو راستییە وەربگیرێت کە «شاهوێردی خان» ـ حاکمی لوڕستانی باکووری (کە لە ١٠٠٦ (١٥٩٧) دا مردوە)، لە هەولی ئاوە دان کردنەوەی «خوڕڕەم ئاباد» دا «تاقمێک لە هۆزی گۆران»ی لەوێ دامەزراند و ئەوە دەری دەخات کە گۆرانەکان وەک سەردەمی «بدری کوڕی حەسەن»، لە باکووری لوڕستاندا ژیاون»[190].

بە گوێرەی نووسینی سێر هانری راولینسن[191]، سولتان مورادی چوارەم کەلهوری لە زەهاب دوورخستەوە و خاکەکەیانی دا بە «باجەلان» ـ کە لە مووسلەوە هێنابوونی[192].

سپاس بۆ ئوسکارمان کە ئێستا [بە هۆی نووسینەکانی ئەوەوە] دەزانین، باجەلانی موسل بە زاراوەیەکی گەلێک نزیک بە گۆرانی قسەیان دەکرد. بەرنامەی «زالّ بوەکان» ئەوە بووگۆرانەکان لە رێگەی ژێردەستەکانی خۆیانەوە بێننە ژێر کۆنترۆل، کە ئەو ژێردەستانە دەبێ کۆلۆنییەک لە هەمان تاقمە عەشیرەت بوو بێتن.

بە قسەی راولینسن، کەلهوڕ، پاشان ناوی «گۆران»ی لە خۆی نا ـ کە «پێشتر بەکوردی وەرزێر دەگوترا» و بە سەر سێ تاقمی سەرەکیدا دابەش دەکران: «قەلعەزەنجیر»[193]، «کرند» و «بیوەنیژ»[194]. ئەم بۆچوونە، تەنیا «کەلهوڕ»ی زەهاب دەگرێتەوە.

بەرانبەریی «گۆران = وەرزێر»، لە گەل قسەکانی شەرەفخان (ل ٣١٧) دا کە پێشتر باسمان لێوە کرد، یەک ناگرێتەوە، تەنیا شتێک کە دەتوانین سەبارەت بە ئالّ و گۆڕی



دوای سالی ١٦٣٩ی زایینی [سالی مۆر کردنی پەیمانی ئێران و عوسمانی] بلێین، ئەوەیە کەلهوڕەکان لە شوێنی تایبەتی خۆیان هەلکەنران ولە نێو حەشیمەتی گۆرانەکاندا توانەوە و باجەلان رێبەرایەتی هەموو هۆزە یەکگرتووەکانی بەدەست خۆیەوە گرت.

هەر چۆنێک بێت، ئەوە شتێکی کاراکتەریستیکە، کە پاشاکانی باجەلان نشیمەنگەیەکی تازەیان لە دەشتایی (و لە شوێنی وێرانەکانی شاری زەهاو) دا بۆخۆیان بنیات ناو بەم شێوەیە، لە داوێنی ولاتی گۆراندا مانەوە. زۆریش شتێکی گونجاوە کە بەشێک لە جافەکان وا ئێرانییەکانیان بە «جافی مورادی» ناویان دەبەن، واتە ئەوانەی پەیوەندیان بە سولتان مرادی چوارەمەوە هەیە، بۆ ئەوەی پشتگیری حاکمانی باجەلان بکەن لە زەهاب دامەزران.

کاتێ ئێرانییەکان دەستی بالایان هەبوو، هەولی تێکدانی دەسەلاتداریەتی باجەلانەکانیان دا. نادر شاە [ی ئەفشار]، کە ئەحمەد پاشای باجەلان دژایەتی دەکرد، بەشێک لە هۆزەکەی راگوێست و بردنیە دراوسێیەتی «خوڕڕەم ئاباد»[195].

دوایین پاشای زەهاب لە بنەمالەی باجەلان ـ شازادە محەمەد عەلی میرزا (حاکمی کرماشان لە ١٨٠٦/٨/٢٢ وە تا ١٨٢١/١١/٢٢) لە سەرکاری لابرد، ناوبراو رێبەرایەتی گۆڕانە ئەسلێیەکانی قەلعەزەنجیری دانیشتووی گەهوارەی سەر لە نوێ دامەزراندبووەوە[196].

### ٣- ئاکام

ئێستا ئێمە لە ئەنجامی توێژینەوە و هەلسەنگاندنی سەرچاوەکانی بەردەستماندا گەیشتوونەتە ئەم ئاکامانە:

١. ناوی هۆزەکە [گۆران]، لە سەرچاوە سەرەتاییەکانی ئیسلامدا، وەک جابارەق > * جەورەقان > * گۆرانان هاتوە. ئەم گۆڕانکارییە، وا دەردەکەوێ باسی «اشتقاق»ی [وشەی] گوان لە «گەبران»ی نەکردبێت، بەپێچەوانە، پەسەندی ئەوە دەکات کە لە مەڕ شێوازی «گا (و) بارە (ک) بە واتای «کەل سوار» گوتوویەتی. ئێستا من هەست بە دلنیایی دەکەم کە «گەهوارە»ی شوێنی کۆنی خانەکانی گۆران، هیچ نییە جگە لە وشەیەکی خەلکخوازانەی فارسی [گەهوارە] بەواتای لانکەی گاوارە رەسەنەکان.





گۆرانەکان خۆیان پێیان گوتم کە شێوە نووسینی فارسی ئەم وشەیە نا راستە و من لە [کتێبی] «چیریکۆڤ» (ل ٣٠٢) دا، ناوەکەم چاو پێکەوت کە بە پیتی رووسی «گاوارەک» نووسراوە و زۆر وا هەیە «* گاڤارەک» بێت.

٢. ناوە کۆنەکە، زۆر وا هەیە پەیوەندی بە ناوچەکانی خەزەرەوە هەبێت. بناغەدانەری زنجیرەی ئەو حاکمانەی وا ناوی خۆیان بەشوێنەکان بەخشیوە و لەژێر حوکمی ئەواندا گیلان لەگەڵ رۆژئاوای تەبەرستاندا یەکیان گرتبوو[١٩٧]، «گیل گاوبارە»[١٩٨] یان پێ دەگوترا و ئەم ناوە، بە رۆشنی دیارە لە سەر نەریتێکی ئەفسانەیی دەڕوات. ئەگەر «گیل» ئاماژە بە بنەچەکی شاه بکات، ئەوا "گاو بارە" دەبێ بە رواڵەت نیشانەی خاکێک بێت کە تازە داگیری کردوە و لەگەڵ یادی «فەریدوون»یشدا پەیوەندی دەبێت. «ابن اسفندیار» (ل ١٥) و «ظهیرالدین» ( ل ١٣) ناوی ئەم قارەمانە، بە «گاوسەوار»[١٩٩] دەبەن بە واتای کەسێک کە سواری گا دەبێت هەر بەو بیچمەشەوە لە وێنە مینیاتۆرە ئێرانیەکاندا نیشان دراوە[٢٠٠].

خاڵی سەرنج راکێش ئەوەیە «نزهەالقلوب» ناوی «*گیلی گیلان» بۆ «دەرتەنگ» بە کار دەهێنێ کە ئەویش لەنێو جەرگی خاکی گۆران دایە. تەنانەت ئێستاش، یەکێ لە سەرچاوەکانی لای چەپی [رووباری] ئەلوەند، پێی دەگوترێ «گیلان»[٢٠١]، ئەو شتانەش ناتوانن هەر بە هەڵکەوت روویان دابێت. لەبەر رووناکایی ئەوانەدا، «مێجەرسۆن» ئەفسانەیەکی لە هەورامان تۆمار کردوە کە هەندێ سوودی بەرچاوی [بۆ ئەم باسە] هەیە. بە گوێرەی ئەفسانەکە، «دەریوس» (Darius) ی مێدی، «ئەورام» (Aorâm) ی ئەسڵیی لە زێدی خۆی لە نزیک دەماوەند شاربەدەر کرد... ئینجا ناوبراو لەگەڵ براکەی خۆی واتە «کەندۆڵ» Kandul، کە ناوی «کەندۆڵە» دەبێ لەوەوە هاتبێت، هەڵات و چوو بۆ مێدیا»[٢٠٢].

٣. لە سەردەمی گەلێک کۆنەوە، ناوچەکانی خەزەر، سەرچاوەی هێزێکی ئینسانی بوون کە لەوێ هەڵقولاون و بەرەو لای رۆژئاوا کشاون. «بوندە هیشن» [ی ئاڤێستا][٢٠٣]، ٣١، لاپەڕە ٣٨، بەرزاییە دارستانییەکانی «تەبەرستان» [مازەندەران] ی رۆژئاوا ( واتە «پەدرهیس خوارگەر»[٢٠٤])، وەک وڵاتێک ناودەبات کە «دانیشتوانی رێگاپێو و شوانن، بەهێز و ئیشکەرن[٢٠٥] و بەسەر دوژمنانیادا زاڵن».





دەوری ئەم ناوچەیە لە دەوری «سکاندیناویا»ی سەردەمی «ڤایکینگ»[٢٠٦] ـەکان دەچێت. زۆر شوێنی سەر سنووری رۆژئاوای ئێران، شاهیدی ئەو نفووزەن؛ شوێنێک بە ناوی «دەیلەمستان» لە شارەزوور هەیە (یاقووت، ٢، ٧١١) و «دیلمان» («دیلمەقان»ی کۆنتر)، هێشتا ناوچەی سەرەکی «سەلماس»ـە. ناوچەیەکی بەرینی باشووری رۆژئاوای گۆلی ورمێش، وەک شارێک لە گیلان، ناوی «لاهیجان»[٢٠٧] لەسەرە. جا دەکرێ بە هەمان شێوە، لە «گاوبارە» ش (کە زۆر جاران لە گەڵ «گیل» دادێت)، شوێنی کۆچی ناوچەکانی باشووریتری زاگرۆس هەڵبگیرێ.

٤. پێشتر «ئیبن خوردادبیە» (کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم)، باسی گۆران (* گاوبارەک) ی لە دراوسێیەتی ملەی ئەسڵیی زاگرۆس کردوە، بەڵام وەک پێشتر گوتوومانە لیستەی ئوستانەکانی ئیبن خوردادبیە، بێگومان بنەمایەکی «ساسانی» هەیە. لە بەر ئەوەی ئوستانی حەلوان دوای «پیروز»[٢٠٨] ناو نراوە (٤٨٤ ـ ٤٥٩ ز)، شتێکی وێچووە ئەگەر شاه بەرپرسی نیشتەجێ یی و دامەزران لە هەموو ناوچەکە بووبێت. بەتایبەت «کەڤات»[٢٠٩] ی کوڕی «پیروز» (واتە «فەیرووز قوباذ») واهەیە یەکێک لە شاروچکەکانی ئەم ئوستانەی بنیات نابێت. ئاشکرایە دەبێ شاهانی ساسانی گرنگایەتی زۆریان دابێت بە ئاسایشی ئەو رێگا سەرەکییەی وا پەیوەندی پێتەختەکەیان «تیسفوون»ی نێو مێزۆپۆتامیای بە خاکی ئێرانەوە دەدا.

هۆزە ئەسڵییە غەیرە ئێرانیەکانی زاگرۆس[٢١٠]، دەبێ بە هاسانی توانیبێتیان تا سەردەمی ئەشکانی[٢١١] و ساسانی[٢١٢] مابێتنەوە. پێویستە راگوێستن و بە ئێرانی کردنی ئەوانە بەشێک لە سیاسەتی ساسانیان بووبێت. شتێکی بەکەڵکە ئەگەر دەرئەنجامی باسەکەی مارکوارت (ئێرانشەهر، ١٢٦) وەبیر بێنینەوە، کە دەیلەم و «پەدهیشک وارگەر» ێ تەنیا لە سەردەمی کەڤات [قوباد] ی یەکەم (٥٣١-٤٨٥) یا خوسرەوی یەکەم (٥٧٩-٥٣١) دا بەخاوەنی پەیوەندێکی نزیک لەگەڵ ئیمپراتوریەت [ی ئێرانی] زانیوە. هاوکات لە گەڵ ئەوەدا، دەبێ زۆربەی دانیشتوان بەرەو زاگرۆس راونرابن.

٥. سەبارەت بە کۆلۆنیەکانی دیکەی گۆران[٢١٣]، راپۆرتی «ابن الفقیە» لە سەر جابارەقی نزیک فەراهان وا هەیە بە هۆی ناوی گوندی «گەورە» (گەوارە)[٢١٤]وە کە «چیریکۆڤ»، (ل ١٨٠)، لە پێنج فرسەخی باشووری رۆژهەڵاتی «سوڵتان ئاباد»ی

دادەنێت، پەسەند بکرێ. پێرستی چیریکۆڤ (ل ٦٨٥) دەڵێ تەنانەت رووباری گرنگی «گـاوەروو» (لقی لای چەپی سـیـروان) دەبێ وەک «گـاوە روود»یا «* گـاواروود» بخوێنرێتەوە. ئیدغامێکی ئەوتۆ گەلێک گونجاوە بە تایبەت ئەگەر گریمانەی خۆمان سەربارەت بە پەیوەندی نێوان گۆران و خەزەر [قەزوین] وەبیر بێنینەوە و هەروەها ئەوەی کە ناوچەیەکی بچووکی باجدەرە وەک «گاوەرۆ» ، ناوی «کانی گیلان»[٢١٥] ی لەسەر بوو.

تەنیا ٢٠ مایل بەرەو باشووری گاوەرۆ، لە سەر سەرچاوەی رووباری بانیان، هێشتا کۆلۆنی «کەندۆلە» هەیە کە بە گۆرانی قسە دەکەن و دوازدە مایل خوارەوەتری چۆمەکە، ـ دوای کەندۆلە، گوندی «گیلانە»[٢١٦] هەڵکەوتوە. گەلێک سەرچاوە ئاماژەیان بە بوونی هەندێ گۆران لە راستی باکووری لوڕستان و حەوضەی [رووباری] کەرخە (سەیمەرە) کردوە[٢١٧].

گوندی «گەهوارە»، کە کەوتۆتە ٥ مایلی باشووری بێستوونەوە، زۆر واهەیە کۆلۆنییەکی «گەهوارە» (* گاڤارە) بووبێت کە لەسەر «زیمکان» (پێشوو) هەڵکەوتبێت. سەرنج راکێشتر لەوەش ناوی ئەو کەلەیە[٢١٨] وا کەوتۆتە سەر رێگای دۆڵی «سەیمەرە» بۆ ناوچەی «هەراسەم»[٢١٩] لە سەر چیای «وەردەلان»[٢٢٠]: «ملەگەهوارە»[٢٢١] (مل، مێل[٢٢٢]، [مله] لە کوردیدا بە «کەل» دەگوترێ).

ناوچەکە زۆر کەم ناسراوە و هەر لە بەر ئەو هۆیەش ئێمە مەزەندە و گومانی خۆمان سەبارەت بە نوێنەرانی «جەورەقان = گۆران» لە رۆژگاری ئەمرۆدا، گەلێک کەم کردۆتەوە. ئێمە لە عەینی کاتدا کە شوێنەگۆڕکێی «گۆران» بە گوێرەی تێزە گومان لێکراوەکان لە بیر ناکەین[٢٢٣]. پێویستە بایەخ بدەین بەو راستیەی کە یەکێ لە ناوەندە گرنگەکانی ئەو فیرقەیە [ئەهلی حەق] واتە شوێنی بنەماڵەی «خان ئاتەش» لە «گەرڕەبان»[٢٢٤]ـە، و ئەویش کەوتۆتە ٥ مایل خوارەوەی ئەو شوێنەی وا چۆمی گاماساب و قەرەسوو لە دەروازەی خاکی لوڕستاندا دەگەنەوە یەک.

دەگوترێ «خان ئاتەش» لە هۆزی «دلفان»[٢٢٥] بێت کە ئەویش گرنگترین هۆزی ئەهلی حەق لە لوڕستانی باکوورییە[٢٢٦]. دەگوترێ «دلفان»ـەکان بەزاراوەی کوردیی باشووریی واتە بە «لەکی» دەدوێن[٢٢٧]. بەڵام تیرەکانیان زۆر وا هەیە ژمارەیەک لەو دانیشتوانەیان



لەناو خۆیاندا تواندبێتەوە کە بە گۆرانی دەئاخڤن. شەرح و باسێکی زیاتر، بۆی هەیە پەیوەندی نێوان دلفان و ناوچە خەزەرییەکان [دەور و پشتی زەریاچەی قەزوین] دەربخات: لە ساڵی ١٨٩١ دا برادەرە خوالێخۆش بووەکەی من ـ «ئاغاسام»، کە خۆی لە بنەچەکی «دلفانی» بوو راپەرینێکی ئایینی لە «کەلاردەشت» لە بەری رۆژئاوای دەیلەمانی کۆن، رێبەرایەتی کرد[٢٢٨].

٦. دوا قۆناغی باسەکەی ئێمە، دەبێ بەراوردێک بێت لە نێوان زاراوەی تاقمی گۆرانی (واتە گۆرانی ئەسڵی، هەورامی، باجەلانی، زازایی) و هەندێ تاقمی دیاریکراوی زاراوەکانی وشکارۆی ناوەندی. ئۆسکارمان لە ساڵی ١٩٠٦دا، ئامادەی ئەوە بوە لە زاراوەی گۆرانیدا «پاشماوەکانی زمانی کۆنی مادی» ببینێ. ("Abkömmlinge der alten medischen Sprache")[٢٢٩] بەڵام سێ ساڵ دواتر، بە بەرزەفڕییەکی کەمترەوە، گۆرانی و زازایی وەک زاراوەیەکی مەرکەزی چاو لێکردوە[٢٣٠].

ئەوەی گۆرانی گەلێک لە کوردی جیاوازە، ناتوانرێ هیچ گومانێکی تێدا هەبێت، بەڵام زاراوە مەرکەزییەکانی ئێران[٢٣١] بە ئامێتەیەکی زۆری عونسوری وشە و رێزمانیانەوە کارێکی ئەوتۆ دەکەن کە هەر چەشنە بەراورد کارییەکیان ژمارەیەک وێچوویی و هەروەها جیاوازیی زۆریان لەنێواندا دەردەخات.

زاراوە خەزەریەکان ـ وەک تاقمێکی تایبەت، هێشتا بە شێوەیەکی رەزامەندانە نەکەوتۆتە بەر لێکۆلینەوە و ئێمە دەبێ ئێستاش لە ناو دۆڵە دوورکەوتوەکاندا هەر بە مەزەندە و گۆترە کار بکەین وەک لە سەرەوەتریش ئەو گریمانە کراوە، ناوچە خەزەرییەکان سەرچاوەی سەرەکی بوون و کۆچەرەکان لەوێوە بەزۆر راونراون. [بەم پێ یە] شتێکی گونجاوە ئەگەر هەموو هۆزەکان ماڵی خۆیان بەجێ هێشتبێ بۆ ئەوەی تاقمی دیکەی تێدا نیشتەجێ بن.

ئێمە بەتایبەت لەمەڕ ئەو زاراوەیەی وا لە زێدی ئەسڵی دەیلەمییەکاندا قسەی پێ کراوە هیچ شتێکی تایبەت نازانین[٢٣٢] – ئەو دەیلەمییانەی کە لەسەدەی دەهەمدا بوون بە ئاغای ئێران و میزوپۆتامیا و واهەیە لقی ئەو زاراوانەیان کە ئێستاش هەن لەماوەی دوور و درێژی لێک دابڕانیاندا، پێک هاتبێت.

لە بارودۆخێکی ئەوتۆدا، وا باشترە ئێمە بۆچوونە مێژووییەکان بۆ ئەو سەردەمە بەجێ

بێڵێین کە سەبارەت بە زاراوەکان دەسکەوتی تازەترمان دەبێت، واتە لە لای خۆمانەوە ناسنامەیەکی بەپەلەیان بۆ دروست نەکەین.

## ٤. ئەدەبیاتی نووسراوی گۆران

لە هەل و مەرجی ئێستا دا دەکرێ تەنیا پیرستێکی بە مەزندە، لە ئەدەبی «گۆرانی» بدرێ بە دەستەوە چونکە ئەگەر تەنانەت ناوی دانەری [شیعرەکان] یش ئاشکرا بێت، هێشتا زانیاریی ئێمە لە مەسەلەی چوونیەتی ژیان و تاریخەکانیاندا کورتی دێنێت.

ناسینەوەی زاراوەکانیش ـ بە هەمان رادە نەگونجاوە ئەویش بە هۆی ئەو راستییەوە کە گۆرانی نووسراو، زاراوەی سەرەکی ئەدەبیە لەکاتێکدا لە روانگەی دانیشتوانی ناوچەکەوە ئەدەبی گۆرانی بریتییە لە تاقمێکی هاوچەشنی شوێنەواری هونەری. لە زاراوەی هەوراماندا بە ستران گوتن دەڵێن «گوورانی چڕین»[٢٣٣].

لە پەخشاندا، ئێمە تەنیا بە هەواڵی نامیلکە ئایینیەکانی ئەهلی هەق دەزانین. نوسخەی کتێبە ئایینیەکەیان ـ «سەرئەنجام»، کە لە ساڵی ١٩١١دا، تەرجەمە رووسییەکەیم بلاوکردەوە، بە فارسی نووسراوە بەڵام جیاواز لەو شیعرە گۆرانیانەی تێیدا نووسراون، هەندێ شوێنەواری عیبارەتی گۆرانی لە پەخشانەکەیدا پارێزراوە[٢٣٤].

«حاجی نعمت الله» نووسەری «فرقان الاخبار»[٢٣٥] دەڵێ: "ریسالەی «تەحقیق»ی بە کوردی نووسیوە و نیازی لە کوردیش زۆر واهەیە «گۆرانی» بێت چون لە شوێنێکی دیکەشدا (ل ٣)، دەنووسێ «کوردی» زمان (زبان ظاهری) ی سوڵتان سوهاک بوە کە ئێمە دەزانین ناوبراو، بە گۆرانی قسەی کردوە. عیبارەتە «کوردی»یەکانی نێو «فیرقان» ئەو راستیە دەسەلمێنین کە بە «گۆرانی» نووسرابێتن[٢٣٦].

ئەدەبیاتی شیعری لە «گۆرانیدا» بریتین لە سێ تاقم: چیرۆک، لیریک و ئایینی. لە بەشەکانی دواتری ئەم وتارەدا، ئەغلەب باسی سێ دەستنووس دەکەم کە لە ئەمسەڵدا، کلۆدیوس ریچ و ر. تایلۆر[٢٣٧] پەیدایان کردوون و ئێستا هی مۆزەخانەی بەریتانیان. ریۆ بە بێ یارمەتییەکی لاوەکی، لە دیاری کردنی واتای دەقەکان و ئامادەکردنیان و هەروەها نووسینەوەی سەرلەنوێی ریزمانی گۆرانیدا، سەرکەتوو بوو. بڕوانە «کاتالۆگی دەستنووسە فارسیەکان [ی بریتیش میوزیوم]، بەرگی دووهەم، لەپەڕە ٧٣٤ ـ ٧٢٨». هەروەها ریۆ



گەیشتە ئەوئاکامەی کە «ئەگەرچی لە کوردستان قسەی پێ دەکرێ، بەڵام زاراوەکە [واتە گۆرانی] لە بنەڕەتدا، فارسییە.»

بۆ بەشی [شیعری] لیریک، من باسی دستنووسی ژمارە Or. 6444 ی مۆزەخانەی بەریتانیا لاپەڕە ٨ تا ٥٤ م کردوە، کە هەندێ بەشی لە لایەن «ئی. بی. سۆن»ەوە بڵاوکراوەتەوە (گۆڤاری ئەنجومەنی پادشاهی ئاسیایی، جانیوەری ١٩٢١، ل ٥٧ تا ٨١). [ئەو دەستنووسە، ئێستا چاپ کراوە. بڕوانە: کەشکۆڵە شیعرێکی کوردی گۆرانی، گردەکۆیی شیخ عبدالمومن مەردۆخی، ساغ کردنەوەی ئەنوەری سوڵتانی، چاپەمەنی تراستی سۆن بۆ کوردستان، ١٩٩٨، لەندەن. زیادکراوی وەرگێڕ]. لیستەیەک لە ناوەڕۆکی دەستنووسەکە لە ساڵی ١٩٢٧ دا لەلایەن مستەر «س. توپالیان»[٢٣٨] ـەوە بۆم پێک هاتوە بەڵام بەشی زۆر بەکەڵکی [باسەکەی من]، بریتین لەو [زانیاریانەی] وا دکتۆر سەعید خانی کوردستانی لە رۆژی پێنجەمی مانگی جولای ١٩١٧ دا لە تاران پێی داوم.

لە مانگی مایسی ١٩١٤دا، لە زەهاب و لە ساڵی ١٩١٨دا لە سنە، ژمارەیەک دەستنووسی گۆرانیم وەچنگ کەوت بەڵام دوای ئەوەی ئێرانم کە ساڵی ١٩١٩دا بەجێ هێشت، بەشی زۆری دەست نوسەکان دزران. بەختەوەرانە من هەندێ بەشی نووسراوەکان [ی ئەودەستنووسانە] م بە شێوەیەک کە برادەرەکەم واتە سالاری گۆران پێی دیکتە کردبووم، پاراستبوو. سالار بۆ ماوەیەک لە ساڵی ١٩١٧دا وەک پەنابەرێک لە تاران دەژیا.

### ئ. چیرۆکەکان

١. کتێبی خورشیدی خاوەر، باسی ئەوینی خورشید ـ شازادەی وڵاتی خاوەر و خەرامان ـ کچی ئیمپراتۆری چین دەکات، دانەری نەناسراوە[٢٣٩] (لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا نووسراوەتەوە، [ژمارەی کتێبخانەکە]، Add. 7829 و ژمارەی پەڕەکانی ٦٨ [١٣٦ لاپەڕە]ن، هەر لاپەرەیەک، ١٥ دێری جێ بۆتەوە). ریۆ، حەوت فەردی [لە کاتالۆگی کتێبخانەی بەریتانیادا] هێناوەتەوە کە بە «دمای حەمد ذات جیهان ئافەرین» دەست پێ دەکات. ئەوەش سەرەتای نامەی خورشید بۆ خاوەرە بە گوێرەی ئەوەی لە بەر نوسخە وون بوەکەی خۆم پێم دیکتە کراوە:

قەڵەم گرت وە دەس بیهرووز سەوەر
نویسا جواو نازدار کیشوەر
سەرنامە وەئاو تەڵا ئینشا کەرد
ئەوەڵ ئیسم زات موشکیل گوشا بەرد

٢. لەیل و مەجنوون، ژمارە Add. 7829 [٢٤٠] پەڕەی ٦٨ تا ١٣٤[ی هەمان نوسخە] ١٥ دێر لە لاپەڕەیەکدا. بەم شێوەیە دەست پێ دەکات: «واحید بێچوون، حی بێ هەمتا».
دەستنووسەکەی من ، بەشێک لەو شێعرەی تێدایە کە «لەیلی بۆ چاو پێکەوتنی مەجنوون، دەچێتە کێوی نەجد» (١٨٦ فەردە شیعرە). پێیان گوتووم، کە دانەرەکەی «مەلا مەلەو»[٢٤١] ە (* هەڵەو = هەڵۆ یاخود «وەڵەو» = منداڵ، لە وشەی عەرەبی «وەلەد» ەوە) [نیازی مینۆرسکی دەبێ میرزا وەڵەدخانی کەنوڵەیی بێت. وەرگێر] کە گۆرانێکی گەهوارییە و تا ساڵی ١٨٨٥ ـ ١٨٧٥ زیندوو بوە. ئەوەش سەرەتای ئەو چیرۆکە خەڵک خوازانەیە:

کووچێ شۆو مەیل کەرد یەک شۆو ئەمیر شاه
مەیل لەیلی داشت دۆستخواهی لەیل کەرد
شۆو کووچ – ێ سارای دەشت دوجەیل کەرد
جارچیان جاڕ دان وە حوکم شاوە
بەو ئێل [و] ئەحشام بەنی شیپاوە (بە نووشەیبان) [شیعرەکە هەندێک شێواوە. وەرگێر].

٣. خوسرەو و شیرین، Add. 7826 تاریخی ١٢٣١ (١٨١٦)، ١٥١ پەڕە (دەوروبەری ١٨١٢ دێر، لاپەڕەکانی سەرەتای فەوتاون و بەم شیعرە دەست پێ دەکات:
«گشت بە پەشێو حاڵ، بە دل گرانی»
نوسخەیەکی تەواو لەو شیعرە هی Preussische Staatsbibliothek, Pertsch لاپەڕە ٩٦٣، ژمارە ٩٩٥هـ و ١٤٢ پەڕەیە، لە ساڵی ١٢٤١ (١٨٢٥) دا نوسراوەتەوە و «هۆرنل» لە ساڵی ١٨٣٧دا، لە شاری تەوریز کڕیویەتی. نوسخەیەکی سێهەمیش بە شێوەی رەسمی هی من بوو و ئێستا تەنیا سەرەتای ئەو بەشەم بۆ ماوەتەوە کە باسی لە



دایک بوونی خوسرەوی پەرویز دەکات:
مەولوود مەوجوود، بە کام و وایە
سپەردش وە دەس دایەن و تایە
پێچانش وە بەرگ واتای [کاڵای. وەرگێڕ] بۆ عەمەر
پەروەرشش دان بە شەهد و شەکەر

٤. فەرهاد و شیرین
دەستنووسی «هۆرنل» ، هەمان لاپەڕە ٩٦٣، ژمارە ٩٩٤، پەڕەی ٧٠ ب تا ٩٣، بەم شیعرە دەست پێ دەکات:
با پەردەیی غەیب، بێ عەیب پەروەردە
کێ، رووحەت [ ؟] صیفات، تەمام نەکەردە
نوسخەکەی من لەو [چیرۆکە] شیعرە، ناتەواوە، ٥٤ پەڕە، دەوروبەری ١٦٨٠ فەرد وهی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمە، بەم شیعرانەش دەست پێ دەکات:
کێ دنیاش وەکام، تا بەسەر بەردە
لە پەڕەی ٣٠ چەپدا، باسی چوونی شیرین بۆ بیستوون کراوە:
بشنەو جەشیرن، دڵدار دیرین
هەوای فەرهاد کەرد، نەقەسرشیرین
جەفا کێشاوێش ئاوەردش وەیاد
بەنا کەرد بۆبوو، بوینۆ فەرهاد

٥. بەهرام و گولەندام
رووداوی ئەویندارى بەهرام کوڕی شای کیشوەر لەگەڵ گولەندام ـ شازادەی چین، مۆزەخانەی بەریتانیا Add. 23554 ، ژمارەی پەڕەکانی ٥٣ ، هەرلاپەڕەی ١٢ دێر، سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم، بەم شێوەیەی دەست پێ دەکات:
جە عیشق یاوەر، مە جۆشا چون بەرق
جەدڵ مەکێشا نەعرە وێنەی بەرق

٦. هەفت خوانی ڕۆستەم

دەستنووسی «هۆرنل»Pertsch، لاپەڕە ٩٦٣، ژمارە ٩٩٤، پەڕەی ١ تا ٢٦ی چەپ[٢٤٢]. شیعرەکە باسی گەڕانی ڕۆستەم لە مازەندەران دەکات. بڕوانە شاهنامە چاپی Vullers، بەرگی ١، لل ٣٣٥ تا ٣٥٧. دەستنووسەکە بەم شێوەیە دەست پێدەکات:

به نام بێچوون، بینای بیهتەرین
پادشای بێ باک، جیهان ئافەرین

من گوێم لە شیعری ڕۆستەم و دێوی سپی بوە و سەرنجم داوەتی (Vullers, i, 351) کە دەبێ بەشێک لە هەفت خوان بێت.

٧. سوهراب و ڕۆستەم

پەڕەی ٢٦ی ڕاست هەتا ٥٥ی ڕاست لە هەمان دەستنووسی «هۆرنل».

٨. جەهانگیر و ڕۆستەم

جەهانگیر کوڕی ڕۆستەمە و کارەساتەکانی، وەبیر هێنەرەوەی بە سەرهاتی براکەی واتە سوهرابن.[٢٤٣] دەستنووسێک کە بە شێوەی ڕەسمی لە بەردەستی من دایە (و لەزەهاب کراوە)، بەم شێوەیە دەست پێ دەکات:

ئیبتدای ئەوەڵ بە نام یەزدان
ئافەرینەندە [ی] ئینس و جینن و جان
ئەربدەی تەوفیق، حی لاینام!
شەممەی[٢٤٤] بواچم ژ دەستان سام
ژ بەعد سوهراب، شەهید خەنجەر
ڕۆستەم ژ هیجران، ویش کەرد دەربەدەر

٩. کتاب خاوەران

ڕووداوە توند و تیژەکانی ژیانی عەلی کوڕی «ابی طالب»ن. [دەستنووسەکە] بە شێوەی ڕەسمی ملکی منە. بەشی کوژرانی «صەلصالی دێو» بە دەستی عەلی دەکات و سەرەتاکەی بەم شێوەیەیە:

شای مەردان، ژ خاو کەردشان بێدار
هاڵەت صەلصال پێش کەردن ئیزهار
نەکەرد مەدارا، ئەمیر گوزین
شی نە پەی صەلصال مەلعوون بێدین

١٠. کتاب محمد حەنیفە

داستانی محمد کوڕی عەلی کوڕی ئەبی طالب و ژنەکەی واتە «خەوله الحنیفه»[٢٤٥] یە، دەستنووس، پاریس، کتێبخانەی نەتەوایەتی، کاتالۆگی تکملەی فارسی[٢٤٦]، ژمارە ٧٧٧، ٣٥ پەڕە.

«کۆتایی هات کتێبی محمد حنیفە (کذا) بە زمانی گۆرانی کە تێیدا ستایشی ئیمام (کذا) علی مرتضی و کوڕەکەی محمد حەنیفە و باسی شەڕ و غەزاکانیان کراوە. شەعبانی ساڵی ١٢٢٨ دوای هیجرەتی پێغەمبەر ـ سلاوی لێ بێت (ئۆگۆستی ١٨١٣).

سەرەتاکەی: دێڕی دوایی دوای «بسم الله» بەم شێوەیە یە:

یا خودای ڕەحمان، یا خودای غەفور
یا خودای سیر پۆش سەتتار و سەبوور

١١. نادر و تۆپاڵ

من تەنیا گوێم لێ بوە باسی ئەم شێعرەیان کردبێت [واتە خۆم چاوم بە دەقەکە نەکەوتوە]، بێگومان ئاماژەیە بە شەڕی نادرشاە [ی ئەفشار] لە گەڵ تۆپاڵ عوسمان پاشای دلاوەر لە ساڵی ١٧٣٣ی زایینیدا لە دراوسێیەتیەکی نزیک واتە لە زەهاب. بڕوانە: لوکهارت[٢٤٧]، «ناردشاه» ١٩٣٨، ل ٦٨.

١٢. جەنگنامەی شاهزادە محمد[٢٤٨] * عەلی میرزا، باکەهیا پاشا

ئەم شیعرە، لاپەڕە ٥٥ تا ٧٠ی دەستنووسەکەی «هۆرنل» ێ گرتۆتە بەر. بڕوانە Pertsch، ژمارە ٩٩٤. دانەری [چیرۆکەکە]، «میرزای کەرەندی» باسی زاڵ بوونی شاهزادە «علی میرزا» حاکمی کرماشان، بە سەر «کەهیا داود پاشا»ی بەغدا دا دەکات لە

مانگی جوونی ۱۸۲۱: بڕوانە ریچ، داستانی مانەوە .... [گەشتنامە]، بەرگی ۲، ل ۱۸٤، ئەم ڕووداوەش لە دراوسێیەتی زەهاودا، ڕووی داوە.

۱۳. جەنگی مەلەخ با ئاتەش ـ مەلووچ

شێعرێکی حماسی – گاڵتەجارە[٢٤٩]، سەبارەت بە شەڕی کوللە لەگەڵ باڵندەی ئاینەمەل ( بەفارسی ئاتەش مەلووچ) و بە کوردی ئاهیر مەلووچ. لە عەرەبیدا «سەمەرمەر» و بە لاتینی «پاستۆر ڕۆزیۆس» [٢٥٠] ناوی دانەری ڕوون نییە[٢٥١]. تاریخی هێرشی کوللە لە دەقی شیعرەکەدا ئاماژەی پێ کراوە ـ کە لە ساڵی ۱۳۰۰ (۱۸۸۲ز) دا بوە و بەم پێیە دەبێ شێعرەکە دوای ئەو تاریخە نووسرابێت. ئەو نوسخەیەی وا لە بەردەستی مندایە، حەوت پەڕەیە و هەر پەڕەی ۱٥ دێری تێدا نووسراوەتەوە[٢٥٢].

سەرەتای شیعرەکە بریتیە لەم فەردانە:

ئەوەڵ ئیبتدا، بەنام کەریم
فضل بسم اللەالرحمن و الرحیم
جەنگ ئاینە مەل چەنی شای جەڕڕاد
بوا چوون، یاران خەم بدەین وە باد
ژ سەنەی هەزار سێصەد یا کەمتەر
پەیابی مەلەخ، گروی بەدنەزەر
مولکا گەرمەسیر تاشەهر بەغداد
وەسەوزی خوریا، گەردش دان وە باد.

ب. لیریک

باشترین ڕێبەرێک کە بۆ لیریکای گۆرانی بە دەستەوە بێت، کەشکۆڵەکەی موزەخانەی بریتانیا Or. 6444 یە، کە شیعری ۲۷ شاعیری گرتۆتە بەر[٢٥٣] و هەموویان پێش ساڵی ۱۷۸۸ واتە تاریخی[نووسرانی] دەستنووسەکە ژیاون:

۱. مەحزوونی، پەڕەی ۱۰، ۳۲، ۳۳، دەگوترێ نووسەری دیوەخانی والی ئەردەڵان



خوسرەو خانی یەکەم بوە، کە لە ساڵانی ۱۲۰٤ ـ ۱۱٦۸ (۱۷۸۹ ـ ۱۷٥٤)دا حکوومەتی کردوە. (مێجەرسۆن دوو شیعری لێ بڵاو کردۆتەوە).

۲. شێخ ئەحمەدی تەختی، پەڕەی ۱۱؛ خەڵکی هەورامانی تەخت، تا ساڵی ۱٦٤۰ زایینی لە ژیاندا بوە. (سۆن دوو شیعری لێ بڵاو کردۆتەوە.)

۳. محمد قوڵی سلێمان، پەڕەی ۱۲، ۱۳ (سۆن یەک پارچەی لێ بڵاو کردۆتەوە).

٤. میرزا ابراهیم، پ ۲٦.

٥. مەولانا قاسم، ۲۸.

٦. یوسف یاسکە، پ ۳۲، بە قسەی دکتۆر سەعید خان، خزمەتکاری خان ئەحمەدخانی ئەردەڵان بوە. ئاغاکەی گومانی لێکردوە کە خەریکی ڕابووراردنە لەگەڵ ژنەکەیدا واتە کلاوزێر خانم کچی [خوشکی] شا عەبباس و زیندە بەگۆڕی کردوە.

۷. شێخ لطف اللە، پ ۳۲.

۸. مەلاطاهیر ئەورامانی، پ ۳۲، ۳۸ ( سۆن: پارچە شێعرێک).

۹. ئەلیاس بەگ، پ ۳۳.

۱۰. مەلا فضل اللە، پ ۳۳.

۱۱. حاجی عەلی محەمەد بەگی تیلەکۆ، پەڕەی ۳٤ (تیلەکۆ، یەکێکە لە ناوچە ڕۆژهەڵاتیەکانی ئەردەڵان، بڕوانە «سنە» Senna لە ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام دا.)

۱۲. مەولانا فەڕڕخ پەڵەنگانی (سۆن پارچەیەک شیعری لێ بڵاو کردۆتەوە). پ ۳٤.

۱۳. مەلا حافظ فەرهاد، پ ۳٤.

۱٤. ڕەزا بەگ، پ ۳۹.

۱٥. محمد ئەمین بەگی ئەورامی، پ ۳۹.

۱٦. شێخ یەعقووب خان [جان، وەرگێڕ]، پ٤۰.

۱۷. ئوەیس بەگ، پ ٤۰.

۱۸. مەولانا یوسف برای حەبیبی کەلان، پ ٤۱.

۱۹. شێخ حەسەنی دەرەهەردی، پ ٤٥.

۲۰. عەبدی، پ ٤٦.

۲۱. عومەر نەززاری، پ ٤٦.





٢٢. شێخ مستەفای تەختی، خەڵکی هەورامانی تەخت، پ ٤٨.

٢٣. صۆفی عەلی کیوانی (؟)، ش ٤٩.

٢٤. شێخ ئەحمەدی مووئی، پ ٤٩.

٢٥. لالۆ خوسرەو، پ ٥٠.

٢٦. شێخ شەمس الدینی دەرهەردی، پ ٥١.

٢٧. ئوستاد میکائیل، پ ٥١.

٢٨. خانای قوبادی، پ ٥١؛ لە عەشیرەتی جاف کە (ئێستا؟) بە کوردی دەدوێن و ئەگەر دەرکەوێ شیعری خانا بە شێوەی گۆرانی کوتراوە «هەمەگیریی» زاراوەی گۆرانی لە کاری ئەدەبی دا دەسەلمێ یا خود ئەوە دەگەیەنێ کە جافەکان زمانیان گۆڕیبێ.

لە درێژەی ئەو ناوانەی وا لە کەشکۆڵەکەدا دەبینرێن، ئەم ناوانەشم لە لایەن دکتۆر سەعید خانەوە پێ گوتراوە:

٢٩. مەلا مستەفا بێسارانی[٢٥٤]، خەڵکی گوندی بێسارانە لە ناوچەی ژاوەرۆ، لە دەورو بەری ساڵی ١٧٦٠ دا ، کۆچی دوایی کردوە و لە «دووڕوە»ی هەورامانی تەخت نێژراوە. وا هەیە هەمان [شێخ مستەفای] ژمارە ٢٢ بێت[٢٥٥]. بێسارانی دیوان (واتە کلیات) ێکی لەخۆی بە جێ هێشتوە.

٣٠. سەیدی، هەتا ساڵی ١٥٢٠ی زایینی پیاوێکی ناوبە دەرەوە بوە و بە زاراوەیەکی تایبەتی نووسیوە کە ئێستا لە ناو چوە. ئەو نموونانەی وا دکتۆر سەعید خان بۆی ناردبووم گۆرانی بوونی شێوازەکە نیشان دەدەن، بەڵام لە جیاتی «وێم»ی گۆرانی کەڵک لە «خوەم» وەردەگرێ[٢٥٨]. دیوانێکی (کلیات)ی لە «رێژاو» (هەورامانی تەخت) هەبوە بەڵام خاوەنەکەی ئیجازەی نەداوە کۆپیی لەبەر هەڵبگیرێ[٢٥٩].

٣١. ئەحمەد بەگی کۆماسی، بەو «شین گێڕی»یەوە ناسراوە، کە ئێمە لە خوارەوەتر، بە دوور و درێژی باسی لێوە دەکەین [گڵکۆی تازەی لەیل]. دکتۆر سەعیدخان لە گەڵ نووسینەوەی شیعرەکەدا، پارچە شیعرێکی دیکەی ئەویشی نووسیوە.



**پ. شیعری ئایینی:**

سەڵەوات نامەی خانەقای قوبادی (سەرەوەتر، ژمارەی ٢٨ بەشی لیریک)، نموونەی شیعری ئۆرتۆدۆکسی شیعە بۆ ڕێزگرتن لە محەمد و عەلی یە. دەستنووسەکەی من (تاریخی ١٣١٠ (١٨٩٢ز) هەیە) و چل و نۆ فەرد شیعرە، پڕە لە باس و خواسی عادەتی و کەمتر تام و بۆنی عەناسوری زاراوەیی پێوە دیارە. شیعرەکە بەم شێوەیە دەست پێ دەکات:

یارەب بە حاجەت زات بێ عەیبت
بە سیرر تەقدیر ژ عیلم غەیبت
ئانەن فەئانەن، سەعات بە سەعات
هەر ژ رۆی ئەزەل تا رۆی قیامەت
هەرِ لەحزە هەردەم، هەر رۆ زیاتەر
سەڵوات بوو بە نوور پاک پێغەمبەر

«عەقیدە نامە»ی مەلا رەحیمی تایجۆزیش دەبێ لە هەمان مەقوولەدا بوو بێت (سەرەوەتر بەشی لیریک، ژمارە ٣١). «کیتابی خاوەران»یش (سەرەوەتر بەشی چیرۆک، ژمارە ٩) بە هەمان شێوە لە کتێبی «کاذبە»ی شیعە بەولاوەتر ناچێت.

سەرنج ڕاکێشتر لەوە، ئەنگیزەی هۆندنەوەی ئەو شیعرەیە وا لە بەر خۆشەویستی و ڕێزگرتن لە محەمدی کوڕی حەنیفە (سەرەوەتر، بەشی چیرۆک، ژمارە ١٠) گوتراون. ئەو محەمدەی کە فیرقەی غالی «کەیسانییە» بە ئیمامی خۆیان و هەندێ لە لایەنگرەکانی بەو کەسەی دەزانن وا چاوەڕوانی گەڕانەوە و دەرکەوتنی دووبارەی دەکەن [واتە «ئیمامی زەمان»][٢٦١].

لە ساڵانی ٦٦ و ٦٧ی کۆچی (٧ ـ ٦٨٥ی زایینی) دا «موختار»ی ناودار، دروشمی خەباتی بۆ پشتگیری کردنی داواکارەییەکانی محمد کوڕی حەنیفە هەڵگرت[٢٦٢]. ناوبراو لە ساڵی ٦٦ ک/٦٨٥ دا، کرایە حاکمی «حولوان» بۆ ئەوەی بچێتە شەڕە جەنگی کوردان (بڕوانە: IA, 4, 187) و وا هەیە کوردە سوونییەکان.

بە پێچەوانە، دوور نییە ئەم ڕووداوانە بۆ گۆرانە ئەهلی هەقەکان نیشانەی بڵاو بوونەوەی «غالی»یە شیعەکان لە زاگرۆس و تەنانەت قارەمانییەتیان لەپێناو مافی چینی چەوساوە (واتە مەوالی) دابێت.

هەر چۆنێک بێت، کاتێ باسی ئەدەبیاتی ئایینی لە نێو گۆرانەکاندا دەکەین، لە ژوور هەموانەوە دەبێ نووسراوەکانی ئەهلی حەق بگرینە بەر چاو. ئێمە گوتمان بناغەدانەری فیرقەکە ـ واتە سولتان سوهاک لە «بەرزنجە» لە دایک بوە و ئەو شوێنەش کەوتۆتە ١٦ مایلی رۆژهەڵاتی سولەیمانییەوە و زۆر لە نزیکەوە پەیوەندی بە گۆرانەکانەوە هەیە. یەکێ لە سروودە ئایینیەکان [ی ئەهلی حەق]، بەراشکاوی دەڵێ سولتان سوهاک بە «گۆرانی» دواوە. تەنانەت سەردەمێکی درەنگتر، کاتێ ئایینەکە لە ئازەربایجان «بە تورکی کرا»، یەکێ لە فریشتەکان ـ خان ئەڵماس، بە هەردوو زمانی تورکی و گۆرانی سروودی هۆندەوە (بۆ نموونە: «چار گۆشە ماتەن»). ژمارەیەک لە سروودەکان بە بیچمی گۆرانی کۆنیانەوە، لە دەقەکەی «سەرەنجام» دا دەبینرێن وا ئێستا لە بەردەستی من دان (نوسخەکەی من لە ساڵی ١٢٥٩ (١٨٤٣) دا نووسراوەتەوە). وا هەیە «شێخ ئەمیر» لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا ژیابێت (چونکو تێیدا ئاماژەیەک بە «گۆبینۆ»[٢٦٣] کراوە) و من لە شیعری ئەو شێخ «ئەمیر» ە، «هەفتاد و دوو کەلیمە» م هەیە.

ژمارەیەک کەلام هەن، کە هی سەیدەکانی خامۆشین و ئەوانیش بنکەیان لە «تووشامی»[٢٦٤] یە لە نزیک گەهوارە. سەید رۆستەمی کوڕی سەید عەزیز، کوڕی سەید براکەی ناودار، کە هەتا ساڵی ١٩٢٠ لە ژیاندا بوە شاعیرێکی بنەماڵەی ئەو ـ واتە «دەروێش نەورۆز»، زۆر جاران خۆی بە «دوایین سەگی ماڵی خامۆشی» ناو دەبرد و ئەویش تا ساڵی ١٨٧٥ لە ژیاندا بوو[٢٦٥].

شاعیرێکی گەلێک ناسراو، «تەیموور قولی» کوڕی «رەزاعەلی» ـ لاوێکی گۆرانی لە [گوندی] «بان ـ یاران» (نزیک باوە یادگار) بوو. تەیموور، کاری خۆی بە پشتیوانی «سەید براکە» دەست پێ کرد بەڵام زۆر زوو خۆی وەک تەجەسسومی «خوداوەندی» راگەیاند و مەسەلەکەی بوە هۆی ئاڵۆزیی لە ناوچەی کرماشاندا، ئینجا حاکم لە ساڵی ١٢٦٨ (١٨٢٢)دا، کوشتی[٢٦٦]. ئەو مرۆڤە خەیاڵپەروەرە دیوانێکی تەواوی شیعری هەیە[٢٦٧].

زوو، دوای مردنی تەیموور، لاوێکی دیکە ـ واتە صەیفوور (یا «فەتاح»)، دەعایەی تەجەسسومی کرد. ئەم تەیمووری دووهەمەش دەگوترێ دیوانێکی هەبێت[٢٦٨].

دارشتنی «کەلام» ە ئایینیەکان لە شێوەی دارشتنی چیرۆکە شیعر یا شیعری لیریک



جیاواز نییە[٢٦٩]. هەوڵدانێک کە بۆ لاسایی کردنەوەی غەزەل و قافیە لە هەموو شیعرەکەدا، خۆ دەنوێنێ و بە گشتی شیعرەکان لە کۆتاییدا دەشکێن بەڵام زۆر جار کەلامەکان بە گوێرەی بەند رێک و پێک کراون کە دوای هەرکامیان سەربەندێک دووپات دەبێتەوە. کەلام دەبێ بە ئاواز بگوترێ و «ساز»یا «تار» (تەمورە) یەک هاوڕێ یی بکات. بڕوانە یادداشتەکان [ی مینۆرسکی]، ل ١١٤ ـ ١١٣. پێویستە بگوترێ ئەهلی حەق، بابا طاهیر [ی هەمەدانی] بە پیاوچاکی گەلێک ناوداری خۆیان دەزانن[٢٧٠].

سێزدە چوارەینەی بابا طاهیر (یا بە هی ئەو زانراو)، کەوتۆتە دەقی دەستنووسی سەرەنجامەکەی منەوە و ٣١ چوارینەشی لە سەرەتای کۆمەڵەی ئەو کەلامانەدا نووسراون وا دۆستانی ئەهلی حەقم بۆیان ناردووم. هیچ گومانێک لەوەدا نییە زمانی عادەتی بابا طاهیر، روخساری «گۆرانی» تێدا نییە[٢٧١] و «بەحر» ەکەشی (واتە «هەزەج») لە سوننەتی شیعری عامیانەی فارسی (نەک گۆرانی) دا دەگونجێت.

وەک بەرهەمێکی تازەی سەرنج راکێش، دەبێ شاکارەکەی دکتۆر سەعید خانیش بخەمە پێش چاو. ناوبراو کتێبێکی گرنگی چاپ کردوە و تێیدا بە شیعری گۆرانی، بیروبڕوای مەسیحیەتی شی کردۆتەوە[٢٧٢]. جێگەی سەرنج کەڵک وەرگرتن لە شێوەی گۆرانی [بۆ نووسینی کتێبەکە]یە، کە بۆ نزیک بوونەوەیەکی متمانە پێ کراو لە دڵی هاوولاتییانی نووسەر ـ واتە کورداندا، هەڵی بژاردوە. دکتۆر سەعیدخان دەڵێ: «هەوڵم داوە بە زمانی سوڵتان و پیر و شێوازی «دەفتەر» ە تازەکان یا خود یاساکان پەیامم رابگەیێنم» (کذا)[٢٧٣].

## ٥. شین گێڕیی ئەحمەدبەگی کۆماسی

لە ساڵی ١٩١٧دا دکتۆر سەعید خانی کوردستانی برادەرم، دەقی «شین گێڕی»یەکی بۆ ناردم کە «ئەحمەدبەگی کۆماسی»[٢٧٤] بە بۆنەی مردنی ژنەکەیەوە گوتوویەتی. دەقە ئەسڵیەکە، بە پیتی عەرەبی نووسرا بوو، بەڵام دکتۆر سەعیدخان [بە شێوەی لاتینی] بۆی نووسیبوومەوە و شوێنە رەق و ئەستەمەکانی بۆ واتا کردبوومەوە.

دکتۆر سەعیدخان، لە بنەماڵەیەکی کوردی موسڵمانی مەلادا لە دایک بوە، لە ساڵانی سەرەتای ژیانیدا بڕوای بە ئایینی مەسیحیەت هێناوە و لە گەلێک رووداو و گۆڕانکاری

ژیانی دا، بە قورس و قایمی لەسەر بڕوای خۆی وەستاوە، هەمیشەش بەوپەڕی بەینەتدارییەوە لەگەڵ خەڵکەکەیدا ماوەتەوە و بە تەواوی لەگەڵ ژیان و زمان و نەریتە کوردییەکاندا تێکەڵاوە. ئێمە بۆ پارێزرانی نووسراوە یۆنانیەکەی سەر پێستی ئاسک لە هەورامان، قەرزداری شەوق و زەوقی ڕۆشنبیرانەی ئەوین[٢٧٥].

زمانی ناوچەیی دکتۆر سەعید خان، کوردیی سنە (ئەردەڵان)ە[٢٧٦] بەڵام بە شارەزاییەکی ئەوتۆوە گۆرانی ئەسڵی (کۆینە) دەزانێت کە ئەو نامیلکە شیعرەی وا باسی لێوە کرا بەهەمان شێوە هۆندۆتەوە. گۆرانی ئەسڵی وەک زمانی ئەدەبی، لە دیوەخانی والیانی پشتاوپشتی ئەردەڵاندا پەرەی سەند. ئێمە دەبێ وای دابنێین کە ئەحمەد بەگی کۆماسی، خۆی ویستوویەتی شیعرەکەی بە گۆرانی ئەسڵی (کۆینە) بخوێنرێتەوە، هەربۆیەش ئەستەمە کاری خوێندنەوە و تەرجەمەی لەو رادەیەی وا دکتۆر سەعیدخان کردوویەتی زیاتر بەرەو پێش ببرێت. ئەگەر پێویست بێت، دەبێ ڕۆژێک ڕێنووسێکی فۆنیتیکی لەنێو کۆماسییەکاندا پێک بێت.

وا ئێمە وەک دەسکەوتێکی ئەدەبی، سەرنج دەدەینە شین گێڕییەکە و بۆ ئەو ئامانجەش وردەکاریی حونجە کردنی یەک بەیەک [ی وشەکان] دەکەوێتە قۆناغی دووهەمەوە. هیچ زانیاریەکی ورد لە مەڕ دانەری «شین گێڕی»یەکە بەدەستەوە نییە ئەوەندە نەبێت لە هۆزی کۆماسییە[٢٧٧]. ناوچەی «کوڕەوەز»[٢٧٨] کە کۆماسییەکانی لێ دامەزراون، ٢٠ گوند و ٢٥٠٠ کەس دانیشتووی هەیە[٢٧٩].

شوێنی ژیانی کۆماسیەکان، کەوتۆتە ناوچەی سنە (لە زاراوەی ڕەسمیدا، پێی دەڵێن «کوردستان») لە سەر ڕێگەی سنە بۆ مەریوان و لای چەپی سەرچاوەی چۆمی هەورامانی تەخت. مەڵبەندەکە گەلێک ؟ ـە[٢٨٠] و ناتوانین وای دابنێین کە ئێستا لەو شوێنەدا بە زاراوەی گۆرانی قسە دەکرێ[٢٨١]. وێچووتر ئەوەیە بڵێین ئەحمەد بەگ بۆ راگەیاندنی خەم و خەفەتی خۆی، ڕێبازی عادەتی شاعیرانی ئەردەڵانی گرتۆتە بەر.

شین گێڕییەکە، لەگەڵ تازە بوون و دوور کەوتنە لە نەریتیش، هەندێ یاسای جێگرتووی شیعری تێدا بەرچاو دەکەوێ. لەفۆرمی ڕواڵەتیدا، شوێنی یاساکانی شیعری گۆرانی هەڵگرتوە، هەر فەردەی دوو میسراعی هاو قافیەی هەن، هەرکام لە ١٠ بڕگەکانی بە هۆی وەستانێکەوە دەبن بە دووبەشی پێنج بڕگەیی ییەوە. شیعرەکە بێ ئەوەی درێژایی [ژمارەی فەردەکانی] بگیرێتە پێش چاو، بە ئاشکرا بڕگەییە[٢٨٢].



میسراعی یەکەمی شیعرەکان ناتەواوە و تەنیا بەشی دووهەمی میسراعەکەی تێدا دەنووسرێ ئەویش بۆ ئەوەی قافیە یا خود بابەتەکە رابگەیەنێت. ئەم شێوازە لە هەموو شیعرێکی گۆرانیدا (چیرۆکە شیعر، لیریک و ئایینی)، دیاردەیەکی گشتیە.

شێوەی دارشتنی شیعرەکە روونە: ئەحمەد بەگ، سەری گلکۆی هاوسەرەکەی دەدات (فەردی ١ تا ٣) و لەوێ خەم و پەژارەی خۆی دەردەبڕێ (٤ تا ١٩). شاعیر گەڵێک نیگەرانی دڵدارەکەیەتی کە لە ناو تاریکی و سەرما دا، خەوی لێ کەوتوە (٢٠ تا ٤٠) و قژ و چاوە ئاسکەکانی وەبیر دێنێتەوە.

بۆچی بەجێی هێشت (٢٥ تا ٣٢)؟ بێدەنگی. بۆچی وەڵام ناداتەوە؟ وا هەیە خۆشەویستی ئەوی لە دڵدا نەمابێت (٣٣ تا ٣٩). ئینجا دەنگێک دێتە گوێی: قەبر ئیجازە بە بەندییەکەی خۆی نادات وەڵام بداتەوە، گریانی عاشق هیچ سوودێک بۆ ئەو چارەنووسە نابەخشێت (٤٠ تا ٤٩). هەڵاتن لە کار دا نییە، عاشق شوێنی خۆی لە لای دڵدار دا دەگرێتەوە (٥٠ تا ٥٢)، ئەوە دەگونجێت، بەڵام ئەحمەد هەتا کاتی مردن تازیەی ژیکەلانەکەی خۆی دەگرێت (٥٣).

زۆر ئیماژی ئەم «شین گێری»یە لە زەخیرەی [ئەدەبی] عەرەبی وەرگیراوە. ناوی هاوسەرە کۆچ کردووەکەی ـ لەیلا، کردەوەی «مەجنوون» لە لایەن شاعیری ئازیەتبارەوە وەبیر دێنێتەوە. [شاعیر] لە گەڵ ئاگری جودایی دا ـ وەک قەقنەس (* قەقنووس) دەسووتێ[٢٨٣]. شاعیر، دڵدارەکەی خۆی بە دارە «سەرو» یێک دەشوبهێنێ کە بە ڕێگادا دەڕوات و هتد...[٢٨٤] بەڵام شاعیر جیا لە رازاندنەوەی ڕواڵەتی شیعرەکە، لە چوار چێوەی شیعری گۆرانیدا بە سەربەستی دەجووڵێتەوە.

روانینە مەرگ، تەنانەت لە ناو شاعیرانی کلاسیکی ئێرانیشدا، زنجیری نەریت شل دەکاتەوە. بابەتەکە، بایەخی توێژینەوەیەکی تایبەتی هەیە بەڵام هەر ئەوەندە بەسە کە هەندێ نموونەی ناسراو بخەینە بەرچاو بۆ ئەوەی ئەسڵییەتی شاعیری مام ناونجی واتە کۆماسی دیاری بکەین:

فیردەوسی[٢٨٥] لەو شیعرانەدا وا پێشکەش بە کوڕەکەی کراوە، بە بیرێکی قووڵترەوە بیر لە کوڕەکەی دەکاتەوە و وای دادەنێ کە گەیشتبێتە رووناکی و لەوێ شوێنێک بۆ باوکی ئامادە بکات. فیردەوسی لە چیرۆکە شیعرە مەند و بەویقارەکەیدا، لە خودا

دەپارێتەوە لە تاوانی لاوان ببوورێت و کەوای عەقڵیان لە بەر بکات.

خاقانی[٢٨٦]، کوڕی دایکێکی مەسیحی، سێ شیعری خۆی پێشکەش بە ژنە کوچ کردووەکەی دەکات. یەکیان دوور و درێژ و سارده بەڵام دوانەکەی تر، ساکار و شوێن دانەرن. شاعیر بۆ ئەوەی ڕۆژانی سەرەمەرگی ژنەکەی درێژ بکاتەوە، دەڵێ: "ڕۆژانی عومری من، با قورسایی یا دی تۆیان لە سەر بێت. لێم گەڕێ با بە توندی بیر لە نیگەرانی و خەم نەکەمەوە". لە شیعرێکی دیکەدا، تازیەی " یارە وەفادارەکەی (وەفا پەروەرد یار) دەگرێت، کە پارێزەری بیرە نهێنیەکانی ئەوە. ژین نامە نووسی شاعیر ڕاست دەکات کاتێ کە دەڵێ:[٢٨٧] ئازار، کارێکی وا دەکات کە هۆشیاریی لەبر بچێتەوە. "ئێمە ناتوانین ئەم شتانە سەبارەت بە شیعرێکی دیکەی خاقانی لە مەرِ مردنی کوڕەکەی بلێین. [لێرەدا] هیچ شتێک خەفەتبارتر لە ناتەبایی نێوان بێ هیوایی راستەقینە کە لە دەروونندا دەخولقێ و زەحمەتی خو بەزل زانی نییە کە ئەو هەستە دەپیاڵێوێ.

ئازیەتباریی «ئەمیر خوسرەوی دیهلەوی»[٢٨٨] بۆ دایکی، بە هۆی سروشتی بوونی مەسەلەکەوە هێمن و لە سەر خۆترە. خەفەتی [شاعیر] بە هۆی «تەسلیم و ڕەزا» وە کەم دەبێتەوە، سەرکۆتە کردنی چارەنووس شتێکی ناسیاوە و [شیعرەکە] گەلێک فەصیح و رەوانە[٢٨٩].

چواربنەیەکی حافظ[٢٩٠]، کە شیعری «بەهارییە» و «شین و گێڕی»یە نموونەیەکی بێ هاوتایە لە ئامێتە کردنی هەستی قووڵ و هونەری بەرز. زۆر سروشتییە کە مامۆستای پێشووی من ف. ی. کۆرش[٢٩١] (١٩١٥ ـ ١٨٤٣) هەوڵی دابێت شیعرەکە وەربگێڕێتە سەر شیعری یۆنانی[٢٩٢].

دوای ئەم نموونانە هاسانتر دەبێت ئەگەر «شین گێڕی»یە ساکارەکەی زاگرۆس هەڵسەنگێنین. هەستی شاعیر، ساکار بەڵام بە هێزن و هیچ دیاردەیەکی دەستکردی صۆفیایەتی و ئایینی، لێڵیان ناکات. ئەحمەد بەگ ـ لە گۆێن کافرێک کە لە پەیوەندی راستەوخۆی سروشتدا بژی، هەست بە سەرما و سۆڵی «کۆچی بێ گەڕانەوەی» لەیلا دەکات.

بێهوودەیە پاڵ بە دەروازەی ناچارییەوە بنێین، بەڵام ئازاری ون کردن و لە دەست دان، کە شاعیر بە ریئالیسمی پیاوێکی ئازاوە وەک برینێک باسی لێوە دەکات، دەیسووتێنێ و



شیعرەکە بە هاواری مل دانەنواندن و دەست هەڵنەگرتنەوە کۆتایی پێ دێت.

شیعرەکە لە هەموو کوردستاندا خۆشەویستە. «بێنی دیکت سێن»[٢٩٣] سێ فەردی سەرەتای [شیعرەکەی] لە هەوارامان نووسیوەتەوە. ریوایەتێکی سەرو گوێ شکاوی شیعرەکە، لە کەشکۆڵە شیعرێکی کوردی ـ چاپی ئەستەمۆل دا بڵاوبۆتەوە[٢٩٤].

سەرجەمی دەقی شیعرەکە، لە تاران و لە لایەن «دکتۆر سەعیدخان»ـەوە، چاپی بەردین کراوە و نیشانەگەلێکی تایبەت بۆ /ل/ و /ی/ ی تایبەتی پشتەوەی زمانی دانراوە (لام بە قولاپێکەوە)؛ هەروەهایە بۆ / ر/ ی بە هێز (واتە /ر/ ی بەتەشدیدەوە).

نموونەکەی پاشکۆی ئەم وتارە [دەقی ئینگلیزی]، لە بەر نووسخەی دەستنووسی ئەو، رەسمی لێ هەڵگیراوە:

گلکۆی تازەی لەیل[٢٩٥]

ئارۆ، شیم وەسەیر گڵکۆی تازەی لەیل
نە پایەی مەزار ئەو لەیل پڕ مەیل
جە[١] دیدەم وارا ئەسرینان چون سەیل
شیم وەسەرینش وە دڵەی پڕ جۆش
سەنگ مەزارش گرتم وە باوەش[٢]
واتم ئەی دڵسۆز قەیس لونگ وەکۆڵ!
مبارەکت بۆ یانەی بەیدی[٣] چۆڵ
٥ سەر هوردار نەخاک، سەوڵ خەرامان!
من مەجنوون تۆم، وەی تەورپێم ئامان
کۆچ بێ وادەت کاری پێم کەردەن
بێزارم جەگیان، رازیم وە مەردەن
گڕەی نار عەشق دووری باڵای تۆ
کارێ پێم کەردەن نەونەمام نۆ!
وەختەن چون قەقنەس ببوون[٤] وەزوخاڵ
شاد بۆ بەگەردەم، زەڵان یا[٥] شەماڵ
یاهو بەوێنەی قەیس لونگ وەکۆڵ[٦]

تەن بوو[٧] وەخۆراک وەحشیان چۆڵ
سەوگەند بەو خاڵان فەیرووزەی خۆشرەنگ [٨]
بەو دەستەی زوڵفان پەشێویای پای سەنگ
جەوساوە گەردش٩١ چەرخ پڕ ستەم
من و تۆ وەجەور[٩]، جیا کەرد جەهەم،
تۆ بەردەن وەخاک سیای تەنگ تار[١٠]
من مام پەی ئازار[١١] جەفای رۆزگار
هەر رۆ چۆن مەجنوون، خاتر جەغەم کەیل
هەر لەیل لەیلمەن جەهەردەی دوجەیل
خەمان، پەژاران، رەفیق رامەن
چەنیو[١٢] جەفاو جەوردایم سەودامەن
سپای خەم بەی تەور هجووم ئاوەردەن
قافلەی فامم بە[١٣] تاراج بەردەن
زامەتان سەخت، ئەی دڵەی پڕ ئێش[١٤]
چون جای ماران گاز، زووخاو مەیۆ[١٥] لێش
شەو کەیلەن زووخاو[١٦] وەلای جێمدا[١٧] [جێمەدا]
کافر بەزەییش مەیۆ پێمدا[١٨] [پێمەدا]
یانەم وێرانەن، دەردم دیویان[١٩]
چون ئاهۆی تەنیا [٢٠]، سەر لێم شێویان[٢١]
شەوان زاری و شین، روان رۆرۆمەن
یەکجار وەسواسەی تەنیایی تۆمەن
حاڵ تۆ چێشەن[٢٢] شای وەفاداران!
کیەن هامرازت[٢٣] سەباو ئێواران
نەو سەرای تاریک پڕ خەوف و خەتەر
مەدارات چوونەن لەیل ناز پەروەر[٢٤]!
چ تەور مەویاری، چونەن قەرارت



کییەن هاورەفیق لەیل و نەهارت؟[٢٥]
نەسەردی هەوای سەرد سیاسەنگ
چ تەورەن خاڵان فیرووزەی وەشرەنگ[٢٦]؟
جەباتی با هووی قەیس خەمینت[٢٧]
کام سەنگ سیا هان جە باڵینت[٢٨]؟
داخم ئۆو[٢٩] داخەن لەیلی خاتر تەنگ
ئۆو[٣٠] دەسسەی زلڤان پەشیوێویای پای سەنگ[٣١]
وەچەنگ[٣٢] چل چەنگ تۆ تاتات[٣٣] مەکەرد
ئیسە پەشیوان[٣٤] چون[٣٥] رەیحان هەرد
ئۆو دیدەی مەخموور ئاهو بێز تۆ
ئۆو قەیس [گیس؟] قەتران شەرِ ئەنگێز تۆ[٣٦]
ئیسە نەگەردش چەرخ نیلی رەنگ
بێ رەونەق بییەن چون نەقش رووی سەنگ

ساپەی چێش سۆمای دیدەم تارمەبۆ؟
زندەگی جەلام[٣٨] ژار مار نەبۆ
تۆ خەریک قەبر سیای سەردەنی
تەمام حەسرەتان نەدڵ[٣٩] بەردەنی[٤٠]
من تەنیا چون قەیس، لێوەی خەم خەڵات
زندە مەگێڵوون نەرووی سەربیسات.
وەلحاسڵ هەر چەند شین و زاریم کەرد
نەپای قەبر لەیل، بێ قەراریم کەرد،
نە جوا[٤١] داپێم، نەزەرڕەی دەنگ کەرد
یەکجار بلێسەم نەگەردوون و یەرد
دیسان هەم جەنۆ، واتم: «ئەی دڵسۆز
حەکیم دەرمان دەرد مەجنوون دۆز[٤٢]
یە پەی چێش مەیلم جەلات سەردبیەن؟

مەرعەهد وەرین[٤٣] جەیادت شیەن؟
من وەی دڵەی خار[٤٤]، بێ قەرارەوە
وەی جامەی سیای یەخەپارەوە
هام نەسەرینت، زارزارمە ناڵوو[٤٥]
خاک یانەی نۆت وە چەم مەماڵوو
تۆ هیچ نیت وە قەید بێ قەراریی من
جە ئەلوەدای سەخت[٤٦]، شین و زاری من
نمەدەی جواو، نوختەی خاڵ بێگەرد!
مەعلوومەن جەلات مەیلم بیەن سەرد
دیم سەدایێ نەرم جە تۆی خاکەوە
جەویانەی تازەی هەسرەتناکەوە[٤٧]
ئاماوە[٤٨] گۆشم چون هەردەجاران
واتش[٤٩]: «هەی مەجنوون، وێڵ کۆساران!
سۆوگەند[٥٠] بەواحید[٥١]، فەرد بێ هەمتا
بێ وادە کەردەن[٥٢] من جەتۆ جیا
رای جواو نییەن، دڵ بێ قەرارەن
فرەیک[٥٣] سەنگ و خاک وە جەستەم بارەن
جە تەئسیر خاک هەوای سەرد سەنگ
رای جواو نییەن، چەنیت کەروو دەنگ[٥٤]
خان خاک بۆو تەور مەهبووسم کەردەن
نازاران وێم جەیادم بەردەن
بەڵێ هەرچەند شین زاری مەکەری
هەرچەند سەر وەسەنگ سیامەدەری[٥٥]
فایئدەش نیەن سوود نەدارۆ پێت
بشۆ زاری کەر پەرێ بەخت وێت[٥٦]
پەی چێش ئەی دنیا خەیلێ بێ وەفان



جەتەنخوای وەفاش دایم هەر جەفان[٥٧]
کەس جەقەیی دام مەکرش نەرەستەن
یەک یەک وەزەنجیر عەییاران بەستەن[٥٨]
جە ئەووەڵ دنیا تاوەرۆی مەحشەر
هیچکەس جەدامش بەرنەشین وەبەر[٥٩]
هەر کەس دیت شاد[٦٠] بۆ وەی[٦١] دنیای بێ پۆ
ئاخیر سەرەنجام رەنجەرۆ مەبۆ[٦٢]
هەرچەند پەرێومن تۆ ئەلوەداتەن،
ئاخیر سەرەنجام ئەی جاگە، جاتەن[٦٣]
«ئەحمەد» پەریو[٦٤] کۆچ شای جەمین جامان
رەستاخیز کەرۆ تامەرگ سامان[٦٥]

ئەوەش تەرجەمەی [شیعرەکە] بە ئامانجی ئەوەی هەموو وشەیەکی دەقەکە [بۆ خوێنەر] هاسان بکاتەوە.

[لێرەدا، مینۆرسکی تەرجەمەی ئینگلیزی هەموو شیعرەکەی ـ فەرد بەفەرد، خستۆتە بەردەست، بەڵام پێویست نەبوو سەرلەنوێ بیکەمەوە کوردی! وەرگێڕ].

## پاشکۆ

سەبارەت بە لاپەڕە ٧٩ (خاڵی ت) [دەقی ئینگلیزی]، دکتۆر و. هێنینگ (W. Hen-ning)، سەرنجی بەرەو مارکوارت راکێشام:

A Catalogue of the Provincial Capitals of Earnshahr, 1931, p. 31

ئەو شوێنەی وا «نۆرشیرەکان» وەک «دەغم»ی * نات ئەرتەشیرەکان ناسێنراوە و گەڕاوەتەوە بۆ [قسەی] طەبەری لە بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٨٢٠ و «ئیبن خوردادبیە» لە لاپەڕە ١٧دا. ئەوش بۆچوونەکەی من لاواز دەکات: بەڵام ئایا بیچمە ساسانییەکەی تەنیا شێوازێک لە «اشتقاق»ی خەڵک خوازانەی عیبارەتێکی کۆن نییە؟

سەبارەت بە لاپەڕە ٨٠، دێڕی ٦، عینوانی «گۆڕانشاه» لەلیستەی سەرنج ڕاکێشی یارانی یارمەتیدەری کەیخوسرەو و دژ بە ئەفراسیابدا، هەیە. بڕوانە: شاهنامە، چاپی Mohl، ٤، ١٦، چاپی تاران ١٣١٤ (١٩٣٥)، بەرگی ٥، ١٢٧٩:

وز و دورتر آرش رزم زن
چو گوران شه، آن گرد لشکر شکن

سەبارەت بە لاپەڕە ٨١، دێڕی ٢٥ [ی ئینگلیزی]، شێوازی ڕاستی خوێندنەوەی، دەبێ مەستەکان بێت. گوندێک بەو ناوە لە برادۆست (باشووری ڕۆژئاوای ورمێ) هەیە.

سەبارەت بە لاپەڕە٨٤، «ڕاوست» وا هەیە لە شێوەی * ڕوستا بە واتای «گوند» دا ساغ بکرێتەوە. [دوو بیچمی «ڕۆست» و «حەسار ڕۆست»یش باش وایە بگیرێنە بەرچاو. وەرگێڕ].



## پەراوێزەکانی وتاری گۆران

* [ئەم وتارە لە «گۆڤاری قوتابخانەی توێژینەوە ڕۆژهەلاتی و ئەفریقییەکان» وەرگیراوە و وەرگەڕاوەتە سەر کوردی:

V. Minorsky, The Gûran, B.S.O.A.S, Vol.XI, 1943-46, pp. 75-103

بەدرێژایی هەموو وتارەکە، مینۆرسکی، ناوی گۆرانی وەک «گووران» (Gûran) واتە بە شێوازە فارسیەکەی نووسیوە بەلام من هێناومەتە سەر بیچمی ئاسایی کوردیی (Goran) و ئەگەر لە شێوەیەکی دیکەمدا نووسیبێت، ئاماژەم پێ کردوە.

1. Daylamites

2. Tabaristan

3. Suristan

٤. بەروالەت شەرەفخان لە ژێر ناوی «کەلهور» دا، هەموو کوردانی باشووری ڕۆژهەلاتی کرماشان (و سنە؟) دەبینێت. هەرچۆنێک بێت، پێویستە جیاوازیی نێوان هۆز و سەرەک هۆزەکان لە بەرچاو دوور نەخەینەوە.

٥. بڕوانە: مینۆرسکی، «لوڕ»، لە ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلامدا.

6. J.Cl. Rich

7. Warriors

٨. بڕوانە: مینۆرسکی «کورد»، لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلامدا.

9. Sirwân (Diyâla)

10. Awarâman-i luhûn

11. Takht

١٢. Kandûla [مینۆرسکی لە بیچمی «کەندوولە»یدا نووسیوە].

13. Baniyân

14. Gâmâsiâb

15. basin

16. Khosar

١٧. [باجەلان] لە ناوچەکەدا بە «باجووران» (Bâjûrân) دەناسرێن و بەڕواڵەت ئەهلی حەقن. قەشە ئاناستاز (Father Anastase)، بە «ئەڵلاهی» Allahi ناویان دەبات و باسی هەندێ داب و

نەریتیان دەکات (المشرق، ١٩٠٢، لل ٥٧٧ تا ٥٨٢). دۆڵی خوسەر، مەرکەزی ئایینی جیاوازە. بڕوانە مینۆرسکی، «شەبەک» (Shabak)، لە ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلامدا.

١٨. [مینۆرسکی لە شێوەی «زوهاب» Zuhab یدا نووسیوە].

91. Zaza [Dimli]

٢٠. ئێستا بڕوانە:

Mann - Hadank, "Mundarten der Guran", 1930, pp. 17-43 and " Mundarten der Zaza, 1932, pp. 6-7

ئەو نەقشەیەی «هەدەنک» وا لەگەڵ کتێبەکەیدایە.

21. Zarda

٢٢. کورت کراوەکەی لە «تکملە»ی ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلامدا هاتوە [وەرگێڕاوی هەمووی دەقەکەش لەم کتێبەدا دەبینرێ. وەرگێڕ].

٢٣. Koine [بریتیە لە زمانێکی یەکگرتوو، کە لە چەند زاراوەی هەمان زمان پێک هاتبێ، بەڵام واهەیە بە تەواوەتی لە ژێر دەستەڵاتی زاراوەی سەرەکی دابێت: ئەنسیکلۆپیدیای بریتانیکا:Koine. وەرگێڕ].

٢٤. [نیازی مینۆرسکی، کتێبی «نزانی؟ مزگانی!» دکتۆر سەعیدخانی کوردستانییە].

25. Société Asiatique

26. Marquart

٢٧. [من «خەڵک خوازانە» م بەرانبەر بە Popular داناوە].

28. M. A Benedictsen

٢٩. [مینۆرسکی بە «ئەحمەد خانی کۆماسی» ناو بردوە].

30. Ethnical name

31.Gôran or Gûran

٣٢. لەو دەقانەدا وا «سالار»ی گۆران بۆی دەخوێندمەوە، ئەم وشانەم دۆزیەوە: کوو < کۆهـ، رووز < ڕۆز، دووسخاهی < دۆست ـ خواهی. دیفتانگی / ئوو / دەنگی / ئۆ / دەدات و ژمارەی ئەو حاڵەتانە، بە هۆی حونجەکردنی /ب/ ـوە زیاتریش دەبێت: سەوز < سەبز، ئەیۆ < ئەدەب [Adab]، بەڵام دەنگی دیفتانگەکە لە /و/ ی درێژ گەلێک جیاوازە. لەلایەکی دیکەوە، شێن گێڕیی ئەحمەد بەگی کۆماسی ـ بەو شێوەیەی دکتۆر سەعیدخان گوتی و من نووسیمەوە، /ێ/ و /ۆ/ ی مەجهوولی پاراستوە.

٣٣. بە گوێرەی قسەی ژابا:



(Jaba, Récits Kurdes, 1860, p.3),

سەد بنەماڵەی گۆران لە «بایەزید» و دەوروبەری دەژیان. هەروەها بڕوانە نەخشەکانی Houss-knecht [کە بە گوێرەی ئەوان]، «قەڵای گۆران» لە هەورامانی لهۆن، هەروەها «گۆران قەڵا» لە باکووری جوانڕۆ، «گۆرانگا(هـ)» لە خاکی «مامەش» کە لقێک لەبڵباسن و «گۆران ئاوا» ش لە «برادۆست»ی ڕۆژئاوای ورمێ، بەرچاو دەکەون. چریکۆڤ (Chiricov, IXIX)، ئاماژە بە «گۆران دەشت» لە بۆتان دەکات.

٣٤. بەرانبەرە ئاساییەکەی /ۆ/، لە کوردیی موکریاندا، /یۆ/ یە، بۆ نموونە:

کۆهـ < کێو، گۆز < گوێز =Kôh> k’üe, gôz> g'üez

35. O. Mann, 'Die Mundart der Mukri Kurden", text, p. 253, Translation, p. 396.

من لە ساڵی ١٩٣٤دا، لە سلێمانی چاوم بە مامۆستایەکی قوتابخانە کەوت کە پێی دەگوترا «گۆران» و خەڵکی مەڵبەندێکی دراوسێ ـ واتە قەرەداغ بوو و بە شێوەزاری کوردیی موکریانیش دەدوا [دەبێ مامۆستا گۆرانی شاعیر بووبێت]. ناوبراو پێی گوتم تەنیا لە نزیک هەڵەبجە (Alabche)، (لە شارەزووری بەشی ڕۆژئاوای هەورامان) هەندێ [خەڵک] هەن، کە بە گۆرانی دەدوێن.

٣٦. هەر چۆنێک بێت، «ریچ» لەم گۆڕەپانەشدا، کاتی باسی کوردی سلێمانی دەکات، ناوی «گۆران» دێنێتە گۆڕێ (بەرگی یەکەم، ل ١٥٢). هەروەها بڕوانە:

ژابا–یوستی، قاموسی کوردی، ل ٣٦٨ [کە لەوێدا دەڵێن]: کوردانی وەرزێڕ خەڵکێکی نیشتەجێن.

٣٧. فەلە

٣٨. بڕوانە:

Socin, "Kurd. Sammlungen", text, p. 174, translation p. 197

داستانی عیسا و کاسەسەر [جمجمە سوڵتان] لە بنەمایەکی ئەدەبییەوە دێت و «فریدالدین عطار» ریوایەتێکی ئەم داستانەمان دەدا بەدەستەوە. بڕوانە:

Zhukovsky, "Jumjuma - Nama", in Zap. VII, 1892, 63 - 72.

39. Gôran < Gabrân

٤٠. لە لایەکی دیکەوە، «نیبور» لە «سەفەری عەرەبستان، ساڵی ١٧٨٠، بەرگی ٢، ل ٣١٥» دا دەڵێ: لەناو هۆزەکانی سنجار «الکابارییە»دا (Al-kâbâriya) پاشماوەیەکی بەهێز لە بیچمەکۆنەکانی ناوی «گۆران» (< گابارە ـ کان) هەرماوە.

٤١. /u/and/o/





٤٢. Gôran

٤٣. بڕوانە:

Qutb-nama, V. 43:

بابا خوشین فارسیسی دیدی، سولّتان سوهاک گویرانینی [واتە: باباخۆشین فارسییەکەی گوت و سولّتان سوهاک گۆرانیەکەی]. تاقمێک شوێن لە نزیک «گەنجە» هەن کە بە دوای وشەی «گویران» (G'ôran) داهاتوون. هەروەها بڕوانە عینوانی وتارێکی هـ. ئەجەریان بە ناوی «گێورانەکان (کذا) و تومەریەکان:

H. Adjarian, "Gyorans (sic) and Tumaris", See Rev. Hist, Rel. January, 1928.

44. old /ô/

٤٥. کۆر [ی کوردی]> کوور (لە فارسی نوێدا). بەڵام لە تورکیدا: کوێر

Kör > kûr, Kör = Blind

46. Cast

47. Keläw - Spee

48. Gooran

بڕوانە:

CL. J. Rich, 'Narative of a Residence in Koordistan, i, 152, cf. 88 - 90

49. Darna, Dartang

٥٠. [«راولینسن»یش وەک ریچ وشەکەی لە شێوەی Gooran دا نووسیوە و بە گوێرەی ئەوەی ریچ کوردستانیش وەک Koordistan دەنووسی، واهەیە وشەکە بتوانین لە بیچمی «گۆران» دا بخوێنینەوە. وەرگێڕ].

٥١. بۆ نموونە: (= کۆچەر، a nomad) یا لە زمانی خەڵکی گورجستان دا، گورجی (= دز). بە پێچەوانە، لە کوردیدا بە ئەرمەنی دەڵێن «فەڵە» (fala).

Jaba - Justi, 294 (< fallah, prym - Socin, p. 64).

٥٢ [واتە Gôran]

٥٣. ریشە ناسین و «اشتقاق»ی «گەبر» (Gebr)، هێشتا جێگەی گومانە.

54. Strabo

55. Theracian Saraparae[بیچمی وشەکە زۆر لە «سەرپەڕین»ی کوردیی ئێستا دەچێت]

[Thera، کە «سانتۆرین»یشی پێ دەگوترێ، باشووری ترین دورگەی تاقمی دورگەکانی «سیکلاد»



لە زەریای «ئێژێ» دایە: ئەنسکلۆپیدیای بریتانیکا].

56. Guranii (Gouranii)

٥٧. مینۆرسکی ئەم رستەیەی ستراب‌ۆنی بە یۆنانیش نووسیوەتەوە.

٥٨.سەبارەت بەوان [واتە گۆرانیی «ستراب‌ۆن»؟] بڕوانە راگەیاندنێکی کورتی:

Weissbach, in Pauli - Wissowa, vii, col. 1945

59. K. Müller

٦٠. بڕوانە:

Marquart, "Woher stammt der Name Kaukasus"

[واتە: بنەچەکی ناوی قەوقاز]،

in Caucasica, Fasc, i, 1 Theil, 1930, 62,

کە تێیدا زۆر بەشی ئەو نووسراوەیە هاتوە:

Diod. xx, 22, 4; Strabo, xi, 2, i; 5, 4;  5, 7- 8; 14, 14; Pliny, iv, 83

هتد... ولەوێدا ناوی Siraci, Seraci پەسند کراوە یاخود دەبێ ساغ بکرێتەوە. من نەمتوانی لە راست کراوەکەی بۆ چوونی مارکوارت (ل ٩١٧ئ) لە چاپی موللیێردا هەڵەیەک بدۆزمەوە.

60. Thrakon (Serakon)

61. Siraci (* Sirak, Shirak)

62. Scythian

٦٣. راستکرنەوەکەی موللێر جێگەی متمانەی زیاترە، لەبەر ئەوەی ستراب‌ۆن ناوی «سەرەپەرئە» بەواتای چەرچی دەبات و ئەوەش نەریتێکی سەکایی بوە.

64. Maeotis

65. Aorsi

٦٦. بڕوانە: Kretschmer, in Pauly - Wissowa, ii, 5, 1927

پێویستە «سیرەکی» لە سیلیک (سیدیکەکان) Silices (Sidices) جیاواز دابنرێن، کە پەیوەندیان بە «سیدەکان» Sidakan ی نێوان شنۆو رەواندزەوە هەبوە. بڕوانە:

Marquart, Südarmenien, index.

67. * Shirnak

68. Sirakini

69. Hyrcania

70. Ochus (Tajan)

71. Kretschmer

72. Paryadres

73. Paryadres{Pontic, AIPS?}

74. Cyrus (kur)

75. Arex

76. Shakaséné (Shakashén)

77. Ganja

78. Sirakéné

٧٩. بڕوانە:

Hübschmann, Die altarm. Ortsnamen, p. 352.

80. Shirak Steppe

81. Kakhetia

82. Alazan

83. Shirak

84. Tair - Siraj

85. Akhurian

86. Arpa - chay

87. Ani

88. Nor - Shirakän

89. Arbela

90. bdeasx

91. Marquart, Südarmenien, 1930, p. *59

92. Adiabéné

٩٣. راولینسن، سەری «سیراگانون»ی بەتلەمیوس، بە سیرگان (Sirgan) ی ڕۆژئاوای «شنۆ» دادەنێت، بەڵام ئەگەر تەنانەت شوێنەکە ناوی خۆی لە «*شیراک» وەرگرتبێت، پێویست ناکات بە نورشیرکانەوە ببەسترێت.

٩٤. بڕوانە:



Justi, Iran, Namenbuch p. 121

(دوای حەمزە، ل ٦١، (چاپی بەرلین، ل ٤٢)؛ لە مجمل التواریخ، چاپی تاران، ١٩٣٩، ل ٣٧یشدا، دووپات کراوەتەوە.

٩٥. [دوخت، دۆت = کەنیشک، کچ]

٩٦. بڕوانە: Justi, op.cit., 121

یوستی ئەم وشەیەی بەبێ هیچ هۆیەک لە شێوەی «بەهرام دوخت» دا نووسیوە.

97. Gouranie

98. <Raoxsni (Ctesias);

Péröz < Gosithris < Gocithra

یۆنانییەکان، زۆرجار، دەنگی ڕەقی /و/ (/o/) دەگۆڕن بۆ نمونە:

<Savor, Sâpûr

99. Küra

100. Ostan "Shad Fayrüz"

101. Hulwân

102. Jqbqr.qa

103. Alvand

١٠٤.هیچ گومانێک لەوەدا نییە کە [ناوی] ئەلوەند، «اشتقاق» یێکی خەڵک خوازانەی [وشەی] «حولوان»ی کۆنە. کورد ئەم چۆمە بە «حەڵەوان» ناودەبەن.

105. Tassuj

106. Fayrüz - Qubâdh

107. Al-Tabal

108. Tamarrâ

109. Irbil

110. Arbela

111. Sawâd

١١٢. لەهەمان کتێب لاپەڕە ٤١دا، تەنانەت شارەزووریش جیا لە حەلوان دانراوە و لە لاپەڕە ٩١دا، «الترهان» (Al-Tirhan) و «دەقووقا» (Daqüqâ) بە دەورو بەری مووسڵ لە قەڵەم دراون کە ئەویش خۆی لە دەرەوەی «سەواد»[ی حەلوان] هوەیە.





113. Qudäma

١١٤. [مینۆرسکی ئەم وشەیەی بە پیتی عەرەبی نووسیوە].

١١٥. ئەم وشەیەش هەر بە پیتی عەرەبی و لە شێوەی «درتنک» دا نووسراوە].

116. *Darnak

117. Dâlahû

118. Al-Jil

١١٩. هەروەها بگەڕێوە پێشتر، ئەو شوێنەی وا لە زمان «نزهەالقلوب»ـەوە باسی کراوە.

120. Jäbâr. qa (var. Käbâr.kâ, * Gâbâr. ka)

121. Jâbåraq

122. Degoeje

١٢٣. [مینۆرسکی ئەم دوو وشەیەشی بە پیتی عەرەبی نووسیوە و واهەیە پێویست بێت هەردووکیان بە «گ» بخوێنینەوە.]

١٢٤. a herd [واتای ئەم وشەیە، بۆچوونی سەرەوەی من دەسەلمێنێ].

125. Gaubara

126. Shadanjan

127. Lazba (luri?)

128. Madanjan

129. Mazdanakan

130. Barisan

١٣٠. Khali (*Jalali < Galali) [گومان کردنی مینۆرسکی لە ناوی هۆزی «خالّی» لە جێی خۆیدا نییە. پاشماوەی ئەو هۆزە لە ناوچەی موکریان ماون و چەند بنەماڵە بەناوی «حەسەن خالّی» لە بۆکان و مەهاباد دەناسرێنەوە. وەرگێڕ].

132. Jabar. qi

١٣٣. [هۆزی «گاوان»] Jawani

134. Mastakan

135. Baz. njan

136. Shuhjan

137. Shad. njan



138. N. sâw. ra

139. Budhikân (*Barzikan?)

140. Jwr. qan

141. Bärisi

142. Mashtakan

143. Jurughan

144. Kikan

145. Majurdan

146. Hadhbâni

١٤٧. [هۆزی جەلالی دانیشتووی ناوچەی «خۆی» و «ماکۆ» ن و بەشێکیان لە کوردستانی باکوور دەژین واتە بۆچوونی مینۆرسکی لەمەڕ تێکەڵاوکردنی جەلالی و گەلالی لە راست ناچێت].

148. Büyids

149. Hasanôya

١٥٠. تجارب الامم : {ئەبوشوجاع}، ٢٨٧، ٢٩٩، ٣٢٧، {ابن محاسن}، ٤٢٩، ٤٤٩ تا ٤٥٤، عتبی، چاپی لاهور، ٢٨٥ (تەرجەمەی فارسی، ل ٣٨٤).

151. IA., Ix, 172

152. IA., Ix, 173

١٥٣. [ئەم ناوە لە دەقی ئینگلیزیدا بە پیتی عەرەبی و بە بێ خاڵ نووسراوە: کوسحد].

154. Käköyid Ala Al-daula

155. IA.IX, 247

156. Bäbuni

157. Ibrähim Yinnâl

١٥٨. بڕوانە: IA.Ix, 448

١٥٩. «مجمل» بە وردبوونەوەیەکی زۆرەوە، «[ملک الشعرا] بەهار» چاپی کردوە، تاران، ٦٢١ / ١٩٣٩) [ساڵی ١٩٣٩ی زاینی بەرانبەرە لەگەڵ ١٣٥٨ی کۆچی مانگی و ١٣١٨ی هەتاوی. مینۆرسکی لە حیساب کردنی ئەم ساڵانەدا دەبێ هەڵەی کردبێت].

١٦٠. کتاب تاجی خەڵکی صابی.

١٦١. [مینۆرسکی ئەم وشەیەی بە عەرەبی نووسیوە].

١٦٢. «كۆ»ی «نـ ـ ەكان» ئێستاش لە زاراوەی گۆرانیدا کەڵکی لێ وەردەگیرێ. بڕوانە:

Mann - Hadank, Mundarten der Güran, 105, 378

١٦٣ تا ١٦٧. [مینۆرسکی ئەم چەند وشەیەی بە پیتی عەرەبی نووسیوە].

168. Küsaj

١٦٩. Küsaj - i hajij ـ زیارەتگەیەکی کۆنی بەناوبانگە. لەهەورامان پێیان گوتم کۆسە بەواتای «بێ ریش»ی فارسی نییە (کە بریتی بێت لە کووسەج و کووسە) من لام وایە ناوەکە پەیوەندی بە «هۆزی کۆسە» وە هەیە کە پێشتر دانیشتووی شارەزوور بوون و پاشماوەیان ئێستا لە نێو «زازا» کاندا بەدی دەکرێ.

170. Züpin

171. Taq-i Girra

172. * Gil - u Gailan

173. Rijab

١٧٤. بڕوانە:

Evliya-chalebi, iv, 377; –

- A. Pinçon, in Sir D. Rose, "Sir Anthony Sherley", p. 148; Sir H. Rawlinson, JRGS, 1839, p.33; Chirikov, "Putervoy Zhurnal", 1849 - 1852, St. Petersburg, 1875, 301 - 5:

کرند ـ بیوەنیژ ـ ڕێژاو: شەرحی سەرچاوەکانی ئەلوەند، واکەتۆتە دۆڵی «ڕێژاو» ەوە بەڵام نزیک بە باکووری «طاقی گیرڕا» (لە «ناوچە»ی ئەودا).

175. Shihab al-Din al-Omari

١٧٦. [مینۆرسکی دەقی ئەو چەند دێرەی «شهاب الدین العمری» بە زمانی فەرەنسی و لە بەر تەرجەمەی «کاترێمێر» نووسیوەتەوە].

بڕوانە: تەرجەمەی کاترێمێر، یادداشت و هەڵبژاردەکان، ١٨٣٨، ١٣، لل ٧ ـ ٥٠٦.

لە دەوروبەری ساڵی ١٢٥٨ی زایینی دا، «حسام الدین عکە» بە نوێنەرایەتی لە لایەن خەلیفەکانەوە «دەرتەنگ»ی بەڕێوە دەبرد. هەر ئەم حسام الدینەی وا «هولاکۆ» [خان]، قەڵای «مۆح» (؟) و «ڕۆدە» (* دەودان؟)ی سەرلەنوێ بۆ دروست کردەوە. بڕوانە: ڕشیدالدین، چاپی کاترێمێر، ل ٢٥٥.

Qual'a Mwh (?) and Rwda (*Daudân?)



١٧٧. مەرکەزی دەرتەنگ واتە ریجاب > ڕێژاو، کەوتۆتە کۆتایی بەری ڕۆژئاوای ئەو دۆڵەوە کە ئەلوەند بەوێدا دەگاتە دەشتی زەهاو.

١٧٨. Darna (* Darnak). بڕوانەتەفسیری من لە سەر «ابن خردادبیه» ١٤، هەمان، ل ٨٠.

179. Dälahü

١٨٠. Zimkan، وا هەیە صەمغان (Samghân) ی بلاذری بێت.

181. Râws

١٨٢. وا هەیە «*دەودان» بێت کە گوندێکە لە پشت دالاهۆ.

١٨٣ تا ١٨٦. [ ئەم وشانە بە پیتی عەرەبی نووسراون و هیچ خاڵێک بۆ دووهەمیان دانەنراوە].

187. Hasanoya

١٨٨. گەلێک گونجاوە کە هۆزی حەسەنویەی «بەرزیکان» لە بنەچەکێکی هاوچەشنی گۆرانەکان بن.

١٨٩. هیچ شتێک بە لێبڕاویی سەبارەت بە بنەڕەت و ناوی کەلهور نازانرێ. سەرۆکەکەیان دەیەوێ بنەچەکیان بگەڕێنێتەوە بۆ «گۆدەرزی»ی کوڕی «گیو» ـ ساتراپی ئەردەشێر[ی ئەشکانی] (شەرەفنامە، ٣١٧). تۆ بڵێی «کەلهوڕ» لە وشەی «* کەڵ خۆر» Kal-xwar بەواتای «کەسێک کە کەڵ دەخوات» وەرنەگیرابێت؟ گوندێکی گرنگ بەناوی «کەڵخۆران» لە باکووری ئەردەبیل [ئازەربایجان] هەیە. بڕوانە: «سلسلەالنسب صفویە»، ل ١٢.

١٩٠. جێگەی سەرسوڕمانە کە نووسراوەکانی ئەهلی حەق چەندە بە ڕێکوپێکی لە گەڵ جوغرافیای باکووری لوڕستاندا یەک دەگرنەوە. بڕوانە: یادداشتەکانی من:

Sur les Ahl-i hagg, pp. 22, 42

بەشێک لە ئیماندارانی ئایینەکە، لەو ناوچەیە (و بە تایبەت لە «دیلفان») بەرچاو دەکەون. گەلێک شتێکی گونجاوە ژمارەیەک لە هۆزە گۆرانە ئەسڵییەکان، زاراوەی خۆیان گۆڕیبێ و کردبێتیانە زاراوەیەکی لوڕی ناوچەی خۆیان.

١٩١. سێر هانری ڕاولینسن، کاتێ لە ساڵی ١٨٣٦دا فەرماندەی تیپی گۆرانەکان بوو، دەرەتانێکی بێ وێنەی بۆ دیراسەکردنی گۆرانەکان دەست کەوت. بڕوانە:

Notes on a march from Zohâb, in JRGS., 1839, ix, 26 - 116

هەروەها من کەڵکم لە یادداشتێکی ڕەسمی هەمان نووسەر [ڕاولینسن] لە سەر سنووری تورک و ئێران وەرگرت (١٨٤٤)

١٩٢. «نەعیما»، ١، ٤٧٤، دەڵێ لە ساڵی ١٦٣٠دا، سەرەک هۆزی باجەلان بە ٤٠،٠٠٠ کوردەوە گەیشتە مووسڵ بۆ ئەوەی لە گەڵ خوسرەو پاشادا بەیعەت بکات. هۆزەکە لە دەشتێکدا دەژیان





کە کەوتبوە سەر ڕێگای بەغدا و شوێنی ژیانی (هاوبەشی) کورد و عەرەب بوو (؟).

193. Oal' - Zanjir

194. Bevanij

١٩٥. بڕوانە: تاریخ نادری ، چاپی ١٢٨٦ی کۆچی. نادر بە باشووریترین ڕێگای «گاو ـ ڕەوان» (Gav-ravan) و بەپشت «تاقی گیڕرا» دا هات کە خورشید ئەفەندی (تەرجەمەی ڕووسی، ل ١٣٥)، ئەو «گاو ـ ڕەوان»ەی بە «قەلعە ـ شاهین» داناوە.

١٩٦. بیرەوەرییەکانی ساڵی ١٨٤٤ی راولینسن.

١٩٧. دەگوترێ ئەم ڕووداوە، پێش ساڵ ٦٦٠ ـ ٦٤٥ ڕوویدا بێت. بڕوانە: ظهیرالدین چاپی Dorn، لل ٣٩، ٤٠، هەروەها بڕوانە:

Justi, Iranisches Namenbuch, 117, 430, 433;

[کتێبی ناوە ئێرانییەکان]

- Rabino, "Les dynasties du Mâzandaran", in J.As., Juillet 1936, p. 438.

198. Gil

199. Gâv - savâr

٢٠٠. ئەوەش، گێڕانەوەیەکی دیکەی داستانەکەیە بۆ سەردەمی زوو. شاهنامە، چاپی Vullers، بەرگی ١، ل ٤١، دەڵێ فەرەیدوون [ئەو شایەی لە جێگەی ئەژدەهاک دانیشت]، بە شیری گای «بەرمایە» (Barmaye) گەورە کرا. لە ڕاستیدا فیردەوسی داستانە سەرەکییەکە دەسووڕێنێ کە تێیدا «بەرمایون» (Barmâyon) حەیوانێکی نێرە، و «ئاسی ـ ڤەنوهی» (Asi-Vanuhi) پەنا دەباتە بەر پێی ئەو. (ئاڤێستا، یەشت، ١٥، ١٧) و فەرەیدوون (فەرەتوون» [ی ئاڤێستا])، تۆز و گەرد وەکۆ دەکات تا دوژمنەکانی خۆی پێ لە ناو بەرێت: [ئاڤێستا]، دینکرت، ٨١٤، ١٧ ـ ١٠. (من بۆ ئاماژەکردن بەو دووسەرچاوەیە، قەرزداری «هـ.و. بەیلی» م H.W. Baily).

٢٠١. لە خوارەوەتری ئەم بەشەی وتارەکە (ژمارە ٥) دا بڕوانە نزیکایەتی جوغرافیایی هەندێ شوێن کە پەیوەندیان بە «*گاوەبارە» وە هەیە لە گەڵ ئەوانەی وا بە دوای «گیلان» دا هاتوون. بۆ دیاری کردنی شوێنی «گاوبارە» ش لە نزیک زەریای خەزەر [قەزوێن]، دەتوانین بەشێکی دیکە لە «نزهة القلوب» بە شاهید بێنینەوە، کە دەڵێ: «محەمود ئاباد» کەوتۆتە دەشتی «گاو بارە» لە لێواری ڕۆژهەڵاتی زەریای خەزەر. ئەم محەمود ئابادە، «غازان خان» لە باشووری زارکی [چۆمی] کوڕ دروستی کرد». لەوەش سەرنج ڕاکێشتر، ئاماژە کردنیەتی بە کووران (*گووران) دەشت» - Kürân (* Gûrân dasht) لەو ڕاپۆرتەی وا لەمەڕ شەڕی ئولجاتیۆ لە گیلان دەیدات (بەهاری ساڵی ٧٠٧، ١٣٠٨ ز.)



دەڵێ: ئیلخان لە «سوڵتانییە» [نزیک زەنجان] ـەوە، بەڕێگای «کووران دەشت» دا گەیشتە لووشان» Laushan (لە شاهرود). لووشان، ناوریانێکی ناسراوی شاهرووده لە سەرەوەتری «مەنجیل» Manjilو کووران دەشت دەبێ کەوتبێتە ڕۆژئاوا یا خود باشووری ئەو شوێنە: بڕوانە:

Ta’rikh- i Uljaytu, Bib., Nat., Sup.pers., 1419, fol. 42

202. [Major E.B. Soane], "To Mesopotamia and Kurdistan in Disguise ", p. 377

203. Bundahishn

204. Padhishkwargar

205. Huzahishnih

206. Viking

٢٠٧. [لاجان، لە نێوان مەهاباد و شنۆ].

من لە «حدودالعالم» دا گریمانێکم سەبارەت بە بنەڕەتی دانیشتوانی ئێرانی «شیروان» و «داغستان» لە ناوچە خەزەرییەکاندا خستە بەرچاو. هەروەها، ویستم چەشنە بنەمایەکی خەزەریی بۆ ناوی «کۆهگێلۆ» ـ ناوچەیەک لە «ئوستانی فارس» بدۆزمەوە: * گێلۆیە، گیل + ئۆیە (+ Gêlôya, Gel* ôya)

208. Pêroz

209. Kavat

٢١٠. بڕوانە:

Hüsing, der Zagros und seine Völker, 1908

٢١١. [ئەشکانی یا پارثیەکان ماوەی نزیک بە ٥٠٠ ساڵ (٢٥٠ پ.ز تا ٢٢٦ ز) لە ئێران حکوومەتیان کرد].

٢١٢. [ساسانیان لە ساڵانی ٢٢٦ تا ٦٥٢ی زایینی دا شاهی ئێران بوون].

٢١٣. ئێمە، لە لاپەڕە ٧٧، یادداشتی دووهەم [ی دەقی ئینگلیزیدا]، باسی هەندێ ناوی شوێنی تەریکمان کرد کە وا هەیە پەیوەندیی ئەوشوێنانە لەگەڵ یەکتر و بڵاوبوونەوەی زیاتری گۆڕانەکان بەرەو ڕۆژئاوا بسەلمێنن.

214. Gavare (Gaväre)

215. Kani - Gilan

216. Gilana

٢١٧. من نازانم ئایا ڕووباری «گواور» (Gûâur)کە دەڕژێتە سیمەرەوە، لە هەمان ئەسڵەوەدێت

یان نا؟ چریکۆڤ، ۲۸۰ ـ ۲۷۸، ئەم ناوەی لە شێوەی «گەڤەرە»دا نووسیوە (Gavara)؟

۲۱۸. ناوی ملەی چیاکان، روخسارێکی گرنگی تۆپۆنیمی پێک دێنن.

219. Harasam

220. Wardalan

221. Milleh Gahwareh

222. Mel, Mil

۲۲۳. پێش ئەوەی باوەڕی ئالۆزی «ئەهلی هەق» پێک بێت، دەبێ پێشینەیەکی لەباری بۆ بڵاو بوونەوە هەبووبێت کە ئەویش گەڕابێتەوە بۆ رابردوویەکی دوور.

224. Garrabân

225. Dilfân

۲۲۶. مالیان لە دەشتی «خاوە»یە (Khava) کە کەوتۆتە بەری رۆژئاوای «ئەلشتەر» (Alishtar). تیرەکانیشیان بریتین لە: کاکەوەند، ئیتی وەند (Itivand)، مووەمی وەند (Mümivand) و ....

227. O. Mann, "Die Mundarten der Lur-stamme, p. 23

بەڵام بە بێ هیچ دەقێکی روونکەرەوە [لەمەڕ مەسەلەکە].

۲۲۸. ناوی هەندێ نائاسایی «دلفان» واهەیە پەیوەندی بە لووتکەی گرنگی گێلان ـ واتە «دولفەک» (دەڵفەک، دەرفەک) ەوە هەبێت. وەک Tomaschekیش ئاماژەی بۆ کردوە، واهەیە «دۆلفەک»، رەنگدانەوەی ناوی کێس دری بی بێ کە بە گوێرەی قسەی بەتلەمیووس (٦، ٢٥)، لە دراوسێیەتی «کەدۆسیۆی» (Kadusioi) و «گەلەی» (Gelai) بە رواڵەت لە بەری رۆژهەڵاتی زارکی «ئەمەردۆس» (سفیدرود) [= سیروان]دا، ژیاوە.

لە لایەکی دیکەوە، هۆزی سەرەکی «کەلاردەشت» واتە «خۆجەوەند»، تیرەیەک لە کوردانی گەرووسە، کە «ئاغا محمد شاه» [ئاغا محمد خانی قاجار، لە نێوان ساڵانی ۱۷۷۹ و ۱۷۹۷ دا، حکومەتی ئێرانی بە دەست بوە]، رایگوێستوونەتە ئەو شوێنە. گومانی ئەوە دەکرێ کە ئایینی ئەهلی هەق لە نێو گەڕووسیەکاندا بڵاوبووبێتەوە و ئاغا سام خۆی وا هەیە کەلکی لەو بارودۆخە وەرگرتبێت.

229. Mann, Mundarten, d. Güran, 52, Mundarten der zaza, 24

230. Die Tajik Mundarten der Provinz Fars, 1909, p. 23:

«زاراوەی تاجیکی ئوستانی فارس». ئەو دوانەی دوایی لەگەڵ کوردیدا بە هەڵە وەرگیراون. ناوەڕۆکی زاراوەکە لە پەیوەندی ناوچەکە دایە و خەسڵەتی ناوەندیی هەیە.






۲۳۱. بڕوانە تازەترین توێژینەوەی هـ.و بەیلی (H.W. Baily) لە ئەنسیکۆپیدیای ئیسلام، باسی Persia دا.

۲۳۲. تەنیا ژمارەیەک ناوی ئاسایی کەسان نەبێت، هەورەها دوو وشەی «لەوک» (lauk) بە واتای «باش، خاس» و «ئوشتولوم» (Ushtulum) بەواتای نەعرەتەی کاتی شەڕوگەڕ». بڕوانە:

Minorsky, La domiantion des dailamites, p. 22

233. Gürani Carrin, Benedkicten - Christensen, p. 122

234. Minorsky, Materiaux, 12, 51.

تەنیا ماوەیەک دوای ئەوەبوو کە توانیم بە یارمەتی وەرگرتن لە کەسێکی «گۆران»، بە سەر شیعرەکاندا بچمەوە.

۲۳۵. لاپەڕە ۲۳ی ئەو دەستنووسەی وا من خاوەنیم. بڕوانە:

Minorsky, "Toumari" in Rev. de l'Histoire des Religions, January 1928, pp. 90 - 105

۲۳٦. لە چوونی سلێمانیمدا لە ساڵی ۱۹۳٤، دەستنووسێکم وەک دیاری پێ درا، کە شەجەرەنامەی شێخانی بەرزەنجەی تێدا بوو و ئەوانیش پەیوەندیان بە سوڵتان سوحاکەوە هەیە. پێیان گوتم کە تەرجەمەیەکی (کذا) کوردی دەستنووسەکەش، پێک هێنراوە.

237. Cl. Rich, R. Taylor

238. Mr. S. Topalian

۲۳۹. [من سەبارەت بەو نوسخەیە، بڕوام وایە «ئەحمەدی کەوکەب» هۆندبێتەوە، بۆ زانیاری لەسەر ئەم نوسخەیە و زۆر دەستنووسێکی دیکەی گۆرانی لە کتێبخانەکانی بریتانیا، بڕوانە:

ئەنوەری سوڵتانی، ۲۱ دەستوونی کوردی یا سەبارەت بە کورد لە کتێبخانەکانی بەریتانیا کتێبفرۆشی ئەرزان، سوێد (ستۆکهۆلم)، ۱۹۹۷. وەرگێڕ].

۲٤۰. [ئەم چیرۆکە، لە گەڵ چیرۆکی پێشتروانە خورشیدی خاوەردا، پێکەوە لە بەرگێک گیراون لە کتێبخانەی بریتانیاش یەک ژمارەیان پێ دراوە. بە بڕوای من لەیلی و مەجنوونەکەش هەر هۆنراوەی ئەحمەدی کەوکەبە. وەرگێڕ].

۲٤۱. [بۆ باسی ئەو کەسانە کە چیرۆکی لەیلی و مەجنوونیان هۆندۆتەوە، بڕوانە هەمان سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە ۲۳۹. وەرگێڕ].

242. Kurd, MSO, Peterm, ii, No. 14

۲٤۳. بڕوانە:

Ehé, Grund, der., Iran, phil., ii. 234

٢٤٤. بەشێک، هەندێک.

٢٤٥. پێشتر، ل ٩٤ی ئینگلیزی.

246. Paris, Bib., Nat., sup. Persan, No. 777.

247. Lockhart

٢٤٨. [شاهزاده محمد عەلی میرزا ـ کوڕی فەتحعلی شاه (والی عراقین)، لە ساڵی ١٢٣٦دا مردوە (= ١٨٢١ ز)

٢٤٩. داستانی «گورگ و ڕێوی» ش لە هەمان بابەتدایە و «بێنی دیکت سێن» لە پاوە نووسیویەتەوە.

٢٥٠. Pastor Roseus بڕوانە:

J. Deny, "La Légende de I'eau des sauterelles", in J.A, April 1933, 323 - 340.

٢٥١. [جەنگنامەی کوللە و ئاینە مەل، هۆنراوەی میرزا ئولقادر(عبدالقادری پاوەیی) یە کە بە گوێرەی سەرچاوەیەک، لە ساڵی ١٢٦٦ ک (٥٠ ـ ١٨٤٩ ز)دا، لە پاوە لە دایک بوە و لە ساڵی ١٣٢٨ (١٩١٠ ز) لە هەمان شوێن کوچی دوایی کردوە. دیوانی شیعرەکانی میرزا ئولقادر چاپ بوە و شیعری کوللە و ئاینەمەل، لاپەڕە ١٠٦ تا ١٤٦ی دیوانەکەی داگرتوە. بڕوانە:

محمد امین هەورامانی، «میرزائولقادر»، کۆری زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد، بەغدا، ١٩٨٤. هەورامانی بۆ چاپی شیعرەکە کەڵکی لە ڕۆژنامەی «ڕۆژی کوردستان» ژمارە ١٤٨، ١٤٩ وەرگرتووە و نووسیویە: شیعرەکە "وەختی خۆی لە لایەن د. محمد صدیق مفتی زادە وەرێک و پێک کراوە". هیوادارم کەس و کاری خوالێخۆشبوو د. موفتی زادە بەرهەمە ئەدەبی و مێژووییەکانی بخەنە بەر دەستی خوێنەری کورد. هەروەها چاپێکی دیکەی دیوانی میرزا ئولقادر لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بڵاوکراوەتەوە. وەرگێڕ]

٢٥٢. هەمان دەستنووس، ئەلف و بێ یەکی کوردی (واتە گۆرانی) تێدایە و بریتییە لە ٢٠ فەرد شیعر.

[دەستنووسەکەی مینۆرسکی حەوت پەڕە واتە ١٤ لاپەڕەیە و سەرجەم ٢١٠ فەردە (٢١٠ = ١٥ x ١٤)، لە کاتێکدا نوسخەی چاپکراوی «م هەورامانی» ٢٧٥ فەردە].

٢٥٣. [کەشکۆڵی کتێبخانەی بەریتانیا واتە Or. 6444، ٣٨١ پارچە شیعری ٤١ شاعیری گرتۆتە بەر. مینۆرسکی لێرەدا، تەنیا قسەی مێجەرسۆنی دووپات کردۆتەوە کە گوتوویەتی ژمارەی شاعیرەکان ٢٧ کەسن، لە کاتێکدا هەر خۆی لەم لیستەیەدا ناوی ٢٨ کەسی هێناوە، من دەقی کەشکۆڵەکەم بردۆتە



ژێر چاپ. بۆ زانیاری زیاتر لە سەر شیعرەکان و شاعیرانیان ـ بەتایبەت مەسەلەی مەحزوونی و بێسارانی بڕوانە:

ئەنوەری سوڵتانی، کەشکۆڵە شیعرێکی گۆرانی، بنکەی سۆن بۆ کوردستان، لەندەن، ١٩٩٨]

٢٥٤. [وەک دەبینرێ مینۆرسکی جارێک ناوی مەحزوونی (ژمارە ١) و جارێک ناوی بێسارانی (ژمارە ٢٩) دێنێت. بە بڕوای من ئەو دوو ناوە، هی یەک کەسن و بێسارانی لای کەم لە سەردەمێکی تایبەتی ژیانیدا نازناوی «مەحزونی» بۆ خۆی هەڵبژاردوە و لە شیعرێکدا (ناڵەی دەردەدار بێ ئاخ نمە بۆ)، کەڵکی لەو نازناوە وەرگرتوە. بۆ زانیاری زیاتر لە سەر ئەو مەسەلەیە، بڕوانە سەرچاوەی پێشوو (پەراوێزی ژمارە ٢٥٣).]

٢٥٥. [بۆچوونی مینۆرسکی ڕاست نییە. شێخ مستەفای تەختی لە مەردۆخییەکانە و تەواو جیاوازە لە مەلا مستەفای بێسارانی].

٢٥٦. [ئەو شیعرانەی بە ناوی «سەیدی»یەوە گەیشتوونەتە دەستی ئێمە، بە دوشێوەی هەورامی کۆن و تازەن، هەر ئەوەش بۆتە هۆی باوەڕهێنان بە بوونی دووسەیدی: یەکەم و دووهەم. بڕوانە:بابا مردوخ روحانی، تاریخ مشاهیر کرد، ١، ١٤٧، ٣٧٤.]

٢٥٩. [دیوانی سەیدی دواتر چاپ و بڵاوکراوەتەوە، بە گوێرەی «تاریخ مشاهیرکرد» (پێشتر، ١٤٧)، ئەم دیوانە، لە لایەن «محمد امین کاردۆخی»یەوە لە سلێمانی و لە ساڵی ١٩٧١دا چاپ کراوە. وەرگێڕ].

٢٦٠. [Opocrypha بەو کتێبانە دەگوترێ سەبارەت بە ژیانی عیسا نووسراون و پشتیان بە ڕاستییەکی مێژوویی نەبەستوە].

261. Friedlander, "The heteradoxies of the shi'ites" in JAOS, 1909, vl. 29, pp. 133 -8

262. Wellhausen, Die ... Oppositionsparteien in altem Islam, 1901, pp. 74 - 87

263. Gobineau

264. Tü-Shami

٢٦٥. من کەلامەکانی ئەوم بەدەستەوەن کە بەم شێوەیە دەست پێ دەکەن:

i. یاران! کێ وانان؟

ii. یاران! چەن چەنان!

iii. گرد (؟) گەویزنان

iv. یاران چێش بیبیەن؟





v. یاران! یادگار

vi. یاران! ئاسمان

vii. یاران! چ کارەن؟

viii. یاران ! بارڕام دی

٢٦٦. بڕوانە: Minorsky, Notes, p. 155

Minorsky, Firqan, ii, 157

٢٦٧. نامەیەک لە «سەید نوراللە» وە بۆ دکتۆر سەعیدخان، ٦ی ذی القعدەی ١٣٤٢ [دەهەمی مانگی جونی ١٩٢٤]. یەکێ لە شیعرەکانی [تەیموور قوڵی] لە دەستنووسێکی ئۆسکارمان دابینراوە و من لە «یادداشتەکان»م دا، لل، ٣ ـ ١٧١ ئاماژەم پێ کردوە.

٢٦٨. کەلامێک لە «سەرەنجام»ەکەی مندایە، کە بەم شێوەیە دەست پێ دەکات: "تەیموور ـ ذات ئەستەم = «من کەسایەتی تەیموورم»". واهەیە، شیعرەکە، «صەیفوور» داینا بێت. بڕوانە یادداشتەکانی من:

The Notes, p. 157

٢٦٩. بڕوانە: خوارەوەتر.

٢٧٠. بڕوانە: مینۆرسکی، «باباطاهیر» لەئەنسکلۆپیدیای ئیسلامدا.

٢٧١. [ «زمان»ی شیعرەکانی باباطاهیر تووشی ئاڵ و گۆڕێکی زۆر هاتوە و دەقی زۆر کۆنی شیعرەکانی کە گوایە لە تورکیا دۆزراوەتەوە، گەلێک لەو شیعرانەی وا ئێستا بە ناوی بابا طاهیرەوە دەناسێنرێن جیاوازە. بۆ ئەم باسە، بڕوانە: دکتر ذبیح الله صفا، [تاریخ ادبیات ایران. وەرگێڕ].

٢٧٢. کتاب «نزانی ؟ مزگانی» واتە کتێبی مزگێنی و بەشارەت، ٥١٥ لاپەڕە، زیاد لە ١٥ دێڕ لە هەر لاپەڕەیەکدا نووسراوە، لە ساڵی ١٣٤٢ (١٩٢٤)دا ، چاپ کراوە و تاریخی سەرەتاکەی مانگی گەلاوێژی ١٣٠٩ (١٩٣٠) ە و پێشەکیەکی لە لایەن سید حسن تقی زادەوە بۆ نووسراوە.

273. [Saeed Khan, "Ahli Hagg"] Moslem World, January 1927, p. 40.

[ئەوەی مینۆرسکی ئاماژەی پێ کردوە، وتارێکە بە ناوی «ئەهلی حەق» کە دکتۆر سەعیدخان نووسیویە و تێیدا پروپاگەندەی بۆ ئایینی مەسیح لەنێو لایەنگران و ئیماندارانی ئەهلی حەقدا کردوە (١٩٢٧). من وتارەکەم وەرگێڕاوەتە سەر کوردی و لە ژمارە ٢٧، بەهاری ٢٠٠٠ی گۆڤاری گزینگ چاپی سوید دا بڵاو بۆتەوە. وەرگێڕ].

٢٧٤. [مینۆرسکی بە «ئەحمەدخانی کۆماسی» نووسیوە]

٢٧٥. بڕوانە:



E.H. Minns, "Parchments of the Parthian period from Awraman in Kurdistan", in Journal of Helenic Studies, Vol. 35, 1915, pp. 22 - 65

٢٧٦. بڕوانە وتارەکەی من: Sisar, Senne لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلامدا.

٢٧٧. [ئەمڕۆ، ئێمە زانیاریەکی زیاترمان لە سەر ژیانی «خالۆی کۆماسی» هەیە. دانای هەورامی لە «پیرشالیار» و بابا مردوخی رۆحانی لە تاریخ مشاهیر کرد دا، نووسیویانە خالۆ لە ساڵی ١٢١٠دا لە دایک بوە و لە ١٢٩٤دا کۆچی دوایی کردوە (= ٦ ـ ١٧٩٥ و ١٨٧٧ز)].

278. Kurräväz

٢٧٩. بڕوانە: علی اکبر وقایع نگار، حدیقه ناصری ـ مێژووی ئەردەڵان، کە ئێستا [نوسخەیەکێ دەستنووسی] لەلای منە. [نوسخەیەکی دیکەی ئەم دەستنووسە، لە کتێبخانەی بەریتانیا پارێزراوە؛ بۆ زانیاری لە سەر نوسخەکە بڕوانە:

ئەنوەری سوڵتانی، ٢١ دەستنووسی کوردی یا فارسی سەبارەت بە کورد لە کتێبخانەکانی بەریتانیا، پێشوو. هەروەها دوو نوسخەی دیکەش لە کتێبخانەکانی تاران (ملی و ملک) پارێزراون و کاک محمد رئوف توکلی لە سەر بنەمای ئەو دوو نوسخەیە، کتێبەکەی چاپ کردوە. بڕوانە: علی اکبر وقایع نگار کردستانی، حدیقه ناصریه در جغرافیا و تاریخ کردستان، به تصحیح محمد رئوف توکلی، چاپ اول، تاران، ١٣٦٤ (١٩٨٥)

من سەرنجی نوسخەکەی «توکلی» م دا و هیچ ئاماژەیەکم بۆ هۆزی کۆماسی تێدا بەرچاو نەکەوت. تۆ بڵێی نوسخەی مینۆرسکی تەواتر بووبێت یاخود بە گشتی ئەو کتێبە جیاوازە لە کتێبێکی دیکەی میرزا علی اکبر بە ناوی «شرح نسب اردلان» کە نوسخەی ئەویش لە کتێبخانەی کەمبریج پارێزراوە؟ وەرگێڕ].

٢٨٠. تەنیا «لیکلە مەئە نیجێ هۆڵت» ئەویش بە هەڵکەوت بەو شوێنەدا تێپەڕی، ناوبراو ستایشی شوێنە پڕدار و درەختەکەی دەکات:

Lycklama a Nijeholt, Voyage en Russie, etc. 1875, IV, 60.

٢٨١. سەرای ئەوەی مەریوان گەلێک نزیک بە هەورامانە، زمانی مەریوانی لە پەنادەستی باکووری هەوراماندا کرمانجیە.

٢٨٢. جیا لە شیعری ئاڤێستایی و فارسی مام ناونجی (Middle Persian)، کە لە سەر شێوازی برگەیی دارێژاون، ئێمە ئێستا نموونەی شیعری ١٠ برگەیی تاجیکیمان بە دەستەوەیە؛ بەڵام [شیعرەتاجیکیەکان]، لە سەر شێوازێکی دەنگی (tonic pattern) دامەزراون. بڕوانە:

A.N. Boldirev, in Trudi Tajik bazi, iii, 1939, 59 - 73.

{من زانیومە دکتۆر هێنینگ (Dr. Henning)گەیشتۆتە ئەو ئاکامەی کە شیعری کۆنی ئێرانی، «دەنگی»یە، نەک هەر برگەیی بێت. دوای هەموو ئەوانەش، پێویستە ئەم راستییە بسەلمێنم کە لە شیعری گۆرانیدا «پالپشت» [واتە «تکیە»]ی دەنگیی ـ وەک ژمارەی برگەکان خاوەنی گرینگایەتی تایبەتە}.

٢٨٣. نازانم ئایا [بالندەی] ئەفسانەیی «قەقنەس»، حونجەی هەلەی* «فینیقس» ؟ (فۆنیکس) (Phoenix) ؟ Finiqs* نییە؟ گەرچی ناوی باوکی ئەسکەندەر لە عەرەبیدا «فەیلەقووس»ە کەئەویش ئاماژەیە بۆ ناوی فیلیفوس، فیلیپوس Filifüs, Philippos*.

٢٨٤. خورشیدی ئەفەندی ـ وەرگێڕی روسی، ل. ١٤٨، لە باسی زەهاو دا دەنووسێ: "لە سەحرای عەرەبدا، خەلکێکی کەم خوێندەوارییان هەیە؛ بەلام کوردان، زۆریان ناسیاوی پیت [ی ئەلف و بێ] ن و داستانی فەرهاد و شیرین و بەهرامی گۆڕ دەزانن." سەبارەت بەلەیلی و مەجنوون، بڕوانە سەرەوەتر، بەشی چیرۆکە شیعر، ژمارە ٢.

٢٨٥. [ابوالقاسم فیردەوسی شاعیری ئێرانی، ١٤٦ تا ٣٣٠ ک/ ٢-٩٤١ تا ٦-١٠٢٥ز].

٢٨٦. [خاقانی (افضل الدین بدیل)، شاعیری ئێرانی، ٥٢٠ تا ٥٩٥/ ١١٢٦ تا ٩-١١٩٨ز].

287. N. Khanikof, "Memoire sur Khäcäni", in Jour. As., August 1864, pp. 185 - 190, cf. Khäqäni, kulliyat, ed. Tehran, 1316/1937, pp. 808 and 311 - 12, cf. also Salemann, Chetverostishiya Khäqäni, 1875, pp. 18 - 19.

٢٨٨. [ئەمیر خوسرەوی دیهلەوی، شاعیری فارسی وێژی هیندی، ٦٥١ تا ٧٠٥/ ١٢٥٣ تا ٦-١٣٠٥ز].

289. E. G. Browne, LHP., iii, 109

٢٩٠. هێشتا گومانی ئەوە هەیە هی ئەو بێت.

291. F.E. Korsh

٢٩٢. شیعرەکە

293. Published by A. Christensen, Les Dialects d'Awroman et de Päwa, Det Kgl. Danske Videnskabernes selskab, Hist. - filol. Medd., Vl/2, 1921, p. 112.

٢٩٤. ئەنجوومەنی ئەدیبانی کورد، چاپی کۆلۆنێل ئەمین فەیضی خەلکی سلێمانی، ئەستەمول، ١٣٣٩ (١٩٢٠ ز)، لاپەڕە ٩ - ١٠٥ : "بیست و شەش شیعری شێن گێڕی". ئێدیتۆر، سەبارەت بە زمانەکەی دەلێ: "[شێوازی] کوردیی ئێرانە". خوێندنەوەی ئەستەمە (ناخوەندوار) ە [مینۆرسکی وشەکەی بە کوردی نووسیوە: Nâkhwandvar بەلام واتاکردنەوەکەی تەواو نییە] ، گەرچی دانەرەکەی



لەوەیدا «ژیان» بنوێنێ، توانای زۆری هەبوە.

٢٩٥. [من دەقی شیعرەکەم لە فەردی یەکەمەوە تا ٢٢ لە بەر دەستخەتەکەی «دکتۆر سەعید خان» نووسیوەتەوە کە وێنەی دەقی کوردییەکەی کەوتۆتە لاپەڕە ٩٩ی دەقی ئینگلیزییەوە، پاشماوەی شیعرەکەم لە بەر دەقی مینۆرسکی نووسیوەتەوە، کە بە پیتی لاتینی لە لاپەڕە ١٠٠دا نووسیویە و هەردوو بەشەکەم لە گەل دەقێکی تر، واتە دەقی «تاریخ مشاهیر کرد» (بابا مردوخ روحانی) لاپەڕە ٥ ـ ٤٤٤دا، بەراورد کردوە، بە داخەوە سەرەرای هەولی زۆر، دەستم بەو دەقە نەگەیشت کە دکتۆر محەمدی موکری کرماشانی لە بلاوەی «ماد» دا چاپی کردوە و من کاتێ لە کوردستان بووم نوسخەیەکیم هەبوو، چەشنە بەراوردکارییەکیشم کردووە لە نێوان دەقی مینۆرسکی (لە راستیدا دەقی دکتۆر سەعیدخانی کوردستانی) و دەقی بابامەردوخ روحانی. یەکەمیانم بە ئەسل داناوە و ئەگەر جیاوازییەکی لە گەل دووهەمدا هەبێت بە نوسخەی «ب» ناوم بردوە و لە درێژەی ئەم بەشەدا، دیاردەم پێ کردوە. مخابن نەمتوانی نیشانەیەک بۆ «دال غیر ملفوظ» دابنێم. وەرگێڕ]:

دەقی ب:

١. نە

٢. نە ئاغۆش

٣. تەنیای

٤. بیۆن

٥. زەلان و

٦. یا خۆ وێنەی قەیس لیوەی پۆس نەکۆل

٧. بۆ

٨. شەوڕەنگ

٩. من و تۆش وەی طەور

١٠. تەنگ و تار

١١. سزاو

١٢. چەنی

١٣. وە

١٤. زامانت سەختەن ئەو دلەی پەرێش

١٥. مەشۆ

١٦. شەو کەیلەن هووناو

١٧. جێگەمدا

١٨. پیەمدا

١٩. دێویان

٢٠. وەحشی

٢١. شێویان

٢٢. چۆنەن

٢٣. هامرازت کیەن

٢٤. لە دەقی «ب»دا فەردی بیست و دووهەمە.

٢٥. لە دەقی «ب»دا فەردی بیست و یەکەمە.

٢٦. ئەم فەردە لە دەقی «ب» دا نییە.

٢٧. غەمگینت

٢٨. هانەسەینت

٢٩. ئەو

٣٠. ئەو

٣١. دەستەی زوڵفان سەودایی سێوەنگ

٣٢. بەوشانەی

٣٣. تاتای

٣٤. پەشێوان

٣٥. هەردوو نوسخە، لە بیچمی «چوون»یاندا نووسیوە

٣٦ و ٣٧. لە دەقی «ب» دا نەهاتوون.

٣٨. وەلام

٣٩. وەخاک

٤٠. ئەم فەردە لە دەقی «ب» دا، فەردی بیست و شەشەمە.

٤١. جوابێ

٤٢. ئەم فەردە لە دەقی «ب» دا نیە.

٤٣. دێرین

٤٤. زار

٤٥. مەناڵۆ

٤٦. بەرز

٤٧. حەسرەتناکەوە

٤٨. نە

٤٩. واتش

٥٠. سەوگەند

٥١. واحد

٥٢. وە بێوادە کەرد

٥٣. خەیلێ

٥٤. ئەم فەردە لە دەقی «ب» دا نییە.

٥٥. هەرچەند پەرِی من زاری مەکەری

هەرچەند سەنگ سەرد سیامەوەری

٥٦ تا ٥٩. لە دەقی «ب»دا نین

٦٠. دڵشاد

٦١. پەی

٦٢. ئاخر پەشیمان مەبۆ، رەنجەرۆ

٦٣. لە دەقی «ب» دا، ئەم فەردە نییە

٦٤. دمای

٦٥. بێ سامان

# فیرقەی ئەهلی حەق*

زاراوەی ئەهلی حەق هەندێک تاریک و نادیار دەنوێنێ، چون لە گەنجینەی وشە و زاراوەی صۆفیانەدا، بەو کەسانە دەگوترێ کە یەکەم قۆناغەکانی ناسین («شەریعەت» = یاسا، «تەریقەت» = ڕێگا و «مەعریفەت» = ناسین) یان تێپەڕ کردبێ و گەیشتبنە بەرزترین پلەی حەقیقەت (ڕاستەقینەی خودایی).

زاراوەکە، لە لایەن سیستەمی جۆربەجۆری خوداناسییەوە، وەرگیراوە. بڕوانە: س. هورات، «تێکستی حروفیەکان»، ١٩٠٩، ل ١٤٠،[1] لەباری تێکنیکەوە، زاراوەی «خۆهەڵبژاردە»[2] ی پسپۆڕانی ئاینێکی نهێنی (ڕەمزی) یە، کە دەگوترێ لەلایەن پیاو چاکێک بە ناوی «سوڵتان ئیسحەق» (صوحاک) ەوە بنیات نراوە. لانکەی ئایینەکە، ناوچەی شارەزوورە لە دەوروبەری چۆمی سیروان (دیالە) ـ کە ئەمڕۆ کەوتۆتە خاکی عێراقەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئایینەکە بە شێوەیەکی بەربڵاو لە ناوچەکانی نزیک بە سنووری ڕۆژئاوای ئێراندا (لوڕستان، کوردستان، ئازەربایجان و ... هتد، بڕوانە خوارەوەتر)، بڵاو بۆتەوە.

لە عیراقدا، ئەم ئایینە بە تایبەت تاقمی ڕێبەرایەتییەکەی، پەیوەندیان بە [ناوچەی] بەرزەنجە وە هەیە لە ڕۆژهەڵاتی سلێمانی و بە گشتی «کاکەیی»یان پێ دەگوترێ، کە لە وشەی «کاکە»ی کوردی بەواتای برا، وەرگیراوە. واهەیە ئایینەکە، بە ناوە فەرعییەکانیەوە (ئیبراهیمی، خامۆشی و...) ش بناسرێ.

ناوی «ئەهلی حەق» (یا «علی اللهی» کە خەڵکی لاوەکی پێیان دەدەن) دەبێتە هۆی سەر لێ شێواوی چونکە «عەلی» مەرکەزی ئایینەکە نییە و ئەم شێوە ناو لێنانە ئایینەکەمان لەگەڵ ئایینی «غلاە»ی دیکەی عەلەوی لێ دەشێوێنێ[3]. تەنیا شێوەی بڕوا پێکراو ئەوەیە کە لە سەر بناغەیەکی بە متمانە، بخرێتە بەر باس و بە هۆی ئەوماتریالانەوە کە گەڕۆکان بۆیان گێڕاوینەتەوە، تەواو بکرێن. موشکیلەی ئەم کارە لە



هەندێ ڕاستییەوە سەر هەڵدەدەن: یەکەم ژمارەی دەقی بەردەستمان هێشتا کە من (و ئەغلەب بە شێوە زمانی تایبەت نووسراون و بە هۆی عیبارەت و مەفهومی ئاڵۆزەوە، زۆر ڕەق و تەقن)، دووهەم، لق و پۆپی ئایینەکە یەکجار زۆرن.

ڕێکخراوەی «ئەهلی حەق»، هیچ یەکگرتوویییەکی ستانداردی نییە و تەنیا یەک فیدراسیۆن لە ژمارەیەک بزوتنەوەی هاوبەش پێک دێنێ (بڕوانە لیستەی سەرەتایی ئەو لق و پۆپە، لە یادداشتەکانی مینۆرسکی ژمارە ٤٦ [٣٣] دا). دوازدە «خانەدان»[4] ی سەرەکی یا خود «سیلسیلە» هەن (بڕوانە خوارەوەتر)، بەڵام لقی واشیان هەیە ناوی لەو لیستەیەدا نەهاتبێت، بۆ نموونە: «سەیید جەلالی» (بڕوانە مینۆرسکی یادداشتەکانی ژمارە ٤٨ [٣٥]) و «تووماری»[5] («تاقمی لاڕێ». بڕوانە مینۆرسکی، لێکۆڵینەوەکان، ١).

بۆچوونی «گۆبینۆ»[6]، هەروەها «فیرقان»[7] و ژمارەیەک تێکستی چاپکراو (و. ئیڤانۆڤ)[8] هەموو پێکەوە، سیستەمێکی ئایینی دەخەنە ڕوو، کە زیاتر فەلسەفێن تا ئەفسانەیەیکی کرچ و کاڵی «سەرەنجام»[9] (لە ڕیوایەتی «ئاتەش بەگی» دا).

هەرچۆنێک بێت لە بەر ئەوەی ئێستا لقی ناوبراو [ئاتەش بەگی] بۆ ئێمە باشتر ناسراوە، ئەم ڕاپۆرتەی خوارەوە سەرەتا لە سەر بناغەی بەڵگەنامەکانی ئاتەش بەگی دادەمەزرێ ئێنجا بەو ماتریاڵەی وا لە «فیرقان»ەوە دەستمان دەکەوێ، تەواو دەکرێت. دانەری «فیرقان» خامۆشی بوە.

## ئوسووڵی باوەڕەکە

خاڵی مەرکەزی لە باوەڕی دەمارگیرانەی ئەهلی حەقدا، باوەڕهێنان بە دەرکەوتنی[10] یەک لە دوای یەکی «ئیلاهییەت»[11] ـە. ژمارەی ئەم دەرکەوتنانە، حەوتن. «تەجەسسوم»[12] ـەکان بە جل و بەرگێک دادەنرێن کە «ئیلاهییەت» لەبەریان دەکات. «تەجەسسوم» پەیدا کردن بریتی یە لە هاتن (نیشتەجێ بوون) لە یەکێک لەو جل و بەرگانەدا (لیباس، جامە، دوون < تورکی «دۆن»). ئیلاهییەت، هەمووجارێک لە گەڵ چوار (یا پێنج) فریشتە (یارانی چارمەلەک) دەردەکەوێ کە تەجەسسوم لەواندا تاقمێکی داخراو پێک دێنێ.





«سەییدی کەلار دەشتی» ( کە لەساڵی ١٣٣٥ ک (١٩١٦ ز) دا، کۆچی دوایی کرد)، بەرپرسی پێک هێنانی لیستەیەک لە جیلوەکانی خودایە[١٣]، کە لە خوارەوەتردا باسی لێوە دەکرێ. سەرەچاوەکانی تر (سەرەنجام، فیرقان) ژمارەیەکی زیاترمان [لەو جیلوانە] پێ دەناسێنن.

خودا، لە ئەزەل[١٤] دا، دانیشتووی نێو مرواریی‌یەکی ژێر دەریا بوو وخۆی لە بیچمی «خوندکار»[١٥] ی دانەری جیهاندا، دەرخست. دووهەم تەجەسسومی [خودا] لە کەسایەتی «عەلی» دا دەرکەوت. لە سەرەتای دەورەی[١٦] سێهەمەوە ئەم لیستەیە بە شێوەیەکی بەرچاو[١٧]، دەبێ بە «ئەهلی حەق».

چوار دەورەی یەکەم، دەگەڕێنەوە بۆ قۆناغەکای زانیاریی ئایینی واتە: شەریعەت ، تەریقەت (مەعریفەت) و حەقیقەت و بە گوێرەی هەموو لق و فەرعەکانی ئەم ئایینە، سولتان ئیسحەق (صوهاک)، نوێنەرایەتی بەرزترین پلەی [ئەم قۆناغانە] دەکات. بەڵام لە لایەکی دیکەوە سەبارەت بە جێگرانی سوڵتان صوهاک جیاوازیی‌یەکی زۆری بۆ چوون [لە بیروڕای لایەنگراندا] تۆمار کراوە.

V
IV
III
II
I

؟
عەزرائیل
ئیسرافیل
میکائیل
جیبرەئیل
١. خاوەندگار
فاطمە



نصیر
قەمبەر
سەلمان
محمد مصطفی
٢. عەلی
؟
باباطاهیر
بابا حەسەن
بابافەقێ
بابا بوزورگ
٣. خوشین
رەزبار
؟
پیرمووسا
داوود
بنیامین
٤. صوحاک
زەڕبانوو
؟
کاکارەحمان
کاکا عەرەب
کاکامیرە
٥. قرمزی
؟
شاهسەوار
قەرەپووست
کاکا مەلەک دین
کا ـ مەریجان





٦. محمد بەگ
پەری خانم
؟
شاه ئەبداڵ
شاه ئەڵماس
شاه جەمشید
٧. شاه ئاتەش

کاتێ جەوهەری[18] ئیلاهییەت لەیەکێ لەو بەرگانەدا دەرکەوت، نینجافریشتەکان (بۆ نموونە ئەو ستوونە عەموودیانەی ناوخشتەی سەرەوە)، نوێنەرایەتی یەکتر دەکەن، بەم بۆنەیەشەوە، ناویان لەگەڵ یەکتر دا دەگۆڕێ[19] و ئەغلەب لە دەوری سوڵتان صوحاکدا ناوی سەلمان دەبرێ یا لەدەوری خاوەندگاردا ناوی بنیامین دێت.

فریشتەکان «تجلی»[20] ئیلاهییەتن (سەرەنجام). بەگوێرەی ریوایەتێک، بنیامین لە عارەق دروست کراوە کە نموونەیە بۆ حەیا و شەرم. داوود لە هەناسە (توورەیی)، مووسا لە سمێڵ (بەزەیی) و «رەزبار» لە لێدانی رەگی لەش (سەدەقە) خوڵقاون.

فریشتەکان، دەوری «وەزیر»ی ئیلاهییەت دەگێڕن: بنیامین «جێگر» (وەکیل) و «پیر»ە؛ داوود «چاوەدێر» (ناظر) و داوەر (؟)ە؛ پیرمووسا وەزیرە و چاکە و خراپە تۆمار دەکات. مستەفا دەودان (نصیر) یش فریشتەی مەرگە.

بەگشتی دەگوترێ فریشتەکان چوارن (لە هەندێ لیستە و لە هەندێ دەورەی دیاریکراودا، ئەم ژمارەیە دەبێ بە سێ). بەڵام لە راستیدا فریشتەی پێنجەم بەرپرسی راگەیشتن بە سەر ئیش و کاری عیبادەتە و ناوی سیمبۆلیکی فریشتەکەش «رەزبار»[21] یا «رەمزبار» (بە واتای «خاوەن رەمز و راز»)ە. هەرچەند لە سەر جنسیەتی ئەو فریشتەیە قسەیەکی زۆر ناکرێ، بەڵام کاراکتەری ژنانەکەی هیچ قسەی تێدا نیە. تەنانەت یەکێک لەوانەی وا زانیاریان دەدا بە من، رەزبەری بە «نەنێر نەمێ» (خنثی) ناودەبرد. بڕوانە پاشکۆ.

جیا لەو چوارە فریشتەیە، ئەهلی حەق رێز لە گەلێک تاقمی «پیاو چاک»[22] دەگرن:



١. «هەفت تەن» (حەفت کەس) کە بریتین لە «چوار فریشتە»ی سوڵتان صوحاک هەروەها مستەفا دەودان، ئیبراهیم (کوڕەزای سوڵتان صوحاک) و بابایادگار.

٢. «هەفت ـ تەوانە»یا «هەفتەوانە» (حەوت دەسەڵات). وەک موعجیزەیەک (دوای ئەوەی سوڵتان صوحاک و ژنەکەی حەوت رۆژان لە پشت پەردە مانەوە)، لە لایەن سوڵتانەوە خوڵقاون و عەین و بیللا لە خۆی دەچن. لە نوسخەی «سەرەنجام»ی مینۆرسکی دا (بڕوانە یادداشتەکانی لاپەڕە ١٩ [ی ئینگلیزی])[23]، هەفتەوانە بریتین لە: حەبیب شاه، بولوەفا، شاهی دین، میرمستەفا، موحەممەدی گەورەسوار، بابا حوسەین و خاموش ـ ی پوڕچین ( بۆ چەشنایەتی، ناوەکان بڕوانە «ئیڤانۆڤ» ل ١٦٣، و ئێدمۆندز، ل ١٨٦). ئەو کەسانە، بناغەدانەری حەوت لقی سەرەکی (ئوجاق، بەواتای «دڵ» [ ؟] ی) فیرقەکەن کە ژمارەیان دواتر زیادی کردوە و گەیشتۆتە یازدە ـ دوازدە و هەموو «ئەهلی حەق» ێک پێویستە سەری خۆی بە یەکیان بسپێرێ.

بە گوێرەی فیرقان، هەفتەوانە کە بۆتە جێگری «پیر بنیامین»ی دەورەی سوڵتان صوحاک، لە کۆتایی جیهاندا لەگەڵ «هەفت تەن»یەک دەگرنەوە، چون لە ئەسڵدا یەک بوون.

٣. چهل تەن (بە واتای چل کەس)، کە لیستەیان لە نێوی دەروێشە پایەبەرزەکان دروست بوە، بەڵام لە نەریتی جۆربەجۆردا گەلێک لە یەکتر جیاوازن. چل تەن بە رواڵەت زیاد کراوێکی سەردەمی دواترە و بۆ ئەوە دانراوە ئەم فیرقەیە بە خەڵکانی جێگەی رێزی دەرەوە [ی ئایینەکە] وە پەیوەندیی بدات.

٤. تاقمێکی ٧٢ کەسی کە چاوەدێری ئیلاهییەت دەکەن و لە «سەرەنجام» (نوسخەی مینۆرسکی ل ٤١) دا ئاماژەیان پێ کراوە (هەروەها بڕوانە پێرستەکەی ئیڤانۆڤ، ل ٢٩).

بەگشتی ئەهلی حەق زۆریان پێخۆشە دەست نیشانی ژمارەیەک کارەکەر و میواندار بکەن وا لە خزمەت هیلاهییەتدان. لە «کەلامی حەسەن ئاغا» بە ناوی «بەغیشلە» (بەخشایەندە [بیبوورە؟])دا، شیعرەکە بۆ پاریزرانی ٧٢ سەردار، ٣٦٦ دلێر، ٤٤٤ چرابەدەست، ٩٩٠٠ خزمەتکار و هتد... دەپارێتەوە.

## حلول[٢٤] و سەرهەڵدانەوە[٢٥]

بڕوا هێنان بە «تجسم»ی سەر لە نوێی «تجلی»ی خودا، هاوشانی خۆی لە باوەڕی گشتی بە«حلوول»دا دەدۆزێتەوە. «ئەی خەلکینە! لە مردن وەک «تەمێ کرانێک» مەترسن، مردنی مرۆڤ وەک سەر بە ئاودا کردنی مرواربیە».

مرۆڤ دەبێ بە ۱۰۰۱ قۆناغدا تێپەڕ بکات و لە درێژەی کاردا، پاداشی کردەوەکانی ببینێ (بڕوانە یادداشتەکان [ی مینۆرسکی]، لاپەڕە ۱۳۱ [۲٥۱]). لە لایەکی دیکەوە، بە گوێرەی «فیرقان» (بەرگی ۱، لاپەڕە ۳۲، ۳٥، ٥۷، ٦۸)، بە هۆی سروشتی وجوودەوە (بڕوانەخوارەوەتر)، کە بەسەر چاک و خراپدا دابەش کراوە، لەبنەڕەتدا ئیمکانی بێ خەوش بوون [ی مرۆڤ] زۆر کەمە.

«هەرچەندە زیاتر (زووتر) لە جیهانی قالب دەرچن و هەرچی رەنجی زیاتر بکێشن پتر لە خودا نزیک دەبنەوە و رووناکیتان زیاتر دەبێت»، لە کاتێکدا «تاریکەکان» نابێ هیچ کاتێ روخساری رۆژ ببینن.

وەک تەواو کەری ئەم باوەڕانە، ئەهلی حەق بەزەوقێکی زۆرەوە چاوەڕوانی دەرکەوتنی «وەلی عصر»ن، کە دەبێ بێت و «خواستی دۆستان بەرێوە بەرێت، ئینجا هەموو گۆی زەوی دابگرێ». هەروەها ژمارەیەک «کەلام»ی پێغەمبەرانەش هەن، کە هاتنی مەسیح رادەگەیێنن. شوێنی «دوایین داوەری»[٢٦] (سان»[٢٧] = پێداچوونەوە») [قیامەت]، دەشتی «شارەزوور»یا دەشتی «سوڵتانییە» دەبێت واتە ئەو شوێنەی کە تێیدا سوڵتانەکان لە ناو دەبرێن (یادداشتەکان، ٤٤ [۳۱]).

بەگوێرەی فیرقان (۱، ل ٥۷)، دەبێ چاکان بچنە بەهەشت (کە بیرکردنەوەیە لە) جوانیی خوداوەندی دلۆڤان، لە کاتێکدا خراپ دەبێ لە ناو ببرێ (مەعدووم بکرێ).

## داب و نەریت:

ئەهلی حەق، ژمارەیەک چالاکییان هەیە کە بە تەواوەتی رەسەنن.

۱. ئێمە نیشانەیەکی کەمان لە عیبادەتی تاقەکەسییان بەدەستەوەیە؛ لە لایەکی دیکەوە گرنگایەتییەکی گەلێک زۆر بە کۆبوونەوە (جەم ‹ جەمع) دەدەن، کە تێیدا «چارەسەری هەموو موشکیلەیەک دەدۆزرێتەوە». ژیانی ناو کۆمەڵگایان تا رادەیەکی زۆر هاوبەشە[٢٨] و گەلێک کۆبوونەوەی وا دەبەسترێ کە پەیوەندییان بە رووداوی گرنگەوە هەیە.



لە کۆبوونەوەکاندا، «کەلام» بە مۆسیقاوە بۆ خەڵکەکە دەخوێنرێتەوە. {ئەم کۆبوونەوە نهێنیانە کە بە بەشداریی ژنان (؟) دەبەسترێن، بوونەتە هۆی گومان کردنی نەزانانە و نانەجیبانەی دراوسێ [موسوڵمانە] ئۆرتۆدۆکسەکانیان، کە ناتۆرەی وەک «چراغ سوێندور» ـ بە واتای چرا کوژانەوە و شتی ئەوتۆ دەدەنە پاڵ فیرقەکەیان}.

۲. هەندێ جار ئاڵقەی ذیکر دەبەسترێ و بەتایبەت دەروێشانی پایەبەرز بە دەنگی مۆسیقا (ساز) ەوە، جەزم دەبن و لە هۆش دەچن. [ئەم کارە]، توانای ئەوەیان پێ دەدات بە سەرپۆلووی ئاگردا بڕۆن یا بە دەست هەڵیانبگرن و... هتد.

۳. روخساری واجبی ئەم کۆبوونەوانە، نەزر کردن و قوربانییە، کە بریتین لە «نەزر و نیاز» (خێراتی شتی نەکوڵیو، وەک حەیوانی نێر (گا، بەران، کەڵەباب)، کە دەکرێن بە قوربانی؛ یا «خێرو خزمەت» (تۆشەی ئامادە وەک شەکر و نان و ... هتد).

فیرقان (۱، ل ۷٤)، چاردە جۆر قوربانی کردنی بێ خوێن یان خوێناوی ناو دەبات. قوربانی رێگە و شوێنی تایبەتی بۆ دانراوە: گۆشتەکەی لە ئێسک جیادەکرێتەوە و ئەوی دواییان دەخرێتە ژێر خاکەوە. گۆشتی کوڵاو و نەزری دیکە بەسەر ئامادەبواندا، دابەش دەکرێت و خوتبە یا دوعایەکی دیاریکراو دەخوێنرێتەوە، کە چەند جاران دووپات دەبێتەوە. لەو مەراسیمەدا، عیبارەتی «سەبز نموودەن»[٢٩] دێتە گۆتن، کە واتای «چاندنی گیا» ـ بە نیشانەی ژیان و هێزی هەیە. (یادداشتەکان، ل ۲۱۰ [۹۰]).

٤. بە هۆی ئەوو راستییەوە، کە هەموو دەروێشێک پێویستە رێبەرێکی رۆحی (واتە مورشید) ێکی هەبێت، هەموو «ئەهلی حەق»ێک دەبێ سەری بە «پیر»ێک سپاردبێ. لەکاتی بەرێوەبردنی مەراسمێکی وادا (سەرسپاردن)، ئەو کەسانەی وا نوێنەرایەتی «پێنج فریشتە (کذا)»، دەکەن بە دەوری منداڵە ساواکەوە رادەوەستن، گوێزێک (جەوزی بویکا) [؟][٣٠] وەک جێنشینێک بۆ «سەر» لە لایەن بەشدارانەوە دەشکێت و ئینجا گوێزەکە هاوڕێ لە گەڵ سکەیەکی زیو ـ کە «هەویزە»[٣١] ی پێ دەگوترێ و شێوازێکی شیعانەی دەربڕینی ئیمانی پێ دەدرێ، وەک دۆعایەکی چاوەزار[٣٢]، بە خۆوە هەڵدەواسرێ (هەویزە، [ناوەکەی] لە شاری شیعەنشینی هەویزەی خوستان وەرگیراوە). بڕوانە یادداشتەکان، ل ۲۲۷ [۱۰۷] و هەروەها بڕوانە: W. Caskel, "Ein Mahdi des 15. Jahrhunderts" لە [گۆڤاری] Islamica، ژمارەی ساڵی ۱۹۳۱، لەپەڕە ٤۸ تا ۹۳دا. هەروەها بڕوانە وتاری «موشەعشەق»[٣٣] لە «مکملە»ی ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام (۱۹۳۷) دا.

ئینجا لە نێوان ئەو کەسەدا کە سەری خۆی ئەسپاردوە و ئەو «شێخ»ـەی سەری پێ ئەسپێراوە، پەیوەندییەک ـ کە پەیوەندی خوێنیمان وەبیر دێنێتەوە، دادەمەزرێت و هەر ئەو پێوەندییە رۆحییە، مارەیی لە نێوان ئەو کەسە و ئەندامانی بنەماڵەی پیردا یاساخ دەکات.

٥. لەگەڵ رەت کردنەوەی دەست گەیشتن بە «کەماڵ»ی ئەخلاقیدا، هەندێ هاوپەیمانی یەکیەتی (نوجلەی)[٣٤] تایبەت (واتە شەرتی ئیقرار) لە نێوان پیاوێک (یا چەند پیاو) و ژنێکدا دەبەسترێ ـ کە [ئەم پەیمانە] لە قیامەتدا بەستراوە: یادداشتەکان، ل ٢٣٠ [٢١٠]. بروانە: «اخوه واخت الاخره» لە نێوان ئێزەدیاندا.

٦. رۆژوو گرتنیان وەک رۆژووی ئێزەدیان تەنیا سێ رۆژە، کە لە زستاندا دەگیرێت و جەژنێکی بەشوێندا دێت: لە نێو لێ و پۆپی ئایینەکەدا، تەنیا «ئاتەش بەگی» رۆژوو ناگرن ـ ئەویش لە بەر ئەوەی دەڵێن "(دوایین) رۆژانی رووداو[٣٥] نزیک بۆتەوە" و لە جیاتی رۆژوو دەبێ جەژن بگیرێ.

نیشانەیەکی جیاوازیی پیاوانیان، سمێڵی زۆر گەورەیانە کە هەرگیز نابێ کورت بکرێتەوە و بۆ داب و نەریتی دیکەیان بروانە مینۆرسکی، یادداشتەکان.

**فرقان الاخبار**

دانەری ئەم نامیلکەیە، حاجی نعمت الله خەڵکی جەیحوون ئاباد ـ ی نزیک دینەوەرە (١٩٢٠ ـ ١٨٧١)، کە سەر بە لقی «خامۆشی» بوە و وای زانیوە کاتی ئاشکرا کردنی «حەقیقەت» گەیشتوە[٣٦].

کوڕی حاجی نعمت الله، واتە نوور عەلی شاه ئیلاهی (کە لە ساڵی ١٣١٣ (١٨٩٥ ز) دا لە دایک بوە)، ژین نامەی باوکی لە گەڵ سەرەتایەک بۆ «فیرقان» نووسی و ناوی «کشف الحقائق»ی لە سەر دانا.

فیرقان لە عەینی ئەوەدا پەسندی زۆربەی ئەوشتانە دەکات کە پێشتر دەزانران، نوێنەرایەتی نەریتێکی جیاواز لە ئاتەش بەگیش دەکات و دەگاتە ئەو رادەیەی باسی حەوت دەورە ناکات و بە نیسبەت خاوەندگار و سوڵتان صوحاکەوە هەڵوێستی تایبەت ناگرێت، لە کاتێکدا ژمارەی دەرکەوتنە کەمتر گرنگەکان (وەک بابا نعوث و... ) زیاتر نیشان دەدات.





فیرقان لە چواربەش پێک هاتوە:

یەکەم بەش، باسی ئوسووڵی بنەڕەتی حەقیقەت دەکات کە رۆژی ئەزەل و کاتێ ئیلاهییەت هێشتا لە «شاراوەیی»[٣٧] دا بوو (جامەیی «یا»یی غەیبەت[٣٨]) واتە پێش دەرکەوتنی لە شێوەی «خاوەندگار»دا، بنیات نراوە. ئەم یاسایە، تاکاتی دەرکەوتنی سوڵتان ئیسحەق (صوحاک)، شاراوە مایەوە. ئینجا «دەفتەردار» ەکان ئەو ئوسووڵەیان هەرکام بە شێوەی تایبەت بە خۆ و بە گوێرەی ئەو سەرچاوانەی وا دەکەوتنە بەر دەستیان تۆمار کرد.

وەک ئاکامێکی کارەکە، کۆمەڵگای ئەهلی حەق خاوەنی کتێبی پیرۆزی {تاقانە؟} نین و لقەکانیان بە هۆی روانگەی جیاوازیانەوە، لێک دەناسرێنەوە. ئەهلی حەق، داواکاری «قطب کل»یکن، کە دیاردەیەکی جیاوازە.

بەم پێیە، دوای ساڵی ١٣٢٤ (١٩٠٦) کە نعمت الله بە ئەمری خودا دونیای بە جێ هێشت، بوو بە «پێغەمبەری خودای زەمان»[٣٩] واتە هی پیربنیامن (کە بەشێوەی بن + یا + ئەمین بەیان دەکرێ و واتای کوڕی وەفاداری «یا»[٤٠] دەبەخشێ).

ئینجا شەرح وبەیانی «حلول» دێت. (گەردشی «دوون» بە «دوون»[٤١] واتە چوون لە بەرگێکەوە بۆ بەرێکی دیکە):

مەخلووقاتی زەوی بە گوێرەی عونسوری سەرەکی خۆیان («زەردەگڵ»یا «خاکی سیاه») لە دوو مەقوولەی جیاوازن: یەکەمیان، ئەو مەوجووداتە رزگار بوە رووناکانەن کە «سەرداران»ی پەیوەندیداریان بریتین لە بنیامین و سەید موحەممەد (لە تەجەسسومی «بوزورگ سەوار» دا). مەقوولەی دووهەم ئەو مەوجووداتەن وا لە ئاگر و تاریکین و سەردارانی یەک لە دوای یەکیان «ئیبلیس» و «خەنناس»ن کە سێ خەلیفەی یەکەم و موعاویە و عایشە و... پەیوەندیان بەوانەوە هەیە.

تێکەڵاو بوونی ئەو دوو مەقوولەیەی مەوجوودات، ئامێتەیەک پێک دێنن کە وا هەیە تەنانەت لە دەروون (و بیروون) یشەوە بناسرێنەوە.

بەشی دووهەمی نامیلکە [ی فیرقان]، لە پەیوەندی و وێچوویی[٤٢] تەجەسسومەکان لە درێژایی زەماندایە: بنیامین، لە روخساری عیسا و بەشێوەیەکی مەشروط، لە رۆستەمی ئەفسانەیی ئێراندا دەردەکەوێ. رەزبار لە بیچمی «بلقیس» ـ شاژنی «سەبا» و مریەم و... هتد دا ئاشکرا دەبێت. دەرکەوتنی سەید موحەممەد لە شێوەی زەردەشت،

«محمد»ی پێغەمبەر و... هتد دا دەبێت. ئێمە دواتر، مێژووی سوڵتان ئیسحاق (صوحاک) و جێگیرەکانی دەخەینە بەرچاو.

بەشی سێهەم، پەیوەندیی بە ئەزموونی شەخسیی «نعمت الله» و ئەو فەرمانانەوە هەیە کە لە ماوەی سەفەری «عقبی»دا لە لایەن خوداوە پێی گەیشتوە و گرنگترینیان ئەو مەئموورییەتە بوە کە بۆ یەک خستنەوەی «خانەدان»ەکان ـ بە ئامانجی خاوێن کردنەوەیان لە گوناه (از خیانت پاک نمودن) و تکاکاریی (شفاعت) لە لای خودای زەمان پێی دراوە [بڕوانە: پاشکۆ].

بەشی چوارەم باس و خواسێکی زۆری فەرمان و نەریتەکان واتە «ئەمر و نەهی» هاوڕێ لەگەڵ دەقی دوعا بۆ موناسەبەتە جیاوازەکان بە [شێوەزمانی] گۆرانییە.

**عونسورەکانی سیستەم**

ئایینی ئەهلی حەق بە شێوەیەکی نموونەیی، ئایینێکی ئامێتەیە و لە ئوسوولێدا «غلو»ی شیعە دەبینرێ. پێویستە ئەو خاڵە بگیرێتە بەرچاو کە ئەهلی حەق هەمیشە باسی دوازدە ئیمام دەکەن و وەک ئاکامێک نابێ (لای کەم راستەوخۆ) پێوەندیی یان بە ئیسماعیلیەوە بدرێت.

بەگوێرەی فیرقان، «دینی حەقیقەت»، ناوەرۆکی ئەو دە «جزء»ە بە شێوەیەکی ساکار دێنێتە گۆڕێ،کە دوای هاتنی دەقی قورئان، کەوتنە ژێر زەختەوە. بەڵام ئەهلی حەق، لە راستیدا رێگای خۆیان لە شیعەییێکی ئۆرتۆدۆکسەوە بەرەو پێک هێنانی سیستەمێکی جیاوازی ئایینی دەگۆڕن.

ئایینی ئەهلی حەق ـ بەشێوەیەکی گشتی، هاوڕێ لە گەڵ ئایینی «دەرووزی» و «نوصەیری»، ناوەرۆکی «عەلی پەرستی» هەیە بەڵام [لێرەدا]، عەلی سێبەرێکی تەواوی سوڵتان صوحاکی بەسەردا کشاوە.

عونسورێکی بەرچاوی دیکە لە پێکهێنانی ئەهلی حەقدا، دابی دەروێشە سۆفییەکانە و لەوانەن: هەڵبژاردنی پیر، یەکگرتنی برایانە، جەزم بوون بە هۆی زیکرەوە و هەروەها دابەشکردنی خواردەمەنی.

لە روانگەی کۆمەڵایەتییەوە، چینی خوارەوە [ی کۆمەڵگا]، خەڵکی کۆچەر و گوندنشین، دانیشتوانی گەرەکە هەژارەکان، دەرویش و... هتد، باوەڕیان بە ئایینی ئەهلی حەق هێناوە، ئەوەش وا هەیە بە هۆی ئەو ئیحتمالەوە بێت کە هیوادارن لە رۆژی قیامەتدا «سوڵتانەکان» تۆڵەیان لێ بستێنرێتەوە (یادداشتەکان، ل ٤٤ [٣١]). لە سەرێکی دیکەوە، کاراکتەری خەڵک خوازانە[٤٣]ی ئایینەکە کە تەواو شتێکی بەرچاوە، لە زۆربوونی کەرامات و هەروەها بوونی عونسوری فۆلکلۆریی لە داب و نەریتی ئەهلی حەقدا دەردەکەوێ. لە نێوخەڵکی گوندنشینی ناوچە دوورەکاندا ـ کە هەمیشە لە دەرەوەی کۆنترۆڵی حکوومەتی ناوەندیدا بوون، شتێکی سروشتییە ئەگەر چاوەڕوانی دۆزینەوەی پاشماوەی شێوازی سەردەمێکی کۆن بین.

«ئیلاهییەتی ناو مرواری»، بیرۆکەیەکی ئایینی «مانەوی»[٤٤] یە (وت و وێژێکی دووکەسی [مینۆرسکی] لەگەڵ «ث. نۆڵدکە»[٤٥] دا)، وەک باوەڕهێنان بە بێ خەوش بوونی نوور و مەسەلەی «تناسخ» و بڕواهێنان بە «حلوول» کە ناتوانێ دیاردەیەکی راستەوخۆی هیندی بێت. چون پێشتر لە [ئایینی] ئیسماعیلیەشدا هەر هەبوە. دابەشکردنی مەوجوودات بە سەر دوو مەقوولەی جیاوازدا وا هەیە ئاڵ و گۆڕێکی درەنگتری بیروڕای زەردەشتیان بێت سەر بڕینی کەڵەبابیش گەلێک جار پەیوەندی بە نەریتێکی هاوچەشنی مووساییەکانەوە پەیدا دەکات[٤٦] لە کاتێکدا ناوی نێو تەوڕات (داود و مووسا)، ڕەنگە لەرێگەی قوڕئانەوە هاتبنە نێو [ئایینەکەوە].

ئەوەی وا پێی دەگوترێ نفووزی مەسیحیەت، نابێ بە زیادەوە نیشان بدرێت. ئەگەر ئەهلی حەق لە وت و وێژیان لەگەڵ موژدە دەرەکاندا باسی عیسا و مریەم دەکەن دەبێ لەبیرمان نەچێت کە جیا لەوەی کە دەگونجێ لە قوڕئانەوە وەرگیرابن، ئەهلی حەق تەنیا وەک «تجسم» ێکی خودایانی خۆیان چاویان لێ دەکەن. سەبارەت بە جەزم بوونەکەشیان پێویست ناکات لە ئاکارێکی دەروێشان (بۆ نموونە دەروێشی بەکتاش) بەولاوەتر بە شوێنیدا بگەڕێین.

بۆ مەسەلەی دەرکەوتنی هەندێ ناوی چاوەڕوان نەکراو لە میتۆلۆژیی ئەهلی حەقیشدا، دەبێ توانای ئاڵوگۆڕ[٤٧] ی سیستەمی «حلول» بە بەرپرس بزانین. لە دەستنووسێکی ناتەواوی ئەهلی حەقدا کە لە «شیراز» دۆزراوەتەوە، «ڤ. ئیوانۆڤ» ئاماژەیەکی بۆ «مەلەک طائووس» تێدا بینیوە، کە ئەویش ئیماژێکی تایبەت بە ئێزەدییانە.

پەیوەندی گرتنی ئەهلی حەق لە گەڵ فیرقە یەکگرتوەکانی [ناوچەی] «هیلالی خضیب» (قزڵباش، سارلی، شەبەک و... هتد) هێشتا روون نەبۆتەوە، هەرچۆنێک بێت،

شوێنی نفووزی راستەو خۆی «واعظ»انی ئەهلی حەق لە «زەهاب» ەوە تا ناوچەیەکی دووری لای رۆژئاوا ـ وەک شوێنی عەلەوییەکان (واتە قزڵباش) ی «عەینتاب» رۆیشتوە[٤٨].

## ئەهلی حەق و مێژوو

هەڵگرتنی شوێنی زەمینە مێژووییەکانی ئەهلی حەق لە سەر ئەساسی ئەو ئیشاراتەی وا لە نووسراوە ئاییینیەکاندا دەردەکەون، کارێکی هاسان نیە.

دەورە یا سەردەمی «خاوەندگار»، هی پێش ئەزەلییەتە. دەست نیشان کردنی «عەلی» ئاماژەی سەرەکییە بۆ پەیوەندییەکانی لەگەڵ «نوصەیر» دا. تەنیا خاڵی سوود بەخش [لە دیاریکردنی مێژووی] ساڵ و مانگ و بۆ ئایینەکە، ئەوەیە کە دەگوترێ «شاه خوشین»[٤٨]، ٣٦٠ (٣٠٠) ساڵ دوای عەلی دەرکەوتوە (کە ئەویش لە ساڵانی ٣٥ تا ٤٠ (٦٦١ تا ٦٦٥) داخەلیفە بوە). ئەوە خۆی، دەمانگەڕێنێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی یازدەهەمی زایینی و لەگەڵ دەورەی یەکێک لە فیرشتەکانی خوشین واتە بابا تاهیری هەمەداندا یەک دەگرێتەوە کە ئەویش بە گوێرەی راپۆرتێک (راحەالصدور، چاپی م. ئیقباڵ، لل ٩ ـ ٩٨) لە ساڵی ٤٤٧ (١٠٥٥)دا، لە شاری هەمەدان چاوی بە «طغرل سەلجوقی» کەوتوە.

شایانی سەرنج ئەوەیە تاقە کەسێکی دیکە، کە ناوی نا ئاسایی «خوشین»ی لە سەر بوو بێت، لە رووداوەکانی ساڵی ٤٠٨ (١٠١٤) و لە باسی «چالاکیەکانی شاه خوشین» دا ناوی هاتوە (کە ئەویش ئەمیرێکی «کورد» بوە). بڕوانە: مجمل التواریخ، چاپی «بەهار»، ل ٤٠٠. شاه خوشین بە شێوەیەکی ئیعجازیی، لە تیشکی هەتاو هاتۆتە دنیاوە کە ئەو تیشکە، لە «جەلالە»ی کچی یەکێک لە سەرۆکانی (؟) جافەکان لە «شیر بانک»[٤٩]ی «دیهـ ـ اعلا»[٥٠] کەوت (سەرەنجام، دەستنووسی لای مینۆرسکی). ئەوەش وێدەچێ ئاماژەیەک بێت بە «شیروانە»[٥١] لە لێواری لای راستی سیروان (دیالە) لە نزیک گردێکی کەونارا (بڕوانە: ئێدمۆندز، ١، دەوروبەری ١٦٣). شیروانە، تەنانەت ئێستاش هەر هی جافە کوردەکانە.

گەلێک ئیشارەی جوغرافیایی لە ناو دەقەکاندا هەن کە وا دەگەیێنن «خوشین» لە پێش سوڵتان ئیسحاق لە ناوچەی هۆزی گۆراندا ژیابێت. لە لایەکی دیکەوە، ژمارەیەکی زۆری



«کەلام»ی سەردەمی «خوشین» بە فارسی یا زاراوێکی ئەوتۆ نووسراون کە لاسایی چوارینەکانی بابا تاهیر دەکەنەوە.

هەرچۆنێک بێت، وا دەردەکەوێ کە ئەو پەیوەندییەی ئێستا لە نێوان ئەهلی حەقی ناوچەی سیروان و لوڕستاندا هەیە، شاه خوشین دایمەزراندبێت. دانەری فیرقان تەنانەت ئەوەندە دوور دەڕوات کە شوێنی لە دایکبوونی خوشین لە سەر «سیمەرە» (کەرخە) دیاری دەکات کە مەڵبەندێک بەناوی «شیروان» کەتۆتە شانی راستیەوە.

بناغەدانەری ئایینی ئەهلی حەق، زیاتر بە سوڵتان ئیسحەق (صوحاک، صەحاک) زانراوە. دەگوترێ باپیری [صوحاک] ـ سەییدێکی هەمەدانی بوە و لەوێوە هاتۆتە ناوچەی گۆران ـ ناوچەیەک کە شارەزوور (لە باکووری سیروان) و زەهاب (لە باشووری چۆمەکە)، پێکیان هێناوە.

ناوی باوکی صوحاک، سەیید عیسی[٥٢] (کذا) بوە. ناوبراو لە بەرزەنجە [٢٠ کیلۆمەترێک لای رۆژهەلاتی سلێمانی لە عێراق] ژیاوە. سەرۆکانی سەییدی لقی ئیبراهیمی ئەهلی حەق، ئێستاش هەر لە دراوسێیەتی ئەو شوێنەدا ماون.

سەیید عیسی لە پیریدا، «دایرە» (داییراق)[٥٣] ی کچی حەسەن بەگی جەلا[٥٤] (واهەیە «جاف» بێت. (بڕوانە: ئێدمۆندز، ١، دەوروبەری، ل ١٨٤)ی مارە کرد و منداڵێکی لێی بوو، بەناوی سەیید (سوڵتان) ئیسحەق. بەگوێرەی تەزکەرەیەک ـ کە رۆشنبیرێکی ئەهلی حەق رێکی خستوە (ئێدمۆنز، هەمان سەرچاوە) ئەو رووداوە لە ساڵی ٦٧١ (١٢٧٢ز)دا روویدا و ئایینی نوێ لە دەوروبەری ساڵی ٧١٦ (١٣١٦ز)دا دامەزرا.

گۆڕی مام ناونجی سوڵتان ئیسحەق (کە مینۆرسکی لە ساڵی ١٩١٤دا، چاوی پێی کەوت)، کەوتۆتە سەر کەلێکی لای راستی لێواری سیروان و ئەگەر لەوێوە بەرەو ژوور هەڵکشێی، دەبینی ماوەیەکی کەم لە پردی «پەردیوەر» (پردیوەر)[٥٥] ەوە، دوورە.

{دەگوترێ سەید عیسای باوکی سوڵتان ئسیحەق سێ کوڕی لە ژنی یەکەمی بوە، کە ئەو مەسەلەیە دەبێ بووبێتە هۆی لێک دابڕانی زیاتری بنەماڵەیان ـ مەسەلەیەک کە بەگوێرەی دەقی فارسی ئیڤانۆوف ٧٩، سوڵتان ئیسحەقیش ئاماژەی پێ کردوە. جیلی نۆهەمی دوای سەیید عیسا ـ باباڕەسوڵی گەورە، وەک باپیرەگەورەی بنەماڵەی خاوەن نفووز و ئۆرتۆدۆکسی نەقشبەندیی سەییدەکانی بەرزەنجە چاوی لێ دەکرێ و ئەوانیش بە زۆری لە هەموو عێراقدا بڵاو بوونەتەوە. بڕوانە: ئێدمۆنز، ١، دەوروبەری، لل ٦٩، ١٨٤}.

دوای سەیید ئیسحەق، گەلێ گێژو گۆمی لە زنجیرەی «تجلی»یەکانی ئەو لیستەیەدا دەبینرێ کە پەیوەندیی بە لقی سەرەکی ئایینەکەوە هەیە. هێشتا نازانرێ ئایا لە دەرکەوتنی «مەزن خودا» («شاهـ میهمان»[٥٦] ی فەرهەنگی فیرقان)، کامیان دەکەونە مەقوولەی ناتەواوتر یا کاتییەوە.

بەگشتی، مەیلی سەیدەکانی ئیبراهمی بەوەیە هەندێ پەیوەندی خزمایەتی لە نێوان ئەو «تجلی»یانە و سوڵتان ئیسحەقدا بدۆزنەوە (ئەویش زیاتر لە ڕێگەی حەوتەوانەوە). لقی «ئاتەشبەگی» باوەڕیان بە زنجیرەیەکی جیددیتری «تجلی» ـ جگە لە سێ تجلییەکان (ژمارە ٥: قرمزی، ژمارە ٦: محمد بەگ و ژمارە ٧: ئاتەش بەگ) هەیە.

پیاوچاک [قیددیس]ی هەرەگرینگ لە ئاڵقەی گۆرانەکاندا، «ئیبراهم» ە ـ کە (لە ڕێگای یەکێ لە حەوتەوانەکانەوە)، وەک نەوەی سوڵتان ئیسحەق چاوی لێدەکرێ. ئیبراهیم لە بەغدا (و واهەیە لە کەرکووک) نێژرابێت و لە «کەلام» ێکدا وەک کەسێک باسی لێکراوە کە بەغدای بە تالان (تاراج) برد.

ئەو ئیشارەیە وا هەیە لە خشتەی ناوی منداڵ و نەوە و نەتیجەی سوڵتان ئیسحەقدا، جێگەی ببێتەوە (بڕوانە سەرەوەتر)، ئەویش بە هۆی ئەو ڕاستییەوە کە سەردەمی ئیبراهیم دەکەوێتە نیوەی دووهەمی سەدەی چواردەهەمەوە و بەغدای ئەودەم لە ژێر دەسەڵاتی جەلایری و تورکمانانی قەرەقۆیونلوودا ئەغلەب دەست بە دەست دەگەڕا.

ئێستا ئەگەر بگەڕێینەوە سەر «تجلی» ئاتەشبەگییەکان، دەتوانین بڵێین ناوچەی هەڵسوورانی قرمزییەکان ئێستاش هەر لە حەوضەی سیروان ـ لە خاکی گۆڕانەکاندا هەڵکەوتوە. وا هەیە هەندێ کەس وا بزانن ناوی خەڵک خوازانەی قرمزی (بە واتای سوورەبەرگ) بە ئەحمەدی سوور ـ یەکێ لە حەوتەوانان بناسرێتەوە کە لە نزیک خورماڵ ـ لە شارەزوور، نێژراوە (بڕوانە: ئێدمۆندز، ١٨٦، ٢٠٠).

خاڵێکی تایبەتمەند بە قرمزی ئەوەیە «کەلام»ی هاوڕێکەی ـ واتە «قۆشەی ئۆغلی» بە [زمانی] تورکی ئازەربایجانی نووسراوە و دەتوانێ ناوەڕاستی سەدەی چواردەهەم و ئەو کاتە بگرێتەوە کە زنجیرە حکوومەتییەکانی پێش مغول (بڕوانە سەرەوەتر)، هەوڵیان دەدا بەغدا بە تەورێزەوە ببەستن.

محمد بەگ کاری خۆی لە «دلفان»ی باکووری لوڕستانەوە دەست پێ کرد و دواتر چوو بۆ «ئاجەری»[٥٧] ـ ئەو شوێنەی پێش بینیەکانی لەوێوە سەریان هەڵدا. «ئاجەری»



مەڵبەندێکە لە لێواری ڕۆژهەڵاتی [چۆمی] «جەغەتوو» کە لە لای باشووری ڕۆژهەڵاتەوە دەڕژێتە ناو گۆڵی ورمێوە.

«سەرەنجام» ئاماژە بە پێکدادانی محمد بەگ لە گەڵ بڵباسەکان دەکات (کە هۆزێکی ناسراوی کوردی موکری لای ڕۆژئاوای جەغەتوون).

دوای مردنی محمد بەگ، کوڕەکەی واتە «خان ئاتەش» بە فەرمانی تەجەسسومێک کە بە بەرگی سوور رازا بوەوە، وەک جێگری باوکی هەڵبژێرا و ئەوەش لە کاتی دەرکەوتنێکدا بوو کە حلوولی شەشەم و حەوتەم بە حلوولی پێنجەمی قرمزییەوە پەیوەند دەدات. ئیڤانۆڤ (١٩٥٣، لل ٧ ـ ١٧٢)، دەقێکی سەمەرە دێنێتەوە و بە شاهیدێکی شاکاری خان ئاتەشی دادەنێت.

دەقی ناوبراو، لە باسی ساڵانی ٢ ـ ١٠٨٠ (٧١ ـ ١٦٦٩زاییندا)، ئاماژەی بە موعجیزاتی خان ئاتەش کردوە و خواستی ئەوی بۆ بەجێ هێشتنی جیهان لە ساڵی ١١١٤ (١٧٠٤) دا ڕاگەیاندوە. هەروەها گواتراوە خان ئاتەش ویستوویەتی خۆی لە شێوەی «باز»[٥٨] ێکدا بنوێنێ و لە چیای «سەهەند« (لە باشووری تەورێز) ەوە بەرەو ئاسمان بفڕێ. بەڵام گۆڕەکەی ـ کەناوی خۆی بە سەرەوەیە، کەوتۆتە گوندێک لە باکووری ڕۆژهەڵاتی هەمان چیا، لە لێواری یەکێ لە لقەکانی چۆمی قزڵ ئوزەن (سفید روود) کە ئێستا ناوەندێکی بچووکی ئیدارییە[٥٩].

برایەکی خان ئاتەش (و یەکێک لە فریشتەکان) لە گەڵ خاو و خێزانەکەیدا چوون بۆ کرماشان. ئێمە لیستەی هەموو ئەو حەوت کوڕ و کوڕەزایەی خان ئاتەشمان بە دەستەوەیە، کە «ئاغابەخش»یەکێکە لەوان و لە ساڵی ١٩٧١ دا لە گوندی «گەڕڕەبان» مردووە. ئەم گوندە، کەوتۆتە باشووری کرماشان، ڕاست لە ژێر ئەو شوێنەی کە [ڕووباری] گاماسیاب و «قەڕەسوور»یەک دەگرنەوە و «سەیمەرە» (کەرخە) پێک دێنن.

تاریخەکانی خان ئاتەش دەرەتانی ئەوەمان پێ دەدەن ماوەیەک لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەڤدەهەم (هەندێ دوای حکومەتی شاهـ عەبباسی یەکەم[ی سەفەوی])، بە ناوی دەورەی باوک ـ واتە محمدبەگەوە لە قەڵەم بدەین. پەیوەندییەکی ئەهلی حەق لە گەڵ سەفەوییەکان لە «قوتب نامە»دا ڕەنگی داوەتەوە. ئەو شیعرە بەرزە، بە تورکی ئازەربایجانی گوتراوە و هەموو دەرکەوتنێکی خودایەتی بە وردی دەبژێرێ[٦٠]. شیعری ژمارە ٤٦ دەڵێ لە سەردەمی خەتائی دا "«خودا» بەتورکی قسەی کرد و بوو بە «پیر»ی

تورکستان." ئێمە ئێستا دەزانین خەتایی نازناوی شیعریی شاه ئیسماعیلی یەکەم بوە کە بە شیعری تورکی رووی قسەی دەکردە لایەنگرە تورکەکانی خۆی. لەم حاڵەتەدا، تورکستان ئاماژەیە بۆ ئازەربایجان و ئەو وڵاتانەی وا لە لایەن هۆزە تورکمانەکانەوە داگیر کرابوون[٦١]. بەم پێ یە شاه ئیسماعیلی شیعەی توند و تیژ (٩٣٠ ـ ٩٠٧ / ٢٤ ـ ١٥٠٢)، بە ناوی بێ فیز و هەوای «پیر» هوە بوو بە جێگەی پەرستنی ئەهلی حەق دیاردەیەک لە نێوان سوڵتان ئیسحەق و قرمزی دا کە دەکرێ وەک نیشانەیەکی بەکەڵک بۆ دیاری کردنی سەردەمی ئەوی  دواییان [واتە قرمزی] یش کەڵکی لێ وەربگیرێ.

## شوێنایەتی ئایینەکە

بێشکەی ئەم ئایینە بە بێ هیچ گومانێک، ئەو شوێنەیە واگۆرانەکانی تێدا دەژین و ئێستا لە نێوان عێراق و ئێراندا دابەش کراوە. گۆران رەگەزێکی وەرزێرن و بە زمانێک قسە دەکەن کە هاوریشەی زاراوەکانی ئێرانی ناوەندییە. بروانە مینۆرسکی، «گۆران»[٦٢]، بولّتەنی قوتابخانەی توێژینەوەکانی رۆژهەڵاتی و ئەفریقی، ساڵی ١٩٤٣، بەرگی ١١ بەشی یەکەم، لل ١٣٠ ـ ٧٥ [تەرجەمەی وتارەکە، هەر لەم کتێبەدا بخوێنەوە].

سەرۆکەکانی کاکەیی تائووق[٦٣] دیعایەی ئەوە دەکەن کە لە تۆرەمەی راستەوخۆی سوڵتان ئیسحەقن (بروانە: العزاوی، الکاکائیە). گەلێک شوێنی پیرۆزی ئەهلی حەق لە خاکی شارەزووردا بلاو بوونەتەوە. بروانە: ئێدمۆندز، ١، دەوروبەری ٢٠٠.

شوێنە بەرێز و پیرۆزەکانی «پەردیوەر» (لە هەورامانی لهۆن)، بابایادگار (لە زەهاب) و بنیامن (لە کرند)، کەوتوونەتە خاکی ئێرانەوە. هۆز و کۆمەڵگاکانی ئەهلی حەق لە زۆر شوێنی لای باکووری رێگای پێشووی قەسری شیرین بۆ کرمانشان بەرچاو دەکەوەن (هۆزی سەنجابی، بە هەندێ لق و پۆپی سوننەشیانەوە، ژیانێکی پڕ ئاشتی لە گەڵ ئەهلی حەقەکاندا دەبەنەسەر).

ژمارەیەک هۆزی باکووری لوڕستان (دلفان، ... هتد) ئەهلی حەقن. تاقمێکی زۆری ئایینەکەش لە هەمەدان، تاران، وەرامین، مازەندەران (کەلاردەشت) و تەنانەت لە خوراسان دەژین، کە دەگوترێ برایەکی خان ئاتەش بارەگای خستۆتە ئەوێ. لە ئازەربایجان، کە خەڵکەکە بە تورکی دەدوێن، ئەهلی حەق لە ناوچەی تەورێز، مەراغە (لە دەوروبەری چیای سەهەند) و هەروەها لە ماکۆ (مەڵبەندی قەرەقۆیونلوو) ش هەن.



لایەنگرانی ئایینەکە، تەنانەت لە باکووری [رووباری] ئاراز (لە قەرەباغ) دا بلاوبوونەتەوە.

بە هۆی بەربلاوی و نهێنی بوونی فیرقەیی و ئەو راستییەی کە [ئەهلی حەق] لە شارەکاندا چینی مام ناوەنجی دانیشتوان پێک دێنن، شتێکی نەگونجاوە ئەگەر مەزندەیەکی گشتی لە ژمارەیان بدرێ بە دەستەوە (بۆ زانیاری زیاتر، بروانە: مینۆرسکی، «یادداشتەکان، لل، ٥٩ ـ ٤١).

## ئەدەبیات

یەکەم ئاماژە بە ئەهلی حەقی راستەقینە، لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم و لە [نووسراوەی] گەرۆکە ئەورووپییەکاندا بەدی دەکرێ، [لەوانەن] «مەکدۆناڵد کینئیر»[٦٤] و «ج. کێپێل»[٦٥].

راولینسۆن کە فەرماندەری هێزێکی گەورەی پێک هاتوو لە هۆزی گۆران (ئەهلی حەق) بوو، یەکەم کەسە کە زانیاریی باوەرپێکراوی لە سەر ئایینەکە، داوە بەدەستەوە: «یادداشت لەمەڕ رێ پێوانێک لە زەهابەوە»[٦٦]. «باروون دی بوود»[٦٧] یش چاوی بە گۆڕی بابا یادگار کەوت. هەروەها بروانە: «سەفەرەکانی لوڕستان»ی هەمان کەس[٦٨].

یەکەم تەرحی گشتی بیروبڕوای ئەهلی حەق، لە کتێبی «گوبینۆ» دا دەبینرێ[٦٩]. کە پەیوەندیی راستەوخۆی لەگەڵ نوێنەرانی ئایینەکە لە تاراندا هەبوو[٧٠].

وتارێکی سەرنج راکێشی بێ ناو (بە ئیمزای: ش)، لە مەڕ ئەهلی حەقی تەورێز، لە گۆڤاری «قەوقاز»ی تفلیس، ساڵی ١٨٧٦ لە ژمارە ٢٧، ٢٩، ٣٠ دا بلاو کرایەوە.

یەکەم بەڵگەنامەی باوەرپێکراوی ئەهلی حەق (کەلامێکی ٣٤ فەردی[٧١]، «عەقیدە») هاوڕێ لەگەڵ یادداشتێکی گرنگی «ڤ.ئ. ژۆکۆڤسکی»[٧٢] دا چاپ کرا. موژدەدەرێکی ئەمریکی «س.ج. ویلسن» ژمارەیەکی بەرچاوی زانیاری نوێی [لەسەر ئەهلی حەق] کۆ کردۆتەوە[٧٣].

لە ساڵی ١٩٠٢دا، مینۆرسکی دەستنووسێکی بڕواپێکراوی ئەهلی حەقی کەوتە دەست، کە تاریخی ١٢٩٥ (١٨٤٣) ی بەسەرەوە بوو و هەندێ ئەفسانەی ئایینی تێدا کۆ کرابووەوە کە بە زمانی فارسی و بە گوێرەی «دەورە» (بروانە سەرەوەتر) لیستە کرابوون (کتێبی سەرئەنجام) و هەروەها ژمارەیەک کەلامی بە تورکی کەوتە دەست کە دوای

تەرجەمەکران بە زمانی رووسی چاپ و بڵاو کرانەوە، کورتەیەکی فەرەنسیشی لە گەڵ خرا[٧٤]. هەروەها پێداچوونەوەیەک لە لایەن «ف. کومۆنت»[٧٥] ەوە، نووسراوەیەکی دیکەی مینۆرسکی[٧٦]، وتارێکی دوکتۆر سەعیدخان[٧٧]، [وتاری] «گوردلێڤسکی»[٧٨]، [وتاری] «ئاجەریان»[٧٩] تەرجەمە فەرەنسییەکەی لە لایەن «ف. مەکلێر»[٨٠] ەوە، وتارێکی دیکەی مینۆرسکی[٨١]، وتاری «ف.م. ستید»[٨٢] و «ی. ن. مار»[٨٣]، «چ. پ. پیتمەن»[٨٤]، «و. ئیڤانۆڤ»[٨٥]، «عباس العزاوی»[٨٦]، کە مینۆرسکی پێیدا چۆتەوە[٨٧]، هەروەها وتارێکی دیکەی مینۆرسکی[٨٨] و [وتاری] م. موکری[٨٩]. موکری، لە وتارێکی دیکەدا[٩٠] (لاپەڕە ٨ ـ ٤٧٦)، باسی گەلێک دەستنووسی ئەهلی حەقی کردوە کە ئێستا لەبەر دەستی ئەودان وەک «شاهنامەی حەقیقەت»، «عالەمی حەقیقەت» و... هتد. کتێبی «کورد، تورک و عەرەب»ی س.ج. ئێدمۆندز فەسڵێکی لە سەر «کاکەییەکانی عێراق» تێدایە[٩١]. کە دارماڵی زانیاریی وردە.

{دوایین دەست گەیشتی ئێمە بە ئەدەبیات [ی ئەهلی حەق]، نامیلکەی «برهان الحق» نووسراوی «نووری عەلی ئیلاهی» (کوڕی نووسەری فیرقان)ە[٩٢]. ئەم نامیلکەیە یەکەمین چاپە لە لایەن نوێنەرێکی راستەقینەی فیرقەکەوە، گەرچی سەرەڕای هەموو ئەوانە، نوور عەلی ئیلاهی هەوڵ دەدات فیرقەکەی خۆی لە گەڵ روانگەی گشتی شیعەدا ئاشت بکاتەوە بەڵام قسەکانی لە مەڕ پیاوچاکان و لقەکانی ئایینەکە، شەرحی داب و نەریتیان و تەرجەمە و تەفسیرەکانی لە مەڕ بۆچوونی «گۆرانی»یەکان، شایانی هەموو چەشنە سەرنجدانێکە. هەروەها بڕوانە کارێکی دیکەی م.موکری[٩٣]، کە هەندێ ماتریالی دیکەی بەردەستی خۆی پێشکەش دەکات}.



## پاشکۆ

لاپەڕە ٣٠٧ [ی ئینگلیزی]:

* رەنزبەر (Ranzbar) بە واتای «پارێزەری راز»، نازناوی «دایەڕاک» دایکی سوڵتان ئیسحەقە.

لاپەڕە ٣١٠ (دێری کۆتایی):

«سەفەر بۆ پشتەسەر» لە سەرەمەرگی نعمت الله و لە تەمەنی ٣٠ساڵی دا، روویدا. خودا (دەستنووس، لاپەڕە ٢٨، ١، ٨) وەک نوێنەری خۆی (وەلی، نائیب) لە چاوەڕوانی بۆ دەرکەوتنی «صاحب الزمان» دا رایگرت و ئەمری پێ کرد [بەخەڵکی] رابگەیێنێت کە ئەم رووداوە، بە دڵنیایی روو دەدات (دەستنووس، ل ٢٥، ١، ٨).

لاپەڕە ٣١٣ (دێری ١٤):

دانەری «بورهان [الحق]، لە فەسڵی «خانەدانەکان»دا باسی مەسەلەی «دەرکەوتنی کاتیی» بە دوور و درێژی کردوە.

## پەراوێزەکانی وتاری ئەهلی حەق

* سەرچاوەی تەرجەمەی ئەم وتارە:

V. Minorsky, "The Sect of the Ahl-i Hakk", Iranica - Twenty Articles by V. Minorsky, Tehran University Publications, No. 775, 1964.

بیست مقاله مینورسکی (شامل مقالات تحقیقی مربوط به مطالعات ایرانی) به قلم پروفسور ولادیمیر مینورسکی، انتشارات دانشگاه تهران، شماره ٧٧٥ [متن انگلیسی].

لە پەراوێزی دەقی ئینگلیزیدا نووسراوە:

"ئەم وتارە بە ئیجازەی میهرەبانانەی بەڕێوەبەرایەتی ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام (چاپی دووهەم، ١٩٥٦)، سەر لەنوێ چاپ کرایەوە. یەکەم دەق لە «مکلمە»ی چاپی یەکەمی ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام (١٩٣٤) دا بڵاوبۆتەوە و لە چاپی ئێستادا جارێکی دیکە چاوی لێکراوەتەوە و ناتەواوییەکانی تەواو کراون».

10. C. Hurat, Textes Houroufis, 1909, p. 140.

2. Self- designation

٣. [وێچوویی و جیاوازییەکانی ئەهلی حەق و ئێزدییەکان جێگەی سەرنجی تایبەتە و هیوایە پسپۆڕە خۆماڵییەکان ئاوڕی لێ بدەنەوە. وەرگێڕ].

٤. [مینۆرسکی ئەم وشەیەی لە بیچمی کوردی ـ فارسی خۆیدا نووسیوە: Khänadäns وەرگێڕ].

5. Tumari

6. Gobineau

7. Firkan

8. W. Ivanow

9. Saranjam

10. Manifestation

11. Divintity

12. Incarnation

13. Theophanis

14. Pre-eternity

15. Khuäwandagar



16. Epoch

17. Typical

18. Essence

19. Avatars

20. Encarnation

21. Razbär

٢٢. Saints، قیددیس، پیاوچاکان

٢٣. [دەبێ نیازی لە کتێبی ٢٠ وتاری مینۆرسکی بێت کە ئەم بابەتەش لەو کتێبەوە وەرگیراوە. وەرگێڕ]

24. Metempsychosis

٢٥. Eschatology، زیندوو بوونەوە

26. The last Judgement

27. Sän

28. Collective

٢٩. [عیبارەتی فارسی، بە واتای چاندن و شین کردن. وەرگێڕ].

30. Djawz-i buica

31. Hawiza

٣٢. [جادوو]

33. Musha'sha'

34. nuclei

35. advent

٣٦. ساڵی ١٩١٦، کاتێ لە کرماشانەوە دەچووم بۆ دینەوەر، لە جەیحوون ئاباد چاوم بە بینایەک کەوت کە بە ئاڵای ڕەشی بچووک رازابۆوە. ڕێنموونەکەم گوتی ئەوە ماڵی «شێخێک» بوە. من بە حیسابی ئەوەی نیازی کابرا یەکێ لە پیاوچاکانی سوننەی کوردستانە، ئەو هەلە ڕەخساوەم بۆ چاوپێکەوتنی نیعمت الله، لە دەست دا. ف. مینۆرسکی.

37. Concealment

38. Jama-yi ya-yi ghaybat

39. The Lord of the Hour

40. Yä

41. gardish-i dün bi-dün

42. Correspondence

43. Popular

٤٤. [ئایینەکە بە ناوی دانەرەکەی (مانی کوڕی فاتەک) ەوە دەناسرێ، کە لە ساڵی ٢١٥ی زایینیدا لە شاری «ماردین» لە دایک بوە و لە ساڵی ٢٧٦دا کوژراوە. ئەم ئاینە ئامێتەیەکە لە ئایینی زەردەشت، عیسا و بوودایی. بە گوێرەی مانەوییەت جیهان لە دوو عونسوری ڕووناکی و تاریکی پێک هاتوە و لە کۆتایی جیهاندا ڕووناکی و ئاشتی بە سەر هەموو شوێنێکدا زاڵ دەبێت. مانی بۆ تێگەیاندنی خەڵک کتێبەکەی خۆی «ئەرژەنگ»ی بەرەسمی جوان ڕازاندبووەوە و لە ئەدەبی کوردی و ئێرانیدا ئەرژەنگ و مانی بوونەتە نیشانەی ڕازاوەیی و چەلەنگی لە کاری هونەریدا. نالی دەڵێ:

«مانی» نیەتی قووەتی تەسویری بڕۆی تۆ
ئەم ڕەسمە بەدەستی متنفس نەکشاوە

حاجی قادری کۆیی دەڵێ:

ئەگەر سوودت نییە بۆ موڵک و میللەت
بە من چی نەقشبەندی یاکو «مانی»

بەشێک لەم زانیارییانە لە «فرهنگ فارسی معین» وەرگیراون. وەرگێڕ].

45. Th. Noldeke

٤٦. بڕوانە:

I. Scheftelowitz, Das, Stellvertretende Huhnopfer, Giessen, 1914.

٤٧. Elasticity، انعطاف

٤٨. بڕوانە:

Towbridge, "The Alawis", in Harvard. Theol, Review, 1909, pp. 346 - 55, (re-printed in Moslem World, 1921, pp. 255 - 66).

48. Shah khoshin

49. Shir-bank

50. Dih-i A'lä

51. Shirwäna

52. Isi



53. Däyira (Däyriâk)

54. Djala

55. Perdiwar (pirdiwar)

56. Shah-Mihmän

57. Adjari

58. Falcon

٥٩. [دوور نییە، نیازی مینۆرسکی، «تیکان تەپەی هەوشار» بێت کە ئێستا بە ناوی «تیکاب» ەوە دەناسرێ].

٦٠. بڕوانە:

Minorsky, Materiaux, pp. 72 - 82

٦١. بڕوانە:

Rieu, Supplement, p. 26a

٦٢. [تەرجەمەی وتارەکەی «گۆران»، هەر لەم کتێبەدا هاتوە. وەرگێڕ].

63. Tä'ük

64.Macdonald Kinneir, "A Geographical memoir of the Persian Empire"1813, 141.

65. G. Keppel, "Personal narrative of a journal from India to England", 1817, II, 61ff.

66. H. Rawlinson, Notes on a march from Zohab, JRGS

(گۆڤاری ئەنجومەنی پادشاهی جوغرافیا)

ساڵی ١٨٣٩ ژمارە ٣٦، ٣٩، ٥٣، ٥٧، ٩٥، ٩٩، ١٠٥، ١٠٩

67. Baron de Bode, "Biblioteka dl'a Cleniya", St. Petersburg, 1854, t. cxxiii, p.45.

- Baron de Bode, Travels in Luristan, 1845, I, 371 - 8; II, 180.

69. Trois ans en Asie, by Gobineau, Paris, 1859, 338 - 70

70. Schemann, Gobineau, cine Biographie, Strasburg, 1913, I, 506 - 7.

هەروەها بڕوانە:

Minorsky, "Gobineau et la perse", in Europe, Paris, Oct. 1923, 116 - 27.

72. “The Credo” V. A. Zukowsky, zap., 1887, 1-25.

73. S.G. Wilson, Persia, Life and Customs", 1896.

٧٤. بروانە:

V. Minorsky, Materiali dl'e izuceniya persidskoy Sekti, 'L'udi lstini ili "Ali-Ilahi", Moscow, 1911, Published as Fase. XXXIII of "Trudi po costokoredeniyu izda-, "Notes sur la secte des Ahlé-haqq", هەروەهاcayemiye Hazarevskin lnstitutom, in Revue du Monde Musulman, 1920, 20 - 97

1921, pp. ( هەروەها بە شەرحی تەواوی بیبلیۆگرافیەکەیەوە کە ٥٤ پارچە دەگرێتەوە (pp. 61-84. 205 - 302,

کە هەندێ شتی لێ زیاد کراوە وەک کتێبیش بڵاوکراوەتەوە.

75. F. Cumont, in "Syria", 1922, p. 262

76. V. Minorsky, "Un traité de polémique Behai - Ahli-Haqq, in J.A., 1921, 165-7

77. Dr. Saeed-Kahn, "The sect of Ahli-haqq", in Moslem World, 1927, 31 - 42.

78. Gordlevsky, "Karakoyunlu", in Izv. Obscestra lzuceniya Azerbaydjana, Baku, 1927.

79. Ajarian, "Gyorans and Toumaris, a newly found religion in Persia", in Bull. de l'Université de Erivan.

80. French translation by F, Macler, in "Revue de l'Histoire des religions", 1926, 294 - 307.

81. V. Minorsky, "Etudes sur les Ahli-Haqq": "Toumari' = Ahl-i Haqq" in RHR, 1928, 90 - 105.

82. F.M. Stead, "The Ali-llahi sect. in Persia", MW, 1932, 184 - 9.

83. Y.N. Marr, "Radeniye Sekti L'udi istini". (in Y. Marr, Statyi i soobsceniya, II, 1939, 248 - 54).

84. Ch. P. Pitman, "The final word of the Ahl-i Haqq"., MW, 1937, 147 - 63

(نووسەر، لێرەدا کەڵکی لە دەقێکی «سەرەنجام» وەرگرتوە کە گەلێک لە تەرجەمەکەی مینۆرسکی دەچێت).



85.W. Ivanow, "An Ali-Ilahi fragment, Collectanea", (The Isma'ili Society), I, 1948, 147 - 84.

هەروەها

W. Ivanow, "The Truth Worshippers of Kurdistan, Ahl-i Haqq", Texts, Bombay, 1953.

دەق و هەروەها توێژینەوەی «تذکرە اعلا» کە لە راستیدا نوسخەیەکی «سەرەنجام»ی ئاتەش بەگی تەرجەمەی مینۆرسکی و پیتمەنە و هەندێ شاخ و باڵی لێ زیاد کراوە. ئیڤانۆڤ لە پاشکۆی وتارەکەدا، ژمارەیەک دەق و بەشی جیای دیکە لەمەڕ «خان ئاتەش»ی لێ زیاد دەکات.

86. Abbas al-Azzawi, "Al-kakaiya fil-ta'rikh", Baghdad, 1368 (1949).

([لەم کتێبەدا] ئەهلی حەقی کەرکووک وەک «علی اللهی» جیاواز گێراونەتەوە بەر چاو).

٨٧. مینۆرسکی بە کتێبەکەدا چۆتەوە:

V. Minorsky, "Oriens", 1953, pp. 408-12; V. Minorsky , "Un poème de Ahl-i Hakk en turk", in Westöstliche Abhandlungen R. Tschudi, 1954, pp. 258 - 62.

89. M. Morki, "Cinquante-deux versets de Cheikh Amir", JA, 1956, No. 4, pp. 391 - 422.

(شاعیر، کە سەر بە لقی «خامۆشی»یە، بە کورتی سەبارەت بە چوار «تجلی» قسە دەکات بەڵام لەمەڕ جێگرانی سوڵتان ئیسحەق بێدەنگە).

90. M. Mokri, "Le symbole de la Perle dans le folklore persan et chez les Kurdes fidèles de Vérité", JA, 1960, No. 4, on pp. 476 - 8.

91. C.J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs, 1957, pp. 182-201.

92. Nuri Ali Ilahi, "Burhan al-Hakk", Theran, 1312 (1963), 176 pp.

93. M. Mokri, "La Pierre Noire", in J.A, 1962, fase 3, pp. 369 - 433.

## بۆچوون سەبارەت بە
## ئەلف و بێی لاتینی کوردی *

*«تێبینی: ئەم وتارە تەواو سەربەخۆ نییە و لەراستیدا پێشکەش کردنی هەندێ پێشنیارە لەمەڕ دوو وتاری ئێدمۆندز کە سەبارەت بە ئەلف و بێی لاتینی بۆ زمانی کوردی نووسیوە. من هەر سێ وتارەکەم کاتی خۆی وەرگێڕاوەتە سەر کوردی و بڵاوم کردوونەتەوە. بڕوانە دواڵا پەڕەی ئەم کتێبە*، بەرهەمە چاپکراوەکانی وەرگێڕ. *ئەنوەر»*

پێشنیاری جەنابی «س.ج. ئێدمۆند» لەمەڕ «کەڵک وەرگرتن لە تیپی لاتینی بۆ نووسینی کوردی» شایانی سەرەنجی تایبەتی ئەو کەسانەیە وا بە کردەوە و تیئۆر کاریان بە زمانی کوردی هەیە؛ ئەو خۆی بە هۆی ئەوەوە کە کۆمەڵێ لە رۆشنبیرانی کورد بە دەوریەوە کۆبوونەتەوە، دەرەتانێکی وای بۆ دیراسەکردنی بەکردەوەی مەسەلەکە بۆ رەخساوە کە رەنگە بۆ هیچ کەسێکی [ئوروپی] دیکە نەرەخسابێت.

لایەنی نالەباری هەموو ئەلف و بێیەکی سامی، لە بەرچاونەگرتنی ڤاوێلەکان (نەک هەرکورت بەڵکوو درێژ و هەروەها لێکدراو) ە. ئەم ئەلف و بێیانە، بەشێوەیەکی رەزامەندانە پڕ بە پێستی ئەو زمانانەن وا بۆیان خولْقاون و چوارچێوەی کۆنسۆنانتی یان[1] (بۆ نموونە، لە عەرەبیدا، زیاتر ریشەی سێ تیپی)، بڕبڕەی پشتی وشەیەک پێک دێنێ کە تێگەیشتنە بنەڕەتی یەکەی ـ زۆر کەم بەستراوە بە نیشانەگەلی کۆنسۆنانتی یەوە.



ئەم سیستەمە، بۆ زمانێک کە لە سیستەمی زارەکیدا پێش کەوتوە و دەنگدار نەبۆتە کەرەسەری چوارچێوە کۆنستانتی یەکەی، بەڵکوو هەردوکیان ئەندامی یەکگرتووی ریشەکەن، شتێکی نابەجێ یە. دوو وشەی «دار» و «دوور»ی کوردی سەرەڕای چوارچێوەیەکی کۆنستانتی لەیەکچوو، هیچکارێکیان بەیەکتر نەداوە. لێرەدا ڤاوێلەکان جیاوازییەکەی زۆر لەواتا سەرەکییەکاندا پێک دێنن لە کاتێکدا سیستەمە دەنگی یەکە خۆی بەهۆی بوونی /é/ و /o/ (‹/üe/)ەوە کە عەرەب لە گەنجینەی وشەکانیاندا، «مەجهوول» (= نەناسراو) ی پێ دەڵێن، تارادەیەکی بەرچاو تووشی ئاڵۆزیی هاتوە. ئەلف و بێی عەرەبی بۆ نووسینی ژمارەیەکی زۆری زمانەکان بەکارهێنراوە (ئاڵبانی، تورکی، مالایی و ژمارەی[2] قەوقازی، ئەفریقایی و زاراوەی[3] هیندی و کەمێک ئیسپانیایی و سێربی). بەڵام ئەگەر بە هۆی رەنگدانەوەی نیزامی سیاسی یا ئاینی یەوە، روانینمان لە مەسەلەی راحەتی راستەوخۆی نووسین بەشەوارە نەکەوێ، ئەوا ئەلف و بێی فۆنیتیکی لە رێبازی خۆیدا سەردەکەوێ[4].

سەبارەت بە ئەلف وبێ یەکی فۆنیتیکی تایبەت کە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ سەقامگیر بووبێت ناتوانرێ هیچ بگوترێ؛ بۆ نموونە، یۆنانی و رووسی و ئەرمەنی و گورجی بەباشی بۆ بابەتەکەی خۆیان داڕژاون بەڵام بەهۆی ئەو راستییەوە کە ئەلف و بێی لاتینی زیاتر لە هەموو ئەلف و بێیەکی جیهان بڵاوبۆتەوە و لە شێوەی چاپی ی خۆیدا گەیشتۆتە بەرزترین پلەی تەکنیکی (وەک سەقامگیر بوونی رواڵەتی دەرەوەی هەموو نیشانەکان لە باری هونەریەوە، گێژ و گومی کەمتر لە پیتەکاندا، بەدەستەوە بوونی چەشنی جۆربەجۆر و...) کاتێ کە زمانێک دەیەوەێ گرنگایەتی ئەدەبی خۆی وەدەست بێنێ و بیر لە شێوەیەکی فۆنیتیکی تازە بکاتەوە، تەنیا تیپی لاتینی یە کە رووی تێدەکرێ.

بۆ سەرکەوتنی ریفۆرم لە زمانی کوردیدا، ئەرکی گرنگ و سەرەکی ئەوەیە ئەلف و بێی لاتینی لە ساکارترین شێوەی خۆیدا بهێنرێتە کایەوە و تا ئەو رادەیەی کە دەگونجێ نیشانەی داتاشراوی بۆ دانەنرێ. لەم روانگەیەوە، هەوڵی جەنابی ئێدمۆندز بۆ ئەوەی لە





چوارچێوەی شێوە ئەسڵی یەکەدا بمێنێتەوە وەک دیاردەیەکی بنەڕەتی و پڕ بە پێستی مەسەلەکە دێتە پێش چاو.

ئەلف و بێی کوردی وەک کەرەسەیەکی کاریگەر، پێویست نییە داواکارێکی توند و تیژ و موتڵەقی پرەنسیبەکان بێت، وەک ئەوەی «لە جیاتی نیشانەی لێکدراو، هەموو دەنگێک نیشانەی تایبەت بە خۆی هەبێت و هەموو دەنگێک تەنیا بە یەک شێوە تەلەفوز بکرێ». بۆ نموونە، بەکردەوە هیچ تەنگ و چەڵەمەیەک بۆ نووسینی «ش» لە شێوەی «sh» و لە جیاتی «s» ی چێکی و سلۆواکی یا تورکی پێک نایەت (با نیشانەگەلێکی تایبەتی دیکەش کارەکەیان لەباری زانستی یەوە هاسان کردبێتەوە).

پێویستە من ئەو پرەنسیپانەی وا گەلاڵەی کاری جەنابی ئێدمۆندزیان پێک هێناوە لەم فۆرموولانەی خوارەوەدا پوختە بکەمەوە:

١) خۆ دوورخستنەوە لە هەموو نیشانەیەکی نائاسایی کە گومانیان لێ بکرێ ڕۆژنامەگەریی کوردی بخەنە تەنگ و چەڵەمەوە.

٢) بەکار هێنانی نیشانەی «دوانە»[٥] بۆ ڤاوێلی درێژ (تەنیا لە وتاری یەکەمی جەنابی ئێدمۆندزدا).

٣) بەکارهێنانی /h/ لە دوای هەندێ کۆنسونانت، لە باسی ئەو پیتانەدا تووشی چەواشەبوونمان دەکات.

پێویستە خاڵێکیش لەو بۆ چوونانەی سەرەوە زیاد بکەم ئەویش داواکردنی کەمترین ناتەباییە لەمەڕ کەڵک وەرگرتنی عادەتی لە پیتە سەرەکیە لاتینییەکان. هەموو ئەلف و بێ یەک بەپێی قەرار دانراوە و تەنانەت ئەگەر /k/، /l/ و/m/ لە جیاتی /a/، /b/ و /c/ دابنێین (وەک چۆن لە پیتە ڕەمزیەکانی هەندێ قوتابی ساکاردا دەبینرێ)، خەڵک دوای ماوەیەک فێریان دەبن. هەروەها هەر ئەرکێکی نائاسایی بخرێتە سەر شانی نیشانە ناسراوەکان، دەبێتە هۆی چەواشەبوونی کوردن لە توێژینەوەی زانستی یانەی زمانەکەیان بەرانبەر بە زمانە ئێرانیەکانی تر. لەم پێوەندی یەدا ئەلف و بێی نوێی تورکی کە



چارەسەرێکی بە کردەوە بۆ کەڵک وەرگرتنی ناوچەیی بەدەستەوە دەدا، بێگومان بۆ ئامانجێکی هاوچەشن و بۆ نموونە مەجبوور کردن بەوەی کە وشەیەکی وەک glecek لە شێوەی gelejek دا بنووسرێ بەرێ و جێ نییە. هەروەها پێویست ناکا حونجەیەکی سەیر و سەمەرە بکرێتە جێ نشینی وشەیەک کە خۆی یەکێکە لە کۆمەڵە وشە زانستیە نێونەتەوەییەکان.

ئەوانەی لە خوارەوە دێن، توێژینەوەیەکی زیاتر و بۆچوونی تایبەتی منن لەمەڕ ئەو سیستەمانەی وا لە لایەن جەنابی ئێدمۆندزەوە لەو دوو وتارەدا هاتوون وا لەمەودوا، من بە یەکەم و دووهەم ناویان دەبەم:

سەبارەت بە ڤاوێلی درێژ، وا هەیە درێژایی ڕاستەقینەیان لە بەراورد کردن لەگەڵ ڤاوێلە کورتەکاندا، پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی زیاتر هەبێت، بەڵام گومان لەوەدا نیە کە دوو تاقمە دەنگی یەک لەدوای یەک واتە /ä/، /î/، /u/ و /a/، /i/، /u/ وەک دیاردەیەکی روون هەستیان پێ دەکرێ و /a/ و /a/ تەنانەت لە دەنگدانەوە و زرینگانەوەشدا،[٦] جیاوازن. /é/ (وەک دەنگێکی بەستراو کە کۆنسونانتی پێش خۆی دەکاتە دەنگێکی ئەوکی)، نوێنەرایەتی دەنگی کورت ناکات. تیپی /o/ لە وشەی dost و xosh (xowsh?) دا، (گەرچی لە بنەڕەتێکی تەواو جیاوازن) بەڵام وێ دەچێ کە لە کوردی دا بووبێتە هۆی چەواشە بوون، لە کاتێکدا دەنگی درێژی بنەڕەتیی/ □/لە کوردیدا دەبێ وەک لێکدراوی /üe/ (هاوڕێ لەگەڵ بە ئەوکی کردنی کۆنسونانتی پێش خۆی)، سەیر بکرێ و بۆ نموونە k’üér (kör<) = کوێر، یا (g'üéz) (göz>) = گوێز.

لەئاکامدا، بەکردەوە هیچ نیازێک نامێنێ جیاوازی نێوان /o/ و /ö/ دیاری بکرێ، بەڵام نیشانەی /ö/ (لە وتاری دووهەمدا) وەک دەربڕینێکی ساکار و ئاسایی بۆ /ue/ کە هۆی بوونی خۆی لە «ماک»[٧]ی دەنگەکەدا (لە تیپی /ô/ ەوە) دەدۆزێتەوە، بە کارێکی بەجێ دەزانم.

بەگوێرەی ئەسڵی دووپات کردنەوەی کاراکتەر بۆ ڕاگەیاندنی درێژایی ڤاوێل، من /aa/

بۆ /â/ ی درێژی کوردی دادەنێم و /a/ ی ساکار بۆ نوێنەرایەتی کردنی دەنگە کورتەکە دەهێڵمەوە؛ سیستەمێکی ئەوتۆ یەکێک لەو دیاردانەیە کە روخساری ئەلف و بێی ئەڵمانی پێ دیاری دەکرێ. بۆ نموونە /a/ ی کورتی کوردی، دەنگێکی وەک /a/ ی هەیە (وشەی man ی ئینگلیزی) یا تەنانەت وەکوو /a/ یەکی بەڕاستی کورتە، لە کاتێکدا بەکار هێنانی /e/ (وتاری یەکەم و دووهەم) لە لایەن ئێمەوە بەو نیازە بوە کە گەرەکمانە ئاماژە بۆ پلەیەکی جیاوازی دەنگ بکەین.

پێشنیاری بەکارهێنانی /aa/ و /a/ ئیجازەمان پێ دەدات نیشانەی /e/ بۆ کەڵک وەرگرتن لە شێوەی /e/ یەکی راستەقینەدا بپارێزین (بڕوانە سەرەوەتر). ئەم /e/ تایبەتە، بە بێ هیچ نیشانەیەکی جیاکەرەوە دەنووسرێ (دژ بە /e/ ی وتاری یەکەم و دووهەم) و وەک /e/ ی رێنووسی سانسکریت، تەنیا نوێنەرایەتی /e/ ی درێژ دەکات.

نیشانەی /ii/ و /i/ زۆر سروشتین بەڵام لە کوردی دا دەنگێکی روخسارنوێن[٨] هەیە کە بریتیە لە /i/ یێکی یەجگار کورت، ئەم دەنگە لەسەر حیسابی دەنگدانەوەیەکی ئەسپایی بە تەواوەتی دەناسرێتەوە و بە شێوەیەیک /bI/ ی رووسی (/y/ ی پۆڵەندی) و /I/ (/i/) ی تورکیمان (وەک لە ئاڵدی (aldi) دا هەیە) وەبیر دێنێتەوە بەڵام دەنگێکی مام ناونجی یە کە واهەیە بۆ گوێچکەی رانەهاتووی ئینگلیزییەکان بە ڤاوێلی ناو وشەی (but) بشوبهێنرێ.

لە وتاری یەکەم و دووهەم دا، شوێنی /y/ (/y/ ی پۆلەندی بە شێوەیەکی باش دیاری کراوە بەڵام کارێکی یەجگار بەجێ دەبێت کە ئەرکی ئاشکرای «ی» (واتە /y/ ی ئینگلیزی و فەرەنسی) بۆ /y/ بەجێ بهێڵین.

ئینجا وا هەیە مرۆڤ بیر لە /i/ (بێ خاڵ) ی تازەی زمانی تورکی بکاتەوە بەڵام ئێستا تەنانەت تورکەکانیش دەسەلمێنن کە ئەم نیشانەیە دەبێتە هۆی سەر لێشێوان و وا وێ دەچێ کە ئامادەبن /i/ ی لە جێ دانێن. جا لەبەر ئەوەی ئێمە گەیشتووینەتە ئەنجامی لابردنی کاراکتەری /e/ بە نیشانەی جیاوازکەرەوە و دانانی کاراکتەرێکی ساکار لە جیاتی ئەو، دەتوانین لە باسی ئێستاماندا پێشنیاری دانانی / ï / بکەین[٩] بەڵام رەنگە کەڵکی زیاتر لە دانانی /i/ دا بێت (i بەخاڵێک لە ژێریەوە) و ئەم نیشانەیە بەباشی لە /ii/ و /i/ دەناسرێتەوە لە چاپخانەکانیش ئەگەر پێویستی یان پێی هەبێ، دەتوانن بە هاسانی دروستی بکەن و هەر ئەوەندە بەسە کە تیپی /i/ سەر بەرەوخوار کەنەوە.

لە مەسەلەی دانانی /uw/ و /iy/ لە جیاتی /u/ و /i/ دا باشتر وایە نەکەومە شوێنی وتاری دووهەم چون لەسەر ئەو بڕوایەم کە ئەسڵی ئاڵمانی دانانی دوو پیت بۆ دەنگێکی درێژ، سوودی بەرچاوی هەیە[١٠] بەڵام پێویستە پەسەندی ئەوەش بکەم کە بەکار هێنانی /uw/ و /iy/ واتە هێنانی بزوێنێک بەدوای /u/ و /i/ ی درێژدا، لە باری فۆنێتیکەوە دەبێتە گروپێکی پێکهاتوو لە /u/ + /w/ یا /i/ + /y/ و ئەم یاسا رێنووسی یەش لەم بار و دۆخە تایبەتەدا، دەبەسترێتەوە بە ئاڵ و گۆڕی فۆنیتیکی یەوە.

لەباسی کۆنسونانتەکاندا، بۆ شوێن گرتنی نەریتی یەکجار روونی بەکارهێنان (بڕوانە نووسراوە پیرۆزەکانی سانسکریت) و دابی مێژوویی لەمەڕ تیپی /c/ کە لە هەموو سیستەمێکی وەرگیراو لە لاتینی دا، بۆ کۆنسونانتی /k/ یا /c/ یا /ts/ تەرخان دەکرێ، من /j/ و /c/ ی ساکار بۆ «ج» و «چ» دەپارێزم. تەنیا لادان لەم یاسایە، ئەلف و بێی نوێی تورکی یە کە ئێمە باسی نەگونجاویەکەیمان لە باری زمانەوانی و پێداویستی زانستیانەوە کرد.

/zh/ و /sh/ وێدەچێ نیشانەیەکی پڕ بە پێست بن بۆ دوو پیتی «ژ» و «ش» و هیچ ناتەباییەکی مەنتیقی یان لەگەڵ /z/ و /s/ دا کە بۆ «ز» و «س» دانراون نییە.

بەکار هێنانی/h/ وەک نیشانەیەکی یاریدەدەر لە /lh/ و /rh/ دا بۆ جیاوازی دانانیان لە گەڵ /l/ و /r/، فیکرێکی بەجێ یە و پێشتر[١١] لە ئەلف و بێی ئاڵبانیایی دا ناسراوە. /lh/ ی کوردی بریتیە لە /l/ یێکی سەختی گەڕاوە کە بە هۆی نووشتاندنەوەی نووکی زمانەوە بەیان دەکرێ (دەنگێکی روخسارنوێنی کوردی یە کە زۆر لە /l/ (/π/) ی تورکی و رووسی جیاوازە) /rh/ ش بریتیە لە /r/ یێکی زرینگەدار (طنین دار) کە بەنووکی زمان بەیان دەکرێ. (لە نێوان /r/ و /r/ ی ئەرمەنی و ئاڵبانیایشدا جیاوازیەکی ئەوتۆ دەبینرێ).

سـەبارەت بە دەنگی گــڕ [توند] ی ئەوکی، بەکــارهێنانــی /x/ بۆ /خ/ (وەک لە ئیسپانیایی و یۆنانی و رووسیشدا وەهایە)، لەگەڵ ئیش و کاری زانستی یانەی گشتیدا یەک دەگـرێتــەوە. بەهۆی ئەو راسـتی یەوە کـە ئێـمـە نوێنەرایەتی دەنـگی /غ/ دەخـەینە ئەستۆی /gh/، کە یەکەمجار (لە وتاری یەکەمدا) پێشنیار کرابوو دەنگەکە بەهۆی /xh/ وە نوێنەرایەتی بکرێ، بەڵام لەبەر ئەوەی /خ/ لە کـوردی دا کەڵکی زۆری لێ وەردەگیـرێ، هاسان کردنەوەکەی یەکجار کارێکی بەڕێ و جێ دەبێت.

لەلایەکی دیکەوە هەست دەکرێ کە جەنابی ئێدمـۆندز مەیلی بەوە بێت دەنگی /ح/ نەگرێتە پێش چاو. ئەوەش لە کاتێکدایە کە /ح/ دەنگێکە لە کوردیدا هەیە و نەک تەنیا لە وشـەی خـوازراوەی عـەرەبی بەڵکوو لە ژمـارەیەک وشـەی بێ خـەوشی ئێـرانی وەک «حەوت» (hawt) دا دەبینرێ. ئەم دەنگە هەرچەند کەمـیش بێت، نیـشـانەیەکی یەکجـار روخسـار نوێنی زمـانی کوردی یە و من /xh/ ی عـادەتی بۆ باشـتـر دەزانم کە تێـیدا /h/ بە گوێرەی بۆچوونەکانی پێشوومان کەڵک وەرگرتنێکی ورد لە نیشـانەی سەرەکی /x/ نیشان دەدات.

کـورد – بە پێچەوانەی تورک و فـارس، دەنگی /ع/ بە شێوەیەکـی سروشـتی دەردەبڕن و تەنانەت دەیخەنە پێش وشەیەکی ئێرانی وەک ئەسپ کە لە کوردی دا بە شێوەی عەسپ دەدرێ. بەم بۆنەوەیە یارمــەتی یەکی باش دەبێت ئەگــەر لەو شــوێنانەی دا کــە کــورد تەلەفووزی دەکەن، نیشانەیەکی /,/ [ئاپاسترۆف]ی لەگەڵ بخرێ وەک 'ajbat (عەجبەت)؛ بەڵام هیچ تەنـگ و چەڵەمەیەک لە نووسینەوەی ساکـاری وشە عـەرەبیەکـاندا نابێت واتە ئەگەر عباس و عثمان ی عـەرەبی لە شێوەی Habbas و Wathman دا تەلەففوز کران، ئەوا بەهەمان شێوەش دەنووسرێن[١٢].

بەپێچەوانەی ئەم حاڵەتە، هیچ پێویست ناکات هەمزەی عـەرەبی لە سەرەتا و ئاخیری وشەدا بنووسرێ (وەک إنس و رجاء)، بەڵام باشتر وایە هەمزەی ناوەڕاستی وشە بە هۆی «هایفن» ەوە نیـشــان بدێ وەک هیـئت (hay-at). وێ ناچێ پێـویـســتــمــان هەبێت هیچ





نیشانەیەکی تایبەت لە وشەیەکی وەک l'ére>lérá [لێرە< لەئێرە] دا وەلانێین جگە لەوەی da – واتە بەشی کۆتایی «شوێن»ی لێ جیابکەینەوە بەڵام بۆ ئەم نیازە، دەتوانین هەمان «هایفن» بەکار بهێنین.

پێویست ناکات لەوە زیاتر سەبارەت بە دەنگە کوردی یەکان مووقەڵێشی بکەین چون داهاتوو نیشان دەدات کە پسپۆرانی فۆنێتیکی کوردی چ چەشنە جیاوازییەکی تایبەت، یاخود دیاردەیەکی شاراوەی تێدا دەبیننەوە. ئەم یاسایە، دەنگی لەرزۆک [هەناسەیی] / Ò/(= /ذ/ و /ø/ (= /ث/) ی سلێـمـانیش دەگـرێتـەوە کـە بە زەحـمـەت دەتوانرێ وەک فـۆنیـمی راسـتـەقینە سەیر بکرێن و تەنانەت لە باشووری کـوردسـتـانیـشـدا نوێنەرایەتی دیاردەیەکی گشتی ناکەن.

لە کۆتایی دا پێویستە بە باشی بزانرێ کە ئەم ئەلف و بێ پێشنیار کراوە کوردی یە، راحەتی و هەروەها بەرەو پێش بردنی کاری چاپی گرتۆتە بەر چاو. لەمەڕ نووسینی کوردی [= دەسخەت]، لە داهاتوودا هاسانکردنەوەیەکی تەواو دێتە گونجان. بۆ نموونە، ڤاوێلی دوانەی /aa/، /ii/ و /uu/ زۆر بە هاسانی دەتوانن جێگای خۆیان بدەن بە نیشانەی وەک /a/ ، /i/ و /u/ یا /á/، /á/ و /Ú/. زۆر کەسی وا لە ئەوروپا هەن کە لەجیـاتی کـۆنسـونانتی دوانە، تەنیـا یەکـێکیـان دەنووسن و هێـڵـێکی لەسەر دەکێشن (وەک جـێنشـینێک بۆ «تشدید»ی عـەرەبی). لە کاتێکدا ئێمە هەوڵی دۆزینەوەی رێگایەکی ساکار و گونجاو بۆ چارەسـەرکردنی تەنگ و چەڵەمـەی بنەڕەتی ئەلف و بێ یەکی پایەیی دەدەین، رێنووس و خەتی کوردی، درێژە بە رێگای خۆی دەدات.

ئەوەی لە خوارەوە دەی بینن، خشتـەیەکی بەراوردکاری یە لەو دەنگە کوردی یانەی وا لە دوو وتارەکەی جەنابی ئێدمۆندز و بۆچوونەکانی مندا هاتوون:

ئـ) ڤاوێلەکان

وتاری یەکەم

وتاری دووهەم

بۆچوونی مینورسکی

ä

a

a

aa

a (ä)

e

e

a

é

e

e

e

i

ii

iy

ii

I (کپ)

y



y

i (or) ?

o

o

o

o

üé

uy

o

o

û

uu

uw

uu

Åü

u

u

u

ب) کۆنسۆنانتەکان (بە سەر گرووپدا دابەش کراون)[13]

b

-

-

-

n
-
-
-
z
z
z
z
s
s
s
s
z(ژ)
zh
j
zh
s (ش)
sh
sh
sh
y (ی)
y
y
y



******

## پاشکۆ

کۆمەڵە پێشنیاری سەرەوە لە سەر ئەو گریمانە دانراون کە بۆ ئامانجی هاسان بوونی چاپی کوردی، تا ئەو جێ یەی دەکرێ، خۆ لە نیشانەی جیاکەرەوە (diacritical) بپارێزرێ. لە لایەکی دیکەشەوە، بە گوێرەی ئەزموونی ئەم دواییی یانەی «یەرەڤان» و «دیمەشق» ، ئەم بۆچوونە «عەمەلی»یانە پێویست ناکات بایەخی زۆریان پێ بدرێ. لەهەل و مەرجێکی ئەوتۆ دا زۆر وا هەیە بەکارهێنانی ئازادی نیشانەی جیاکەرەوەی سەر و خواری تیپەکان، نوێنەرایەتی هاسان و ساکار بوونێکی زیاتر لە نووسینی کوردیدا بکەن.

***





## پەراوێزەکانی ئەلف و بێی لاتینی

*) ئەم وتارە لە سەرچاوەی خوارەوە وەرگیراوە:

V. Minorsky

'Remarks on the Romanaized Kurdish Alphabet',

Journal of the Royal Asiatic Society,

London, July 1933, pp. 643 - 650.

1. consonantic frame

2. numerous

3. idioms

٤. ئێمە بۆ چرکەیەک باسی مەسەلەی ئەو زمانە پێشکەوتووانە ناکەین کە لە نزیکەوە بە ئایینی ئیسلام (وەک عەرەبی) یا فەرهەنگ (وەک فارسی) بەستراونەتەوە.

5. double signs

٦. timber، ویزە، طنین

٧. etymological، اشتقاق

8. charactristic

٩. نیشانەی تایبەتی ئەلف و بێکەی ئێمە، لە ئەنجامدا تەنیا دەبن بە دوو: /i/ و /o/.

١٠. لە وتاری دووهەمدا، /y/ سێ دەور دەبینێ: راگەیاندنی /y/ ی کۆنسونانت، /i/ ی کورت و هەروەها درێژایی /i/ (/iy/).

11. cerebal

٢١. تیپی «ع» لە نووسینی دەسخەتدا، تەنانەت بە هۆی / ،/ یَکی توند و چالاکەوە باشتر بەیان دەکرێت.





١٣. بەواتای «بێ گۆڕانکاری» و ؟ «بێ هیچ راگەیاندنێک».

## بەرهەمە چاپکراوەکانی دیکەی وەرگێڕ

١) نووسینی کوردی بە ئەلف و بێی لاتینی کۆمەڵەی سێ وتاری ئێدمۆندز و مینۆرسکی وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە چاپەمەنی ئەرزان، سوید، ١٩٩٥

٢) ٢١ دەستنووسی کوردی (یا فارسی سەبارەت بە کورد) لە کتێبخانەی بەریتانیا چاپەمەنی ئەرزان، سوید، ١٩٩٧

٣) ٣٥ دەستنووسی شەرەفنامەی بەدلیسی لە کتێبخانەکانی جیهان چاپەمەنی ئەرزان، سوید، ١٩٩٨

٤) مێژووی ئەردەڵان، دەستنووسێکی سەدەی هەژدەهەم نووسینی:محمد ئیبراهیم ئەردەڵانی، دەقی فارسی و وەرگێڕاوی کوردی، بە هاوکاری خاتوو نەسرین برنا چاپەمەنی نەورۆز، سوید، ١٩٩٨

٥) کەشکۆڵە شیعرێکی کوردی گۆرانی، گردە کۆنی شێخ عبدالمؤمن مەردۆخی (دەستنووسێکی سەدەی هەژدەهەم)، کوردی و ئینگلیزی ترەستی سۆن بۆ کوردستان، لەندەن، ١٩٩٨

٦) مینۆرسکی و کورد - کۆمەڵەی ٦ وتاری مینۆرسکی لەسەر کورد، وەرگێڕاو لە ئینگلیزییەوە، چاپەمەنی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٢ .

٧) تاقی کردنەوەی کردنەوەی تیۆری بۆ شوفێری ئۆتۆمبیل (ئیمتحانی ئەزەری بەزمانی کوردی)، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، بەهاوکاری محەمەد گەردی، سەربەست کەرکوکی

و رێبوار موختار، چاپی ئاژانسی ستانداردی شوفێری، بەریتانیا. ٢٠٠٣

٨) مەکەنزی و کورد- کۆمەڵەی چوار وتاری پرۆفیسۆرد.ن. مەکەنزی، فایلی تایبەت، بەشێک لە یەکەم ژمارەی گۆڤاری کوردناسی، چاپی ئاڵمان. ٢٠٠٥

٩) کۆماری کوردستان (١٩٤٦) لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوە بەریتانیادا، وەرگێڕاوی ١٣٠ بەڵگەنامە لە ئینگلیزییەوە، چاپی بنکەی ژین، سلێمانی. ٢٠٠٥ .

١٠) وەرگێڕانی پێنج کتێبی فارسی منداڵان کە بنکەی چاپەمەنی مانترالینگوای لەندەن بەشێوەی دووزمانی واتە ئینگلیزی و زمانێکی تر بڵاوی کردونەتەوە. ٢٠٠٥ .

**بەدەست چاپەوە:**

١- درایڤرو کورد- کۆمەڵەی ٥ وتاری ک. ر. داریڤر، وەرگێڕاو لە ئینگلیزییەوە.

٢- هۆزو تیرەو تایفەی کوردی لە کوردستانی ئەردەڵان - دەستنووسێکی سەدەی نۆزدەهەم، دەقی فارسی و تەرجەمەی کوردی.

٣- لاهووتی شاعیری شۆڕشگێڕی کورد- لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنە لە ژیانی بەرهەمەکانی ئەبولقاسم لاهوتی کرماشانی.

٤- کاچوو مادانی - بیرەوەرییەکانم.

٥- سڵاو لە حەیدەر بابا، وەرگێڕانی قەسیدەی ناسراوی ئازەربایجانی، هۆنراوەی محەمەد حسین شەهریار، وەرگێڕاو لە ئازربایجانییەوە بەهاوکاری حەسەن ئەیوب زادە.

٦- وامەکە جۆرج! وەرگێڕانی ٦ چیرۆکی مۆنۆلۆگی باخچەی منداڵان نووسینی جۆیس گرین فێڵ وەرگێڕاو لە ئینگلیزییەوە.

٧- شیعری جەیمز جۆیس، وەرگێڕاوی سەرجەم شیعرەکانی جەیمزجۆیس نووسەری ناوداری ئیرلەندی لە ئینگلیزییەوە.

٨- تاریخ خروج اکراد، یادداشتی رۆژانەی میرزا عەلی خانی ئەفشاری ئۆرومی لە راپەڕینی ساڵی ١٨٨٠ی شێخ عبیدالله شەمزینی، دەستنووسێکی فارسی سەردەی



نۆزدەهەم.

٩- دوو ذەیلی شەرفنامەی بدلیسی، نووسینی (شمعی) و محمد ابراهیم ئەردەلانی (سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەم)

**بەرهەمی تر:**

١٠) کۆماری کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا

١١) هێلکەی دۆڕاو - بەشێک لەمەڕ ژیانی ابوالقاسم لاهوتی کرماشانی

١٢) کاچوو، مادانی ! بیرەوەریی.